نووسینی
هارون نوح طه

# بەسەرهات و پەند وەرگرتن

ئامۆژگاری زانایان، وتەی دانایان
بەسەرهاتی پیاوچاکان، ڕووداوی ڕاستەقینە

چاپی یەکەم - هەولێر
٢٠١٣

# بەسەرهات و پەند وەرگرتن

## ئامۆژگاری زانایان، وتەی دانایان

## بەسەرهاتی پیاوچاکان، ڕووداوی ڕاستەقینە

نووسینی

هارون نوح طه

## بەرگی /٢

چاپی یەکەم

هەولێر

١٤٣٤ ك ٢٠١٣ ز




**ناسنامەی کتێب**

**ناوی کتێب: بەسەرهات و پەند وەرگرتن**

**نووسینی: هارون نوح طه**

**تایپو نەخشەسازی بەرگ و ناوەڕۆك: نووسینگەی هیوا**

**بەرگی دووەم**

**چاپ: یەکەم/ ٢٠١٣**

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی هەولێر ژمارەی سپاردنی (١٩٥٨)

ساڵی (٢٠١٠ )ی دراوەتێ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾

يوسف: ١١١




## ٣٠٧- ئەوانە دڵیان بە یەکەوە پەیوەستە وبرای ڕاستەقینەن

مالکی کوڕی دینـار دەفـەرمووێ : ئیمـامی عمـری کـوڕی خـەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت)، خزمەتکارەکەی بانگ کردو کۆمەڵێ پارەی پێدا کـە نزیکـەی چوارسەرد دینار دەبوو فەرمووی ئەمە بەرە بۆ (ابـو عبیـدەی کـوڕی جـراح) ڕەزای خوای لێ بێت وە ماوەیەك لـەوێ بمێنـەوە تـاکو بزانێـت کـە چـی لـەو پارانـە دەکـات خزمەتکارەکـە پارەکـەی بـرد بـۆ (ابـو عبیـدە) گـوتی، ئەمـە ئیمامی عمر بۆ تۆی ناردووە تاکو بۆ هەندێ پێویستی خـۆت بـەکاری بهـێنی (ابو عبیدە) فەرمووی: خواڕەحم بە ئیمامی عمر بکات.

پاشان خزمەتکارەکەی خۆی بانگ کردو فەرمووی، ئەم پێنج دینارەم بۆ بەرە بۆ فلان کەس، ئەم پێنج دینارەم بۆ فلان کەس، تاکو هەموو پارەکەی بـەم شـێوە بەخـشی خزمەتکارەکـەی ئیمـامی عمـر گەڕایـەوە وهـەموو ڕووداوەکەی بۆی گێڕایەوە پاشان بە ئەندازەی ئـەوەی پێشووی دایـەوە بـە خزمەتکارەکەی گوتی، ئەمەیان ببە بۆ مەعازی کوڕی جەبـەل، ڕەزای خـوای لێ بێت خزمەتکارەکە بەهەمان شێوە پارەکەی برد بۆ معـاذ گـوتی: ئیمـامی عمر ئـەم پارانـەی بـۆت نـاردووە تـاکو بـۆ پێویـستی خـۆت خـەرجی بکـەیت ئەویش دوعای خێری بـۆ ئیمـامی عمـر کـرد پاشـان بەخزمەتکارەکـەی خـۆی گوت: بڕۆ ئەوەندە پارە بدە فلان کـەس وەئەوەنـدەی تـریش بـدە بـە مـاڵی فلان کەس، خێزانی معـاذ بـەوەی زانـی کـە پـارەی لایـە گـوتی: وەڵلا ئێمـە خۆشمـان زۆر هـەژارین بەشـی خۆشمـان بـدە، پاشـان سـەیری کـرد چـەندی






لاماوە هیچی وانەبوو تەنها دوو دینار نەبێ ئەویشی دا بە خێزانی بۆ خۆیان.

ئیمامی عمر فەرمووی: ئەوانە دڵیان پەیوەستە بەیەکەوە وبرای راستەقینەن[1].

## ٣٠٨- سۆزو میهرەبانی

یەکێك لە کچەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی نارد بۆ باوکی کە کوڕەکەی مردووە، داوای لێ کرد کە بڕواتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵنێرەکەی ناردەوە بۆلای کچەکەی وەپێ گوت: سەلامی لێ بکە وپێ بڵێ: موڵکی خوای گەورەیە ئەوەی دەیبەخشێ وئەوەی وەریدەگرێتەوە، هەموو شتێك کاتی دیاریکراوی خۆی هەیە، ئارام بگرن وچاوەڕوانی پاداشت بن، بۆ جاری دووەم ناردی بەشوێن پێغەمبەردا (ﷺ) ئەویش ڕۆیشت لەگەڵ کۆمەڵێ لە هاوەڵان وەکوو :- سعدی کوری عبادە ومعاذی کوڕی جبل وابی کوڕی کعبو زیدی کوڕی ثابت وهەندێکی تر.

کە لەخزمەتی دابوون، کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ)گەیشتە جێ منداڵەکەی لە باوەش گرت و فرمێسکی باراندە سەری، سعدی کوڕی عبادە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە چێ یە؟

پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی :

---

(١) القرطبي ١٨/١٩



ئەوە سۆزوبەزەییە خوای گەورە خستوویەتیە نێودڵی بەندەکانی خۆی، خواش بەسۆزو بەزەییە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە خاوەنی سۆزوو بەزەیین[1].

## ٣٠٩- بەسەرهاتی تۆبەی (ثعلبة)ی کوڕی عبدالرحمن

لە جابری کوڕی عبدالله ی (الانصاری) دەگێرنەوە کە فەرموویەتی: گەنجێك لە (انصاری) یەکان موسڵمان بوو، (ثعلب)ەی کوڕی عبدالرحمن ی ناو بوو، خزمەتی پێغەمبەری دەکرد وتابلێی نەرم ونیان و بەڕێز بوو لە خزمەتی دا، ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بۆ کارێکی خۆی، ئەویش بە بەردەمماڵێکی (انصاری)دا تێپەڕی کرد، لە ناکاو ئافرەتێکی (انصاری) بینی کە خۆی دەشۆرد ئینجا لەوەش دەترساکە وەحی (سروش) بۆ پێغەمبەر (ﷺ)دابەزێ سەبارەت بە کارەکەی ئەو بۆیە بەرەو ڕووی خۆی ڕای کرد و وەك کەسێکی تەریق بوو، یان لە کەسێکی زۆر تاوان بار چونکە چاوی بە ئافرەتەکە کەوتبوو، ئینجا ڕۆیشت بۆ نێو شاخەکانی نێوان مەکە ومەدینە لەوێ مایەوە پێغەمبەر (ﷺ) (ثعلب)ەی بۆ ماوەی چل (٤٠) دانە ڕۆژ لێ وون بوو، جوبرەئیل هاتە لای پێغەمبەر پێی گووت: ئەی محمد خوای گەورە سەلامت لێ دەکات، وەپێت دەڵێ: پیاوێك لەئوممەتی تۆ لە نێو ئەو شاخانەدا پەنام پێ دەگری، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: ئەی عمر ئەی سلمان برۆن (ثعلب)ەم بۆ بێننەوە، ئینجا گەڕان لە کون وقوژبنی مەدینە شوانێکی

---

(١) رواه البخاري ومسلم





خەڵكی مەدینەیان بینی پێیان دەگوت :(ذفافة) ئیمامی عمر فەرمووی: ئەرێ كاكی شوان هەواڵی گەنجێكت لەلانی یە هاتۆتە نێو ئەو شاخانە ناوی (ثعلب)ەیە؟ شوانەكە گوتی: وادیارە تۆ كەسێكی هەڵاتوو لە دۆزەخت دەوێ؟ ئیمامی عمر فەرمووی: تۆ چون دەزانیت كە ئەو لە دەست دۆزەخ ڕای كردووە؟ گوتی: لەبەر ئەوە هەركە بووە نیوەی شەو هاتە لای ئێمە لەناو ئەو شاخانە دەستی لەسەر سەری خۆی دانابوو، هەر هاواری دەكرد و دەیگووت، خۆزگە گیانت لەگەڵ گیانەكان دەكێشام، خۆزگە، لاشەمت لەگەڵ لاشەكان وەردەگرتەوە

ئیمامی عمر فەرمووی: بەڵێ ئەومان دەوێ بەدوای ئەو دەگەڕێین ئینجا شوانەكە بردنی لەگەڵ خۆی بۆئەوەی بگەڕێ بە شوێنی كە بووە نیوەی شەو لەناكاو لە نێو شاخەكان لێیان دەركەوت دەستی خۆی لەسەر سەری دانابوو هەر هاواری دەكرد دەیگووت: خۆزگە گیانمت لەگەڵ گیانەكان دەكێشا، خۆزگە لاشەمت لەگەڵ لاشەكان وەردەگرتەوە دەس بەجێ عمر بۆی چوو گرتی لە باوەشی خۆی، (ثعلب)ە گوتی: ئەی عمر پێغەمبەر بە تاوانی منی زانیوە؟ عمر فەرمووی: نازانم، بەس تەنها ئەوەندەیە كە دوێنێ باسی تۆی كرد ومن و (سلمان)ی نارد بە شوێنت.

(ثعلب)ە گوتی: ئەی عمر ! نەمبەیتە لای پیغەمبەر (ﷺ) مەگەر لەناو نوێژ نەبێ، عمر بە پەلە بەهاوكاری سلمان ی هاورێی (ثعلب)ە یان بردە نێو سەف (ڕیز) نوێژی موسڵمانان، هەركە (ثعلب)ە دەنگی پێغەمبەری بیست لە نوێژدا كە قورئان دەخوێنێ، یەكسەر لە هۆش خۆی چوو كەوتە خوارێ،






کاتێ پێغەمبەر (ﷺ)سلامی نوێژی دایەوە، فەرمووی، ئەی عمر ! ئەی سلمان ! ثعلبە چی بەسەر هات؟ گوتیان: ئەوەتا پعلبە، ئەی پێغەمبەری (ﷺ)خوا ئینجا پێغەمبەر هەستا چووە لای لاشەی جولاندو تاکو بەخەبەر بێت ئەویش بەخەبەر هات پێی فەرموو: ئەی ثعلبە بۆ چی رۆیشتی لەلام ولێك ون بوویت؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا گوناهەکەم. فەرمووی: ئایا ئەی ثعلبە ئایەتێکی قورئانت پێ بڵێم بیخوێنی تاکو گوناهەکانت بسڕێتەوە؟ گوتی: بەلێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بڵێ: (ربنا اتنا في الدنيا حسنة وفي الاخرة حسنة وقنا عذاب النار)[1].

ثعلبة هەردەیگوت گوناهەکەم ئەی پێغەمبەری خوا گەورەترە لەوە، پێغەمبەری (ﷺ)فەرموی نەخێر بەڵکو کەلامی خوا گەورەترە، پاشان فەرمانی پێ کرد کە بڕواتەوە ماڵێ ئینجا هەشت دانە ڕۆژ لەماڵ کەوت بەنەخۆشی دواتر سلمان هاتە خزمەت پێغەمبەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئاگاداری ثعلبە نیت، بەڕاستی خەریکە لەبەرئەو نەخۆشیە دەمرێ، فەرمووی کەواتە بڕۆن با بچینە لای، ئینجا چووە لای سەری پعلبەی گرت و داینا لەسەر کۆشی خۆی، بەڵام پعلبە نەیهێشت یەکسەر سەری لابرد لە کۆشی پێغەمبەر (ﷺ)پێغەمبەر فەرموی: بۆچی وات کرد؟ گوتی لە بەرئەوە پڕە لە گوناهو تاوان، فەرمووی چیت بەسەر هاتووە؟ گوتی: نێوان پێست و گۆشت و ئێسقانم وەکو ڕێگای مێروولەی لێهاتووە.

---

( ١) سوره البقره (٢٠١)



فەرموو: داوای چی دەکەیت وحەز بەچی دەکەیت؟

گوتی: داوای لێ خۆشبوونی خوا دەکەم.

جابر دەڵێ: دەس بەجێ جوبرەئیل دابەزی وفەرمووی: ئەی محمد خوای گەورە سەلامت لێ دەکات وپێت دەڵی: ئەگەر ئەو بەندەیەم بە فراوانی هەموو زەوی بێتە لام بە گوناهوتاوان ئەوا من بە فراوانی هەموو زەوی دەچمە لای بەلێ بورون ولێ خۆشبوون ئینجا دەڵێ: پێغەمبەریش پێی گوت: کە ثعلبة ئەو هەواڵەی بیست بەدەنگێکی بەرز هاواری کردو دەس بەجێ گیانی پاکی دەرچوو.

پێغەمبەر (ﷺ)فەرمانی کرد بە شۆردن و کفن کردنی کاتێ نوێژی جەنازەی لەسەر کرد لەسەر پەنجەپێەکانی دەرۆیشت پاشان فەرمووی: سوێند بەو خوایەی کە بەڕاستی ناردووم بە پێغەمبەر نەمتوانی قاچەکانم بەتەواوی دابنێم لەسەر زەوی لەبەر زۆری هاتنە خوارەوەی فریشتەکان بۆ ناشتن و بەخاك سپاردنی ثعلبة [1].

---

( ١) كتاب التوابين بتصرف / للامام ابن قدامة المقدسي.




## ٣١٠- گرفتی کچێك

لە یەکێك لە قوتابخانەکان ئافرەتێکی مامۆستای خاوەن ڕەوشتی جوان و بەڕێز هەبوو، ڕۆژێکیان هاورێکی خۆی لە قوتابخانەکە پێ دەڵێت: بۆچی زەواج ناکەیت لەگەڵ ئەوەشدا کە تۆ هێشتا گەنجیت وجوانی و ڕێکی و پێکیت پێوەدیارە؟

کچەکە گوتی: لێرەدا هەندی شت هەیە دەمەوێ پێت بڵێم: ئەویش ئەوەیە کە، ئافرەتێك هەبوو پێنج دانە کچی هەبوون، لەبەر ئەوەی هەموو جارێ کچی دەبوون پیاوەکەی هەڕەشەی لێ دەکرد و هەوڵی دەدا کە لێ جیاببێتەوە، جارێك لەناکاو کچێکیان پەیدا بوو ئەمیش هەستا بردی بۆ مزگەوت لەدوای نوێژی خەوتنیان، لە کاتی نوێژی بەیانیدا کە هاتەوە مزگەوت بینی کەس هەلینەگرتۆتەوە خۆی هەلێدەگرتەوە و دەیبردەوە ماڵی، هەموو رۆژی ئەمە حالی بوو، دوای نوێژی خەوتنان دەیبردە مزگەوت و بەیانیش دەیبردەوە تاکو حەوت (٧) دانە رۆژ، وە دایکی ئەم منداڵەش قورئانی پیرۆزی بەسەردا دەخوێند تاکو خوا بیپارێزی.

ئەو پیاوە تووشی هەراسان هات لە دەست ئەوکارەی، بەلاّم دایکی منداڵەکە (کچەکە) دڵی زۆر خۆش دەبوو، ناچار لەماڵ دالدەی دا و بەخێوی کرد، قەدەری خوا وابوو ساڵی ئایندە ئەو ئافرەتە منداڵێکی تری پەیدا بوو، بەلاّم ترس هەر لەولّی دابوو داخۆ ئەم کۆرپەلەیە کچ بێ یان کوڕ، چونکە پیاوەکەی هەرسەرزەنیشتی دەکرد لەسەرئەوە، کاتێ منداڵەکە لەدایك بوو






ئەمجارەیان کچ نییە بەڵکو کوڕە، کەواتە ژمارەی منداڵەکان لەوخێزانەدا بوو بە پێنج کچ و کوڕێك، دوای کەمێك یەکێك لە کچەکانی مرد کە گەورەکەی بوو، لە دوای مردنی ئەو کچە خوای گەورە کوڕێکی تریشی پێدا، پاشان کچی دووەمیشی مرد، ئینجا ئافرەت منداڵێکی تری پەیدا بوو ئەویش کوڕ بوو، بەم شێوە تاکو پێنج کوڕیان پەیدا بوون پێنج کچیشیان مردن کچی شەشەمیان مایەوە، ئەوکچە کەباوکی زۆر هەوڵی دەدا تاکو لەناوی ببات بەلاّم نەیدەتوانی، لە پاشان دایکیشیان مرد، ئێستا پێنج براو یەك خۆشك ماون، کچەکە گەورەبوو، کوڕەکانیش گەورە بوون، باوکیشی پیر بوو وای لێهات کە پێویستی بە کوڕەکانی بێت تاکو یارمەتی بدەن، بەلاّم کێ دەتوانێ ئێستا یارمەتی بدات خۆ ئەوان گەنجن ناتوانن خزمەتی بکەن یان دایکێك یان کچێکی دڵسۆزی وەك پێویست خزمەتی بکەن ئینجا ئافرەتەکە بە هاورێکانی گوت: ئایا دەزانن ئەو کچە کێ بوو کە باوکی دەیویست خۆی لێ رزگاربکات و لەناوی بەرێت، کە لەناو پێنج دانە خۆشك تەنها ئەو مابوو؟

بێگومان ئەوە من بووم کە خاوەن پێنج خۆشکی مردوو بووم ئێستا پێنج برام هەن، بۆیە زەواج ناکەم و ئەو داواکاریەتان ڕەت دەکەمەوە لە کاتێك باوکم هیچ کەسێکی نییە کە سەرپەرشتی بکات وەتەواو پەکی کەوتووە بەئازار ژیان دەباتە سەر، بەلاّم من خزمەتی دەکەم وهەڵدەستم بەجێ بەجێ کردنی داواکاریەکانی، ئێستاش دوو خزمەتکارم بۆ گرتوون کە بە تەواوی یارمەتی بدەن وتاکو کەمێك ئازارەکانی لەسەر کەم بێتەوە،

بەلاّم سەبارەت بە پێنج براکانم هەریەکەوە لە شوێنێکن، رێگایان دوورە






زۆربەکەمی سەردانی باوکم دەکەن لەبەر سەرقاڵی کاروباریان هەیە لە مانگی یەك جار سەردانی دەکات، وەهەیە لە دوو مانگ جارێ سەردان دەکات، ئینجا باوکیشم هەردەم غەمبارو ناڕەحەتە، هەمیشە فرمێسك لە چاوانی وشك نابێتەوەنە تاکوو وای لێهاتووە لەبەر زۆر گریانی سەرە کوڵمەکانی هەمووی هێلیٚ ڕەشی لیٚ پەیدابوونە، ئینجا هاوڕێانم ئەی ئەوانەی کە غەمبارن بۆ لە دایك بوونی کچان ئێوە ڕاتان چییە، ئەمە دەردی دڵی منە؟[1].

## ٣١١- تۆبەکردنی کوڕی هارون الرشید

عبدالله کوڕی فەرەجی عابید دەڵیٚ: پێویستیم بە کرێکارێك هەبوو بۆ کارێکی خۆم بە کریٚ ی ڕۆژانە، چووم بۆ بازاڕ بینیم تەنها یەك کرێکاری ڕەنگ زەردو لاواز ماوە، بۆخچەیەکی گەورەی پێبوو دەڕۆیشت وە جوببەو مێزەرێکی خوری بۆ شێبوو، پێم گوت: کار دەکەیت؟

گوتی: بەڵی، گوتم: بەچەند؟

گوتی: دیرهەمێك و شەشێکی یەکەی،

گوتم: هەستە بابڕۆین بۆ سەر کارەکەم تاکوو بۆم ئەنجام بدەیت گوتی: مەرجم هەیە

گوتم: چیی یە؟

---

(١) قصص اعجبتني / محمد بن عمر صالح با عثمان ط (٣)






گوتی: هەرکە وەختی نیوەڕۆ هات وبانگدەر بانگی نوێژی فەرموو ئەوا من دەردەچم و دەست لە کار هەڵدەگرم وەدەچمە مزگەوت نوێژ دەکەم ئینجا دەگەڕێمەوە لات، وەهەرکە وەختی نوێژی عەسریش هات بەو شێوەیە ئەگەر رازی بێت

گوتم: بەڵێ ڕازیم لە گەڵم هەستاو هاتینەوە ماڵێ منیش لەسەر ئەوە لەگەڵی پێك هاتبوون کە باسی کرد، دەستی کرد بەکارکردن ارکردن پشدێنەکەی تووند بەستا ئیشی دەکرد و هیچ قسەیەکیشی لەگەڵ ناکردم، تاکو نوێژی نیوەڕۆ هات گوتی: ئەی بەندەی خوا ئەوەتا بانگی فەرموو، گوتم: باشە بەکەیفی خۆت بە دەڵێ، دەرچوو و بۆ نوێژ کردن وپاشان گەڕایە وە بەردەوام بوو لەسەر کارەکەی تاکو نوێژی عەسر، کە نوێژی عەسریش بوو گوتی: ئەی بەندەی خوا نوێژی عەسر بوو، گوتم: بەکەیفی خۆت بە (واتە: برۆ نوێژ بکە)

دەڵێ: دەرچوو ب نوێژ کردن و پاشان گەڕایەوە سەرکارەکەی تاکوو کۆتایی ڕۆژ، منیش کرێیەکەم بۆ ژمارد و پێمدا ئینجا ڕۆیشت.

دوای چەند ڕۆژێك کارێکمان هاتە پێش و پێویستمان بە کرێکار هەبوو، خێزانەکەم پێی گوتم: برۆ لە بازار ئەو کوڕە گەنجە بێنە کە پێشتر کاری بۆ کردبوویت، منیش چوومە بازاڕ بەڵام نەمدۆزیەوە، پرسیارم لێ کرد، خەڵکی گوتیان: تۆ پرسیاری کەسێکی ڕەنگ زەردی بێ کەڵکی وادەکەیت کە نابیندرێت لە ڕۆژی شەمە تاکو شەممە، لەناو خەڵك دانانیشێ تەنها



بەنیانەبیٚ؟

دەڵیٚ: منیش بە دەست بە تاڵی گەڕامەوەماڵی

کە ڕۆژی شەممە هات چوومە بازاڕ بە دوای گەڕام و ئەوجارە دەستم کەوتەوە، پیٚم گوت: کاردەکەین بە کریٚ؟

گوتی: خۆ دەزانی کریٚ ومەرجەکەم چۆنە؟

گوتم: بە ئومیٚدی خوا، دەڵیٚ: هەستا دەستی کرد بە کارکردن وەکو جاری پیٚشوو لە کاتی پیٚشوو لە کاتی ئیٚوارەدا منیش پارەی کریٚم بۆ ژمارد بەلاّم ئەمجارە هەندیٚکم بۆی زیاد کرد، ئەویش ئامادە نەبوو زیادە هەڵگریٚ، زۆرم داوا لیٚی کرد بیٚ سوود بوو، ناچار لیٚم تووڕە بوو، سەرزەنشتی کردم و بەجیٚی هیٚشتم و ڕۆیشت، زۆرناڕەحەت و غەمباربووم بۆی بەدوای کەوتم تاکو بەس کریٚ کەی خۆیٚ بدەمیٚ.

چەند ڕۆژیٚك تیٚپەڕبوو وەکو جاران پیٚویستمان بە کریٚکاریٚك هەبوو، بۆیە لە ڕۆژی شەممە چووم بۆ بازاڕ تاکوئەو لەگەڵ خۆم بیٚنم، بەلاّم ئەمجارە نەمدۆزیەوە، پرسیارم کرد لیٚی گوتیان: ئەو نەخۆشە جا کیٚ لیٚی دەپرسیٚت ئەو لە شەممە بۆ شەممە کار دەکات ودیٚتە بازاڕ بە دیرهەمیٚك ودانگیٚك [1] وەتەنها یەك دانگ دەخوات ئیٚستاش نەخۆش کەوتووە، پرسیارم کرد لە ماڵی ئەو تاکو دۆزیمەوە بینیم لەماڵی پیریٚژنیٚك دەژیا، بە پیرەژنەکەم گوت:

---

( ١) دانگ یان دانق، بریتی یە لە یەك لە سەر شەش درهەمیٚك




ئایا کورەگەنجەکە لێرەیە کە کرێکاری دەکات؟ گوتی: نەخۆشە لەوەتەی چەند ڕۆژێکە، منیش چوومە لای بینیم وابوو، لە ماڵ کەوتبوو، لە ژێر سەری خشتێکی قوڕی دانابوو، سەلامم لێ کرد وپێم گوت: ئایا هیچ پێویستیت نییە یە تاکو بۆت جێ بەجێ بکەم؟

گوتی: بەڵی ئەگەر ڕازی بیت.

گوتم: ڕازی دەبم ان شاءالله

گوتی: ئەگەر مردم ئەو بێڵە بفرۆشە، وەئەو جوببەو مێزە ڕەشەم بۆ بشۆرە وبیکە بە کفنم، بەڵام وریابە لەباخەڵی جوببەکەم ئەنگوستیلەیەك هەیە لەلای خۆت هەڵیگرە وچاوەڕوانبە تاکو (هارون الرشید) بە سواری وڵاخەکەی لە ڕێگایەك دەڕوات تۆش بۆی بوەستەکە بتبینی، ئێنجا کە تۆی بینی بڕۆبۆلای قسەی لەگەڵ بکە و ئەو ئەنگوستیلەیەشی پێ نیشان بدە — واتە: خۆت والێبکە ئەنگوستیلەکە ببینی، هەرکە ئەنگوستیلەکەی بینی بانگت دەکات تۆش یەکسەر ئەنگوستیلەکەی تەسلیم بە ئەو بکە بەڵام با لە پاش ناشتنم بێ.

گوتم: بەڵێ.

کاتێ کە گیانی دەرچوو ئەوەی فەرمانی پێکردوم بۆم جێ بەجێ کرد لە پاشان چاوەڕێی دەرچوونی (هارون الرشید) بووم، لەسەر ڕێگا بۆی دانیشتم، کە تێپەڕێ بانگم کرد (یا امیر المؤمنین) ئەی گەورەی ئیمانداران تۆ سپاردەیەکت لەلای منە، ئینجا منیش ئەنگوستیلەکەم بەدیارخست تاکو



ببینیێ بانگی کرد و منی برد تاکو ناو منالّی خۆی پاشان پێی گوتم، تۆ کێیت؟ گوتم: عبدالله کوری فەرەج گوتی: ئەو ئەنگوستیلەیەت لە کوێ بوو؟ منیش بەسەرهاتی کورە گەنجەکەم بۆی گێڕایەوە، دەستی کرد بە گریان، ئەوەندە گریا بەزەییم پێی هاتەوە، کاتێ دڵی کەمێك بە من خۆش بوو ئولفەتی گرت گوتم: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەو گەنجە چ خزمیایەتی ونزیکی هەبوو لە گەڵت؟

گوتی: چۆن وای لێهاتبوو؟

گوتی: ئەو کوڕەم پەیدا بوو پێش تووشی خەلیفایەتی ببم بەلاّم ئەو زۆر لە خوا ترس و بە ڕەوشت و دڵ پاك وسینەساف بوو، بەجوانی گەشەی دەکرد فێری قورئان بوو، شارەزاییەکی تەواوی پەیدا بوو لە زانستە ئیسلامیەکان، هەرکە بووم بە خەلیفە یەکسەر وازی لێ هێنام و خۆی لێم بە دوورگرت وەلە مالّی دنیا هیچی لێ وەرنەگرتم منیش ئەو ئەنگوستیلەیەم دا بە دایکی کە لە یاقوتی گران بەهابوو، وەپێم گوت: ئەوەی بدەرێ، هەروەها زۆر لەگەڵ دایکی چاك بوو، دایکی دەیگوت: هەردەبێ لەگەڵ من بیت

دایکیشی وەفاتی کرد، منیش هیچ هەوالّێکی ئەم کوڕەم نەدەزانی تاکو ئێستا مەگەر لە تۆ نەبێ، پاشان (هارون الرشید) گوتی ئەگەر بووەشەو لەگەلّم وەرەسەر گۆڕکەی، کە شەوداهات من و ئەو بەتەنیا چوین بۆ سەر گۆڕکەی، لەسەر گۆڕ دانیشت، زۆر بە توندی گریا تاکو بەیانی ئینجا گەڕایەوە مالّی، پاشان گوتی: بەلّێنم پێ بدە ناوەناوە پێکەوە بێین بۆ سەر

گوڕەکەی، منیش بەڵێنم پێ دا بەشەو لەگەڵی بچم، شەوان دەردەچووین پاشان دەگەڕاینەوە.

(عبدالله)ی کوڕی فەرەج دەڵێ: نەمدەزانی کە ئەوە کوڕی (هارون الرشید)ە تاکو بەخۆی باسی نەکرد ئێنجا زانیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)[1].

## ٣١٢- چاکە بکە لەگەڵ چاکەکار لە پاداشتی چاکەکانی یەوە

ابو بکری کوڕی عبدالله دەڵێ: پیاوێك هەبوو زۆردەچووە لای پاشایەکان بۆیە هەڵدەستا بە ئامادەکردن و پێشکەش کردنی پێڵاوەکانی ئەو پاشایەی کە لە خزمەتی بوو، وەزۆریش ئەو وتەی دووبارەی دەکردەوە دەیگووت: (چاکە بکە لەگەڵ چاکە کار لە پاداشتی چاکەکانییەوە چونکە خراپەکار کارەخراپەکانی بەسیەتی ) دەڵێ: پیاوێك حەسوودی پێ برد لەسەر ئەو قسە بەجێ یەو ئەو ڕێزە لە لای پاشا، بۆیە هەستا ڕۆژێك دەستی گرت و بردیە مەجلیسی پاشا، پیاوەحەسوودەکە بە پاشای گوت: دەبینی ئەی پاشا ئەو پیاوەی کە پێڵاوەکانت هەڵدەگرێ وپێشکەشت دەکات ئەو هاوئەوهاش دەڵێ: واتە: بەخراپە باست دەکات

هەروەها واگومان دەبات کە تۆ هەردەم تام و بۆنی دەمت ناخۆش و

---

(١) کتاب التوابین / ابن قدامه المقدسی




بۆگەنە، پاشا گوتی: چۆن شتی وادەبیٚ؟

پیاوەکە گوتی: بانگی بکە بابێتە لات، هەرکەلێت نزیك کەوتەوە دەستی لەسەر لووتی خۆی دادەنیٚ تاکو ئازار نەچێژی لەبەر بۆنی دەمت، پاشا گوتی: باشە برۆ تاکو کەمیٚ بیری لیٚ دەکەمەوە

پیاوەکە لەلای پاشا ڕۆیشت چووە لای پیاوەکەی هاوڕیٚ کە خاوەن ئەوقسە چاکە بوو، بردی بۆ ماڵی خۆی وخوانێکی نانی بۆ سازدا وەخواردنەکەشی پڕکرد لە سیر،

پیاوەکە کە نانی خوارد ڕۆیشت دەست بەجیٚ چووە مەجلیسی پاشا وەکو جاران خزمەتی دەکرد و وتەکەی خۆیشی دوبارە کردەوە پاشا گوتی: ئادەی لێم نزیك بەرەوە

ئەویش نزیك بووەوە بەلاّم لە بەر بۆنی سیر کە لەماڵی پیاوەکەی خواردبوو دەستی خستبووە سەر دەمی تاکو پاشا ئازار نەچێژیٚ لەدەستی

پاشا لە دلی خۆی گوت: بەڕاستی ئەو پیاوە راستی کرد وادیارە لەبەرئەوە دەستی دادەنیٚ لەسەر دەمی تاکو بۆنی منی بۆنەچیٚ.

دەڵێن پاشا عادەتێکی هەبوو هیچ کات نامەی بۆ کەس نانووسی بەدەستی خۆی مەگەر دیاری یان خزمایەتی نەبا،

بۆیە ئەوجارە بەدەستی خۆی نامەیەکی نووسی بۆ یەکیٚ لەخزمەت کارەکانی خۆی، تێیدا نووسی:






هەرکاتێك هەڵگری نامەکەم هاتەلات دەست بەجێ سەری ببڕە وکەوری بکە، وەناوپێستی پڕ بکە لە (کا) ئینجا بۆمنی ڕەوانە بکەوە.

دەڵێ: پیاوەکە (کە لە خزمەت پاشا بوو، وەخاوەن ئەو وتە بەنرخانە بوو ) دەستی دایە زامەکە و یستی بیبات بۆ شوێنی مەبەست بەڵام پیاوە حەسوودەکەی لە ڕێگادا بینی گوتی: ها ئەو نامەیە چی یە؟

گوتی: ئەوە نامەی پاشایە بۆ منی نوسیوە کە دیاریەك وەرگرم، پیاوەکەش لە دلێ خۆی گوت: ڕاست دەکات چونکە پاشا بەدەستی خۆی هیچ نامەیەك نانووسێ مەگەر بۆ ئەو جۆرە مەبەستە نەبێ، بۆیە پێی گوت: ئەو نامەیە بکە دیاری بۆ من، تاکو من بیگەیەنم.

پیاوەکە گوتی باشە بۆتۆ.

هەڵیگرت و بردی بۆ لای کارەکەرەی پاشاکە بۆی نوسیوە هەرکە کارەکەرەی پاشا (العامل) نامەکەی کردەوە پێی گوت: لەونامەیە نوسراوە کە من دەست بەجێ سەرت ببڕم وکەورت بکەم.

گوتی: پیاوی چاك بەخوا ئەوە نوسراوی من نەبوو، بۆ من نەنوسرابوو هاوار بۆ خۆم نابێ ئەو کارە بکەیت تاکو موڕاجەعەی پاشا نەکەیت پیاوەکەی پاشا (العامل) گوتی: ناکرێ قسەو بڕیاری پادشا ناگەڕێنەوە، بۆیە دەست بەجێ سەری بڕی وکەوری کرد وەپێستی پڕکرد لە (کا) بۆ پاشای ناردەوە.

پیاوەکەی تریش وەکو جاران لەناکاو هاتەوە لای پاشا، هەمان قسەی



کرد کە پێشتر دەیکرد پاشا سەرسام بوو.

گوتی: کوانامەکەم؟

پیاوەکەش ئاگای لە هیچ نییە تەنها ئەوە نەبێ کە نامەکەی بە هاورییەکەی بەخشیوە، بۆیە گوتی: فلان کەس هاتە سەر ڕێگام گوتی ئەو نامەیەم بدەرێ منیش پێمدا

پاشا گوتی: خۆئەو باسی کرد گوتی: گوایە تۆ گوتوتە: پاشا دەم وودانی بۆگەنە و بۆنی ناخۆشی هەیە

پاشا گوتی: بۆ چی دەستت لەسەر دەمت دانابو کە هاتیەلام؟

پیاوەکە گوتی: چونکە فلان کەس منی بردەوە ماڵی خۆی خواردنی پر سیری دەرخوارد دام، بۆیە منیش نەمەویست پاشا ئازار بدەم دەستم خستە سەر دەمم.

پاشا گوتی: ڕاستە، بڕۆ بۆ شوێنی خۆت ئەوەندە خراپەیە بەسە بۆ مرۆڤی خراپەکار [1].

---

( ١) قصص العابدين / د.حامد احمد الطاهر لاپەرە (٩٤) دار الغد الجديد




# ٣١٣- کەراماتی ئەولیا

ذالنون ی میسری دەڵێ: بۆ مەبەستی حەج کردن دەرچووم لە ماڵ، هیچ کەسێکیشم نەکرد بە هاوڕێیم بۆ ڕێگا، لە ڕێگادا دەڕۆشتم لەناکاو کەوتمە بیابانێکی وشك، ئەوەی پێداویستی خواردن وخواردنەوەبێ هیچم پێ نەما بۆیە چاوەڕوانی مردنم کرد، لە ناکاو درەختێکی سێبەردارم لێ بەدەرکەوت لەناوەڕاستی بیابان، لقەکانی نزیك وچاك هاتبوونە خوارێ، گەڵاکانی هەتا بڵێ زۆر بوون، لەدڵی خۆم گوت: چاك وایە بەرەو ئەو سێبەرە هەنگاوبنێم، تاوەکو خوای گەورە بڕیارێك دەدات، کە گەیشتمە لای دارەکە ولێ نزیك کەوتمە، وەیستم بچمە ژێر سێبەرەکەی بەهۆی پێکەوتنی لقێك لەلقەکانی ئەودارە بە کوپە ئاوەکەم، ئەوەی ئاوبوو لە ناوی هەمووی ڕژایە سەرزەوی هیچی تێدا نەما کە خۆمی پێ ڕزگار بکەم لە تێنوێتی، ئەمجارە بەتەواوی دڵنیابووم کە لە ناو دەچم وچارەم نەما، بۆیە ڕاکشام لە ژێر سێبەری دارەکەو چاوەڕوانی فریشتەی گیان کێشانم دەکرد تاکو گیانم بکێشێ، لە ناکاو گوێم لە دەنگێکی غەمباربوو لە دڵێکی غەمبار دەردەچوو، هەر دەیگوت: خوایە، گەورەکەم، سەر پەرشتیارم، ئەگەر بەوە لێم ڕازی بێت ئەوا بۆم زیادبکە، تاکو لێم ڕازی بێت ئەی ئەو خوایەی کە لە هەموو بەزەییێك بە بەزەیی تری !

منیش هەستام وبەرەو دەنگەکە چووم، بینیم پیاوێکی ڕەنگ جوان و نوورانی بوو کەوتبووە سەر لیم وگۆشتی لاشەی هەڵدەکوڵی لەگەرما، سەلامم






لێکرد، ئەویش وەڵامی سەلامی دامەوە، پێی گوتم: ئەی (ذالنون) لەو کاتەی خواردن و خواردنەوەکەت تەواو بوو دڵنیابوویت کە دەمریت ولەناو دەچیت.

منیش لەلای سەری دانیشتم، هەر بۆی دەگریام و بەزەییم پێیدا دەهاتەوە، لەناکاو سفرەیەکی خواردنم بینی لەپێشم داندراوە، وە بە رایەڵەکەی خۆی لە زەوی دا، کانیێکی ئاوی لێ هەڵقولا ئەو ئاوە لەشیر سپی تر بوو، وەلەهەنگوین شیرین تر بوو، ئینجا گوتی ئەی (ذالنون) بخۆ و بخۆرەوە، پێویستە تۆ بگەیتە ماڵی خوای گەورە لەمەکە، بەڵام ئەی ذالنون پێویستێکم هەیە ئەگەر بۆم جێ بەجێ بکەیت ئەوا پاداشت وەردەگری لەلای خوا، گوتم: چی یە؟

گوتی: ئەگەر من مردم، بمشۆرە پاشان بمنێژە، وەلە درونده وباڵندە دامپۆشە، پاشان برۆ، ئەگەر فەریزەی حەج تەواو بوو لەگەڕانەوەدا ڕێگات دەکەوێتە بغداد، دەچیە (باب الزعفران) لەوێ، ئینجا دەبینی منداڵان لە کۆڵان یاری دەکەن جۆرەها جلو بەرگی ڕەنگاو ڕەنگیان پۆشیوە، منداڵێکی گەنجی تەمەن بچووك دەبینی لەنێوانیان، کە هیچ شتێك سەرقاڵی ناکات لە زیکر و یاری خوا، پارچە پەڕۆیەکی لە پشتی بەستایە وەیەکێکی تری لەسەر شانە، دوو هێڵی ڕەشی لە سەرکوڵمەکانیەتی لەبەشوێنەواری فرمێسك وگریان دروست بوونە ئەگەر بینێت ئەوە کوڕی منە، گلێنەی چاومە، سەلامی منی پێ بگەینە.

ذالنون دەڵێ: کە لە قسەکانی تەواوبوو بیستم دەڵێ: اشهد ان لا اله الا






الله واشهد ان محمد رسول الله.

وەهاوارێکی لێ هەستاو گیانی دەرچوو لە دنیا جیابوەوە، رەحمەتی خوای لێ بێت، منیش گوتم: انا لله وانا اليه راجعون، وە کراسێکم لەناو بوخجەکەم بوو هەردەم لەگەڵم بوو، بەو ئاوە پوخت شۆردم وکفنم کرد، وپاشان بەخاکم سپارد ئینجا بۆ ماڵی خوا کەوتمەڕێ، واجیبات ومەناسیکی حەجم تەواو کرد بەرەو گۆڕی پێغەمبەر کەوتمەڕێ، کە زیارەتی ئەویشم تەواو کرد، ئەمجارە بەرەو شاری بغداد کەوتمە ڕێ کە چومە ناو شار بینیم ڕۆژی کەیف خۆشی و شادی خەڵکی شاربوو، منداڵان یاریان دەکرد، جۆرەها جل و بەرگی ڕەنگاو ڕەنگیان پۆشیبوو، بەوردی سەیرم کرد، هەمان منداڵم دۆزیەوە کە بۆم باسکرابوو، لەناو منداڵان بەڵام هیچ شتێ ئەو منداڵەی سەرقاڵ نەکرد بوو لە زیکری خوا، وە شوێنەواری غەمباریشی لە ڕۆخساری دیاربوو، وەئەوهێڵە ڕەشانەی لەسەر ڕۆخساری دیاربوون

کە شوێنی واری فرمێسك وگریان بوون، هەردەیگوت: خەڵکی هەمووی بۆ ڕۆژی جەژن دڵیان خۆشە بەڵام من دڵم بەو خوایە خۆشە کە تاك وتەنیایە وله هەموو کەسێ بێ باکە.

خەڵکی هەمووی بۆ ڕۆژی جەژن جل و بەرگیان بۆیەکردووە بە جۆرەها ڕەنگ، بەڵام بەرگ و پۆشاکی غەمباری وزەلیلیم بۆیە کردووە.

خەڵکی هەموی بۆ ڕۆژی جەژن خۆیان شۆردووە، بەڵام من بەئاوی فرمێسکەکانم جگەری خۆم شۆردووە.






ذالنون دەڵێ: لێ نزیك بوومەوە سەلامم لێ کرد ئەویش سەلامی منی وڵام دایەوە گوتی :

بەخێربێ ئەو نێردراوەی که لەلای باوکم هاتووە.

گوتم: تۆ چوزانیت که من لەلای باوکت هاتووم و کێ هەواڵی پێدایی؟

گوتی: ئەوەی هەواڵی پێدام که تۆ باوکمت شۆرد و بەخاکت سپارد له چۆڵی بیابان ئەی ذالنون.

ئایا تۆ نەبوویت که باوکی منت ئەسپەردەی خاك کرد له بیابان؟ سوێند به خوا گیانی باوکم بۆ (سدره المنتهی) بەرز کرایەوە بەڵام وەرە بابڕۆین بۆ لای داپیرم.

دەڵێ: دەستی گرتم بردمی بۆ ماڵی خۆی، که گەیشتینە بەردەم دەرگایەکە به دەنگێکی هێواش و لەسەر خۆ خانەوادەکەی ئاگادارکردەوە لەناکاو پیرێژنێك هاتە دەرێ بەرەولای ئێمە کەوتە ڕێ هەرکه منی بینی گوتی: یاخوا بەخێربێ بێ ئەو کەسەی که ڕوخساری خۆشەویست وگڵێنەی چاوی منی بینوە.

پێم گوت: کێ هەواڵی پێدایی که من ئەوم بینی وە؟ گوتی: ئەو هەواڵی پێدام که تۆ کوڕەکەی منت کەفن کردووە، وەئەوکەفن و پۆشاکەش کەهی خۆت بوو بۆت دەگێڕمەوە و دەبێ لێم دەرگریتەوە، ئەی ذالنون سوێند بەخواو به پیرۆزییەکەی پۆشاك و خەرقەی کوڕم فریشتەکانی






ئاسمان شانازی پێوەدەکەن، پاشان گوتی: ئەی ذالنون چۆن کوڕەکەی منت بەجێ هێشت، گلێنەی چاوم وهێزی دڵ و گیانم، پێم گووت: لە چۆڵ و بیابان لە نێو لیم و بەردان بەشی خۆی وەرگرت لەلایەن خودای بالأدەست و لێخۆشبەر کاتێ پیرێژنەکە ئەمەی بیست منداڵەکەی خۆی گرتە باوەشی بەتوندی گوشی ئینجا لە پێش چاوانم ون بوو، نەمزانی بۆ کوێ چوو نەمزانی نەبۆ ئاسمان چوو نەزەوی قووتی دان، چوومە ناو ماڵەکە دەگەرام بەلأم نەمدۆزینەوە، دەمگۆت: ئەوە بۆ کوێ چوون؟

گوێم لە دەنگێك بوو دەیگوت: ئەی ذالنون! خۆت ئازارمەدە هەموو دونیا داوای ئەوانی کردووە بەلأم نەدۆزرانەوە منیش گوتم: بۆ کوێ چوون؟

ئەو دەنگە پێی گوتم: شەهیدان لە جەنگدا بەشمشێری کافرەکان دەمرن بەلأم ئەوانە خۆشەویستی خوا بوون بەعەشق وخۆشەویستی خوا مردن، بەپێڕۆی نورین هەڵگیران بۆ (مقعد صدق) لەلای پادشای گەورە و خاوەن هێزو دەسەلأت

ذالنون دەڵێ: لەوسەین وبەینە دا بوخچەکەم لێ ون بوو، لەناکاو دۆزیمەوە بینیم ئەو کەفنەی کە پێم کفن کرد بوو لە بیابان وا لە ناو بوحچەکەم دایە وەکو خۆی لوول دراوە، بۆم گەڕاوەتەوە. خوای گەورە لێیان ڕازی بێ، بە بەرەکاتی ئەوانیش ئێمە سوود مەندەبین ان شاالله[1].

---

( ١) بحر الدموع / الامام ابن الجوزي لاپەرە (٣٥) الطبعة الاولى دار الفجر دمشق






## ٣١٤- ئەوەی لە پێش تۆبە کردندابینی

ئیمامی (الذهبي) لە کتێبی (الکبائر)دا دەفەرمووێ :

خەلیفە عبدالملك ی کوڕی مروان دەڵێ: گەنجێکی غەمبار بەگریانەوەهاتە لام گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران بەڕاستی گوناهێکی گەورەەم کردووە ئایا بۆم هەیە تۆبە بکەم؟

عبدالملك گوتی: گوناهەکەت چییە؟

گوتی: گوناهم زۆر گەورەیە

عبدالملك گوتی: ئەو گوناهە گەورەیە چییە؟ تۆبە بکە و بگەڕێوە بۆ لای خوا، خوا تۆبەلە بەندەکانی وەردەگرێ ولە تاوانیان دەبوورێ.

گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، من پیاوێك بووم خەریکی هەڵکەندنی گۆڕ بووم، کفنەکەم دەردەهێنا و دەمفرۆشت، وەلەو کارەمدا شتی زۆر سەیر و سەمەرەم بینی.

خەلیفە گوتی: چیت بینی.

گوتی: شەوێك گۆڕرێکم هەڵکەند بینیم خاوەنەکەی ڕوی لە قیبلە وەرگێردراوە، زۆرلێی ترسام، ویستم ڕابکەم، گوێم لە دەنگێك بوو لە ناوگۆڕەکە دەیگوت :

بۆچی ناپرسی ئەو مردووە بۆ ڕوی وەرگێراوە لە قیبلە؟






منیش گوتم: بەترسەوە بۆچی ڕوی وەرگێراوە؟

دەنگەکە گوتی: لەبەر ئەوە گرنگی بە نوێژ نەداوە، ئەوەش پاداشتی یەتی.

جارێکی تر گۆڕێکم هەڵکەند، بینیم خاوەنەکە (مردووەکە) بووە بە بەراز وەبە زنجیر بەستراوەتەوە، زۆر لێی ترسام ویستم ڕابکەم لەلای یەکێك پێی گوتم: بۆچی لە کردەوەکانی ناپرسیت وە بۆ ناپرسی کەوا لەبەرچی بەوشێوە ئازار دەدرێت.

منیش بەترسەوە گوتم: بۆچی؟

گوتی: ئەو مردووە لە دنیادا عەرەقی دەخواردەوە وە لەسەر تۆبەو گەڕانەوەش نەمردووە.

ئەی ئەمیری ئیمانداران گۆڕی سێ یەم ئەوەبوو مردووەکەم بینی بە ئاگر لە زەوی بەسترابوەوە، وەزمانیشی لە پشتی ئەستۆی هێنابوە دەرێ زۆر لێ ترسام ویستم ڕابکەم.

بانگ کرام، بۆچی لەوەزعی ئەو مردووە ناپرسی؟

منیش گوتم: لەبەر ئەوە خۆی لە پاشەڕۆی میز نەدەپاراست وەقسەی بۆ ئەم و ئەو دەگواستەوە، نێوان خەڵکی تێك دەدا.

ئەوەش پاداشتی یەتی.

چوارەم: ئەی ئەمیری ئیمانداران گۆڕێکم هەڵکەند خاوەنەکەی ئاگرێکی






گەورەی لەناو گۆڕەکەدا هەڵگیرساندبوو، زۆر لێی ترسام ویستم ڕابکەم، پێیان گوتم بۆ ناپرسی لەوەزعی ئەو پیاوە؟

گوتم: بۆ چی وابەسەر هاتووە؟

گوتی: ئەو پیاوە لەدنیادا وازی هێناوە لە نوێژکردن وئەوەش پاداشتییەتی.

پێنجەم ئەی ئەمیری ئیمانداران گۆڕێکم هەڵکەند، بینیم گۆڕەکە هەتابڵێ فراوان کراوە لەسەر مردوەکە بەدرێژای بینین وەنورو ڕۆشنائیك لەناو گۆڕەکەدا هەبوو، مردووەکەش زۆر بە ئارامی لەسەر تەختێك خەوتبوو، ئەم نورەش هەموو دەوری ڕوون کردبوەوە، وەبەرگو بۆشاکێکی زۆر جوانی لەبەر بوو، منیش شەرمم لێکرد و ویستم بۆی دەربچم وڕابکەم، پێان گوتم: بۆ ناپرسی چۆن خوا ئەو ڕێزەی ناوە لێی؟

گوتم: بۆچی خوا ئەو ڕێزەی ناوە لێی؟

پێیان گوتم: لەبەر ئەوە لەدنیادا گەنجێکی تۆبەکارو خواپەرست بوو، لە گەنجایەتیدا دەستی کردبوو بە خواپەرستی

خەلیفەی عبدالملك گوتی: بەراستی ئەو ڕووداوە، ئامۆژگارییە بۆ تاوانباران، وەموژدەیەکی خۆشە بۆ خواپەرستان[1].

---

(١) الكبائر / الامام الذهبي -٢٤٣-٢٤٥/ یان قصص العابدين لاپەرە (٤٢)-(٤٣)






## ٣١٥- نابینا لە کاتی قورئان خوێندندا بینایە

ابو حمزه – نصیری کوڕی فەرەج ی اسلمی – کە خزمەتکاری ابو معاویەی (الاسود)بوو دەڵێ :

ابو معاویه چاوەکانی نابیناببوون، ئەو هەرکاتێك بیەوێت کە قورئان بخوێنێت بە دوای قورئان دەگەرێتو لاپەڕەکانی دەکاتەوەو تەماشای دەکات، خوای گەورە چاوەکانی بۆ دەگەڕێنێتەوە، هەرکە قورئانیشی داخست وهەڵیگرت چاوەکانی وەك خۆی نابینا دەبنەوە

– ابو زاهریه دەڵێ :

سەردەمێك چوومە شاری (طرسوس) لەوێ سەردانی ابو معاویەم کرد وچوومە لای، کە بینیم هەردووك چاوی نابینایە و قورئانێکیشی لەماڵ هەڵواسیبوو، پێم گوت :

ئەی ابو معاویه ڕەحمەتت لێ بێ قورئان و تۆی نابینا ؟

ابو معاویه گوتی :

برام ئەوە نەهێینیە دەشارێتەوە لێم تاکو دەمرم؟

گوتم بەڵێ

گوتی: هەرکاتێ ویستبم قورئان بخوێنم چاوەکانم دەکرێنەوە دواتر نابینا دەبم و چاوم دادەخسترێن [1].

---

( ١) من قصص العابدين – حامد احمد الطاهر لاپەرە (٥٠)






## ٣١٦- دادگەری و پارێزراوی

ڕۆژێك نێردراوی پاشای ڕۆم هات بۆ سەردانی ئیمامی عمری کوڕی خەتاب چووە مەدینە و لە ڕێگاکانی پرسیاری لە خەلك دەکرد کۆشکی پاشاتان لە کوێ یە؟

خەڵکیش گوتیان: خەلیفەی عمری کوڕی خەتاب لە کۆشکدا ناژی و پارێزەرو پاسەوانیشی نییە، ئینجا چەند کەسێك لەگەڵ نێردراوی پاشا ڕۆیشتن تا گەیشتنەلای درەختێکێکی گەورەو ئاماژەیان بۆ کەسێکی خەوتوو کرد لەژێر سێبەری درەختەکەدا، گوتیان ئەوە پێشەوای ئیماندارانە کە هەواڵی دەپرسیت. کابرا سەرسام بوو !! چۆن دەبێت کاربەدەست هێندە بێخەم و سادە بێت؟!

کە نزیك بوەوە لە ئیمامی عمر بینی وا لەسەر زەوی خەوتووە و عەباکەی کردووە بەسەرین ئەوەندەی تر سەرسام بوو.

بە ئیمامی عمری گوت :

من نێردراوی پاشای قەیسەرم بۆ لای تۆ واگومانم برد کە تۆش پاشەیەکی وەك پاشاکانی ئێمە وکۆشك و تەلارو پاسەوانت هەیە خەڵك لەدەورتن، بۆ هەر شوێنی دەربچیت خەڵك بەدواتەوەت بەڵام بەڕاستی ئەی عمر تۆ کار بە دەستێکی دادپەروەربوویت بۆیە وابێ خەم و ترس خەوتوویت باکت لە هیچ شتێ نییە[1].

---

( ١) چیرۆکی ڕەوشتەجوانەکان، لاپەڕە (١٧٥)






## ٣١٧- لەگەڵ دۆستانی خوادا

شێخ ابو بکری شیبلی (ڕحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێ:

پیاوێکی دەشتەکیم بینی لەشاری مەکەی پیرۆز خزمەتی پیاوانی تەسەوفی دەکرد منیش پرسیم لە بارەی ئەو شتەوە پیاوەکە گوتی: ڕۆژێکیان بەتەنیا لەو دەشت و دۆڵەبووم، لەناکاو گەنجێکی سەرکوت و بێ خاوسم بینی، هیچ خواردن و خواردنەوە عەسای پێنەبوو، لەدڵی خۆم گوت: دەچمە لای ئەگەر برسی بێ ئەوا خواردنی دەدەمێ ئەگەر تینوو بێ ئەوا ئاوی دەدەمی، دەڵێ: بەپەلە بۆی چووم تاکو نێوانمان گەزێك مابوو لەناکاو لێم دوور کەوتەوە و پاشان لە پێش چاوم ون بوو گوتم: ئەوە بەراستی شەیتان بوو بەلاَم کەسێك بانگی کرد گوتی: نەخێر شەیتان نەبوو ئەوە سەرخۆش بوو[1] منیش بانگم کرد وگوتم: هۆکاکی برا سوێندت دەدەم بەحەقی ئەو خوایەی کە (محمد)ی بەڕاستی ناردووە بە پێغەمبەر دەبێ لێم ڕاوەستیت، دەڵێ: ئاوڕی دایەوە گوتی: گەنجە خۆت ماندوو کرد ومنیش ماندوو کرد، گوتم: بەتەنیام بینی ویستم خزمەتت بکەم، پێی گوتم: کەسێك خوای لە گەڵ دا بێ چۆن بە تەنیا دەبێ؟

منیش گوتم: لەبەر ئەوە هیچ خواردن و خواردنەوەت لەلانەبوو، پێی گوتم: یادی ئەو خۆراکە ئەگەر برسی بووم، وەئامادە بوونی ئەو داواکاری

---

(١) ئەو کەسەی کە بانگی کرد و گوتی سەرخۆشە ئەوە شەیتان بوو ویستی لە خشتەی بەری



منە ئەگەر تینوو بووم، پێم گوت: کەواتە من برسیم خواردنم پێ بدە، گوتی بۆچی باوەڕ بە کەراماتی ئەولیا ناکەیت؟ گوتم: بەڵێ: بەڵام تاکو دڵم باشتر ئارامبگرێ، دەڵێ: بەدەستی خۆی لەزەوی دا کە زەوییێکی وشك و لیم بوو پاشان مشتێکی لێ هەڵگرت و گوتی ها بیخۆ ئەی فێڵلێکراو، سەیرم کرد دەبینم بووە بە ئاردێکی زۆر زۆر ورد، گوتم چەندە خۆش و بەتامە، گوتی: لە دۆڵەکان لەو جۆرەشتانە زۆرە لەلای دۆست و خۆشەویستانی خوا ئەگەر بزانی وتێبگەیت، پێم گوت: دە ئاویشم بدەرێ تینوومە ! دەڵێ: بە قاچی خۆی دا لە زەوی کانییەکی ئاو وەکوو هەنگوین هەلقولا، بۆی دانیشتم تاکو لێی بخۆمەوە، پاشان سەرم بەرزکرد، دەبینم کەسم لەلا نەماوە نەمزانی چۆن لێم ون بوو، وەبۆ کوێ چوو،

بۆیە لەو رۆژەی کە ئەو شتەم بینی هەمیشە خزمەتی فەقیر و هەژاران دەکەم تاکو ئێستا بۆ ئەوەی کەسانی وەك ئەو پیاوە چاکە ببینم[1].

## ٣١٨- ئەو نەخۆشەی کە مرد نابینابوو

لە یەکێك لە نەخۆشخانەکان دوو نەخۆشی بەساڵاچوو لەیەك ژووردا بوون، هەردوکیان یەك نەخۆشیان هەبوو، یەکێکیان رێگەی پێدرابوو لەلایەن پزیشك کە لە رۆژێکدا یەك کاتژمێر دابنیشتێ لەسەر تەختەکەی لە دوای نوێژی عەسر، بۆ ئەوەی باشتر هێور بێتەوە تەختەکەی لەلای پەنجەرەکە

---

(١) ئیمامی ابن الجوزی لە کتێبی (بحر الدموع) داگێڕاویەتی یەوە لاپەڕە (٧٤)




بوو، واتە دیمەنی جوان و قەشەنگ کەوتبووە لای ئەو، ئەوەی تریان دەبوایە بەردەوام لەسەر پشت پاڵ بکەوتایە، هەردووکیان کاتەکەیان بەقسەکردن دەبردە سەر بێ ئەوەی یەکێك ئەوەی تر ببینێ، چونکە هەردوکیان لەسەر پشت پاڵ کەوتبوون وسەیری سەقفی ژوورەکەیان دەکرد، باسی ماڵ و خێزان و خانوو بازاڕ و هەموو شتێان دەکرد.

ڕۆژێکیان دوای نوێژی عەسر ئەوەی کە ڕێگەی پێدراو کاتژمێرێك دابنیشێ هەستایەوە بەرامبەر پەنجەرەکە دانیشت بۆ هاوڕێی باسی دەرەوەی دەکرد  کە چەند دیمەن و شتی جوان جوانی تێدایە وەخەڵکی هاتوو چۆ دەکەن ومنداڵان یاری دەکەن..

بەڕاستی جوانی باس کرد، قسەکانی زۆر خۆش بوون، هاوڕێکەشی ناتوانێ هەستێ سەیربکات بەڵام تامی تەواوی لێ وەردەگرت گوێ ی بۆ دەرگرت وچاوی بۆ دەنوقاند، شت هەر ئەوەندە بە چێژە، چەند ڕۆژێك تێپەربوو بەسەر ژیانیان بەردەوام بوون لەسەر ئەوەی ڕۆژێکیان پەرستیارێك هاتە ژوورەکە بۆ چارەسەر وەکو ڕۆژان بینی ئەو نەخۆشەی کەلەلای پەنجەرەکەیە گیانی دەرچووە هاوڕێکەشی پێی نەزانیوە تەنها بەقسەی پەرستیارەکە نەبێ کە لە ڕێگای تەلەفۆنەوە بیستی، کە داوای دەکرد یارمەتی بدەن بۆ دەرهێنانی لە ژوورەکە، بەهەرحاڵ هاوڕێکەی زۆر غەمبار بوو بە مردنی چونکە کەسی تر لە ژوورەکە نەما باسی دنیای دەرەوەی بۆ بکات و بە قسەی خۆش وجوان دڵی خۆش بکات.



چەند ڕۆژێك ڕۆیشت بەسەر غەمبارییەکەی بۆ هاورێ یەکەی و زۆریش بیری دەکردەوە ڕۆژێك بەهەڵی زانی داوای لە پەرستیارەکە کرد کە تەختەکەی نووسینی بۆ بگوازێتەوە بەردەم پەنچەرەکە تاکو ئەوەندەی لە ژیانی ماوە، لە جێگای هاوڕێیەکەی بخەوێت و بیرەوەریەکانی لە یادنەکات لە کاتی عەسر کە دڵی زۆر خۆش دەکرد، بۆیە بڕیاری دا هێز وەبەرخۆی بینێ وکەمێ دابنیشێ لە بەردەم پەنجەرەکە، دەست و قۆڵی دایە بەرخۆی پاشان لەسەر ئانیشکی پاڵی دایەوە بەرامبەر پەنجەرەکە، وە زۆر بە ئازار ڕۆخساری بەلای پەنجەرەکە دەکردەوە، بۆ ئەوەی ئەو جۆرە شتانە ببینێ کە هاورێ کۆچکردوەکەی بۆی باس دەکرد ودڵی پێ خۆش دەکرد، بەڵام کە بینی لەودیوی پەنجەرەکە تەنها تاقێکی ڕووت وقووت دیارە بەس، وادیارە پەنجەرەکەش هەر لە ناو نەخۆشخانەکەبووە نەك بڕوانێتە دەرەوە کە هەموو شتێ ببینی، ناچار بانگێ پەرستیارەکەی کرد وگوتی: ئەرێ بەراست ئەمە هەمان پەنجەرە نەبوو کە هاوڕێم سەیری دەکرد؟!

گوتی: بەڵێ خۆیەتی، ژوورەکان تەنها یەك پەنجەرەی هەیە، پاشان پەرستیار پرسیاری کرد بۆچی ئەوها سەرسام بویتە ئەویش هەواڵی هاوڕێکەی بۆ گێڕایەوە، بەڵام پەرستیارەکە زیاتر سەر سام بوو بەو قسانە پێی گووت: ئەو نەخۆشەی کە لە لای پەنجەرەکە بوو دواتر کۆچی دوایی کرد ئەوا نابینا بوو هیچی نەدەبینی تەنانەت دیواری نەخۆشیت نەدەبینی، بەڵام بۆ ئەوەی ژیانی تۆ بەختەوەربکات ودڵت خۆش بکات نەخۆش لە بیرت بەرێ وەئازار بەو نەخۆشیەوە نەچیژێت پاشان داوای مردن بکەیت، بۆیە ئەو قسە

خۆشانەی بۆت کرد

– برای بەڕێزم .... ئایا تۆ بەختەوەر نابیت ئەگەر کەسانێك بەختەوەر بکەیت؟

– بێگومان زیاتر بەختەوەر دەبێت

– هەندێ جار خەڵکی ئەو قسانە لەبیر دەکەن کە بۆیان دەکەیت وەهەندێ جار ئەوکارەی کە بۆیان دەکەیت لەبیر دەکەن، بەڵام ئەوان ئەو هەستە جوان و لابقەی کە لە دڵیان ڕوواوە هەرگێز لەبیر ناکەن، وەرن با هەموو دروشممان ئەو ئامۆژکاریە خواییە بێ کە لە نێو لاپەڕە زێڕینەکانی قورئان هاتووە (وقولو للناس حُسناً) واتە: قسەی چاك وجوان وبەجێ بۆ خەڵکی بکەن ودڵیان خۆش بکەن، هەردەم بزەوخەندە بخەنە سەر لێوەکانیان زمانتان با موژدەی پێوە دیاربێ نەك نەفرەت و قسەی ناخۆش وهەواڵی خەماوی[1].

## ٣١٩- خانووەکە و پارەکەش بۆ ئێوە

دەگێڕنەوە پیاوێك وهاوسەرو منداڵەکانی زۆر بە خۆشی وشادی ژیانیان لە خانووێکدا بەسەر دەبرد، بەختەوەری باڵی بەسەریاندا کێشابوو، ساڵێك گرانی هات و زۆر بێ پارە و سامان بوون، بەناچاری بڕیاری فرۆشتنی

---

( ١) قصص اعجبتنی، محمد بن عمر صالح با عیمان لاپەڕە (٣٤) چاپی سێیەم – دار الحضارة

خانووەکەیاندا، پیاوێك هات و دوای مامەڵکە و گفتوگۆ خانووەکەی لیَ کڕین و پارەکەی پێدان.

پاش چەند ڕۆژێك ئەوانماڵیان بەجێهێشت و کابرای کڕیار ماڵ و منداڵی هێنایە ناو خانووەکە، کاتێ شەو داهات کابرا گوێی لە دەنگی گریانێك بوو پرسی ئەوانە کێن دەگرین؟

گوتیان: خێزان و منداڵی ئەو پیاوەیە بوون کە خانووەکەمان لێکڕیبوون کابرای لێی پرسین بۆ چیێ دەگرین؟

گوتیان: دڵگرانین بۆ ئەوخانووە دەگرین، تەنها ئەو خانووەمان هەبوو لەبەر ناچاری بژێوی ژیانمان فرۆشتومانە.

وادیار بوو پیاوە کڕیارەکە، کەسێکی خواناس و بەخشەندە بوو دڵی بۆ ئەو ماڵە هاتە جۆش و بیری کردەوە کە بە ناچاری خانووەکەیان فرۆشتووە، ئێستا خێزانێك بێ لانەو خانوو بوون، بۆیە بانگی خزمەتکارەکەی کرد و پێ گوت: بڕۆ بۆ لایان وپێان بڵێ: کەسبەینێ خانووەکەیان بۆچۆڵ دەکەین، خانووەکەش و پارەکەش بەگەردەن ئازادی بۆخۆیان ! ![1].

---

(١) چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان لاپەڕە (٣٦٨)




## ٣٢٠- زانستی ئیمامی ابو حنیفە

ئیمامی ابو حنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێ، جارێکیان دایکم پرسیارێکی شەرعی لێ کردم وگوتی: سەبارەت بەوە فەتوام بۆ بدە.

منیش فەتوام بۆی دا بەلام بە فەتواکەم ڕازی نەبوو گوتی: دەبێ هەر ئێستا لەگەڵم بێیت بۆ لای (ابو زورعەی بانگخوان) ئیمام هەستا دایکی خۆی لەگەڵ خۆی برد بۆ لای ابو زورعە وەپێی گوت: ئەی ابو زورعە دایکم پرسیارێکی ئاراستە کردووم دەیەوێت تۆ زاناتر و تۆ شارەزا تری لە من خۆت فەتوای بۆ بدە، ئیمامی ابو حنیفە فەرمووی: ئەی ابو زورعە من ئەوهام پێ گوتوە.

ابو زورعە گوتی: ئەی دایکی ئیمام قسەی ڕاست و تەواو ئەوەیە کە ئیمامی ابو حنیفە فەرموویەتی.

ئینجا دایکی ڕازی بوو، ڕۆیشت.

- دەڵێن: ئیمامی ابو حنیفە زۆر چاکەی دەکرد لەگەڵ دایك و باوکی وەزۆر دوعای بۆ دەکردن وداوای لێ خۆشبوونی بۆ دەکردن لەگەڵ مامۆستاکەی

- حمادی کوڕی سلمە - وە لە هەموو مانگێکدا بیست دیناری بۆ دەکردن بە خێرو سەدەقە

- ابو یوسف کە یەکێکە لە مامۆستاکانی ئیمامی ابو حنیفە دەڵێ:






ئیمامی ابو حنیفە دایکی خۆی سواری گوێ درێژەکەی خۆی دەکردو دەیبرد بۆ لای مەجلیسی – عمر – ی کوڕی ذر – ئەوەك قسەکەی ڕەت بکاتەوە [1]

## ٣٢١- قاچەکانی من پاکترن یان ڕوخساری تۆ؟

– قدمي انظف ام وجهك–

لە یەکێك لەشارە ڕۆژئاواییەکان کاتی نوێژی هات، یەکێك لە موسلمانەکان چوو بۆ حەمامی بنکەیەك دەست نوێژ هەڵبگرێت، پیاوێکی بیانی و کافریش لەوێ بوو ئاگای لە موسلمانەبوو زۆر بە وردی تەماشای دەکرد، کاتێك برا موسلمانەکەمان گەیشتە شۆردنی قاچەکانی لەدەس نوێژ یەکسەر قاچی خۆی بەرزکردەوە بۆ سەر مەغسەلەکە، پیاوە کافرەکەش هاواری لێ هەڵکرد وگوتی: ئەوە چی دەکەیت؟

موسلمانەکە بەزەردەخەنەوە وەڵامی دایەوە گوتی: دەست نوێژ هەڵدەگرم پیاوە بیانیەکەش گوتی: ئێوەی موسلمان بەڕاستی پاك و خاوێن نین هەمیشە شوێنی خەڵکی پیس دەکەن، ئێستاش گوایە تۆ خۆت پاك دەکەیت بەڵام دەبینی مەغسەلەکەت پیس کرد بەهۆی شۆردنی قاچە پیسەکانت، بێگومان ئەو مەغسەلەیە بۆ شۆردنی دەست و دەم و چاوە نەك بۆ قاچ شۆردن کەواتە پێویستە تۆ پاك بیت نەك پیسی بکەیت.

برا موسلمانەکە گوتی: دەتوانم پرسیارێك بکەم بەڕاشکاوی وەڵامم

---

( ١) الف قصه وقصه من حياه الائمه الاربعه (٧)–(٨)



دەدەیتەوە؟

پیاوە بیانیەکە گوتی: بەڵێ

موسلمان:تۆ لە یەك ڕۆژدا چەند جار دەست و دەم و چاوت دەشۆریت؟

پیاوە بیانیەکە: یەك جار، لە کاتی لە خەوهەستان یان جاری واهەیە ماندوودەبم دەم و چاوم دەشۆرم

برا موسلمانەکە بەزەردە خەنەوە وەڵامی دایەوە گوتی: منیش لەیەك ڕۆژدا زیاتر لە پێنج جار قاچم دەشۆرم، ئینجا پێم بڵێ کامیان پاکتر دەبن، ئایا قاچەکانی من یان دەم و چاوی تۆ؟

پیاوە بیانیەکە بێ دەنگ بوو بەشەرمەزاری بۆ دواوە گەڕایەوە [1].

## ٣٢٢- خێروچاکە یەك بەدەیە

دەگێڕنەوە لە عبدالله ی کوڕی المبارك – ڕەحمەتی خوای لێ بێت، کە واجارێکیان سواڵکەرێك هات لەدەرگای ماڵی دا ئەویش هیچی لەلانەبوو جگە لە (دە) دانە هێلکە، فەرمانی کرد بە خزمەتکارەکەی کەوا هەمووی پێ بدات، بەڵام خزمەتکارەکە تەنها نۆ دانە هێلکەی پێداو دانەیەکیشی هەڵگرت نزیکی کاتی خۆرئاوابوون هات، لە ناکاو پیاوێك هات و لەدەرگای ماڵی مبارك ی دا، گوتی: ئەو سەلەیە بگرە لەمنەوە بۆ ئێوە، عبدالله بۆی دەرچوو سەلەکەی

---

( ١) قصص اعجبتنی، لاپەڕە (١١٤)




لێ وەرگرت وسەیری کرد هەمووی هێلکەیە دەستی کرد بە ژماردنی هێلکەکان، دەبینی نەوەد (٩٠) هێلکەیە بۆیە بانگی خزمەتکارەکەی کرد و گوتی: کوا هێلکەکانی تر چەندت بەخشین بەسواڵکەرەکە؟

گوتی: تەنها نۆ دانەم پێ دان وبەس، ئەویتریانم هەڵگرت واتە: لە پاداشتی ئەو هێلکەیەی کە هەڵیگرتبوو دە دانەی تری بۆ نەهاتنەوە.

## ٣٢٣- نەمرودی کوڕی کەنعان

نەمرودی کوڕی کەنعان یەکێکە لەو کەسانەی کەوا دەسەڵاتی دنیایان گرتبوە وەدەست وەهەروەها یەکێك بووە لەوانەی کە خۆیان بە خوازانیوە و لەسەر زەوی زولم وستەمیان کردووە لە خەڵك، خوای گەورە موڵك و سامانێکی ئێجکار زۆری پێدابوو بەڵام سنووری خوای شکاند و داوای خوایەتی کرد قورئانی پیرۆز باسی دەکات دەفەرمووێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْىِۦ ﴾ البقرە: ٢٥٨ .

واتە: ئایا ئاوڕێك نادەیتەوە بەلای ئەو نەمرودەدا[1] کە دەمەقاڵێ کرد لەگەڵ ابراهیم پێغەمبەردا، دەرحەق بە پەروەردگاری لەبەرئەوەی خوا پادشایەتی پێدابوو، کاتێ کە ابراهیم لەوەڵامی نەمروود دا – گوتی:

---

( ١) وصایا المنبریە – بەرگی (٢) لاپەڕە (٣٠٧)






پەروەردگاری من ئەو زاتەیە کە ژیان دەداو ژیان دەستێنێ، نەمروود گوتی، منیش ژیان دەدەم و ژیان دەستێنم.

ئینجا دوو زیندان کراوی هێنایەکیانی ئازاد کردو ئەویتریانی کوشت پاشان خوا فریشتیەیەکی بۆ لای ڕەوانەکرد کە وائیمان بەخوابێنێ، ولەسەر دەسەلاّتی خۆی دەمێنێتەوە، بەلاّم ئەو گوتی: ئایا جگە لە خۆم هیچ خوایەکی تر هەیە؟ فریشتەی دووەمیشی بۆ هات وهەمان قسەی پێ گوت پاشان هی سێ یەمیش هات ئەویش بەهەمان شێوە.

فریشتەکە پێ گوت: بۆ ماوەی سێ ڕۆژ هەموو دەسەلاّت و هێزو پشت وپەنات کۆبکەوە، ئەویش کۆی کردەوە، خوا فەرمانی کرد بە فریشتەکە، کەوا دەرگای جیهانی مێشوولەی لەسەر بکاتەوە، کە خۆرهەلاّت لەبەر زۆری ئەو مێشولانە خۆر نەبیندرا، خوا ناردنی بۆ سەریان گۆشتیانی خوارد و خوێنی لێ خواردنەوە وەك ئاو، تەنها ئێسك مابوو لەلاشەیان بەلاّم نەمروود وەك خۆی بوو هیچی بەسەر نەهات، خوا یەك مێشوولەی بۆ ڕەوانەکرد چووەناو دەماغی لە ڕێگای لووتیەوە، بەو ئازارە چوارسەد دانە ساڵ ڕایکێشا و بە مەترەق لێی دەدرا تاکو بێ هۆش بێت ئازارەکەی نەمێنی، لە هەمووکەسێ بەڕەحم تر بەرامبەری ئەو کەسەبوو، کە هەردوو دەستی خۆی کۆدەکردنەوە بەهەموو هێزی لێ دەدا، چوار سەد ساڵ زۆڵم و ستەمی کرد، خوایش چوارسەد ساڵ ئازاری دا وەکو موڵك ودەسەلاّتی پاشان خواگیانی لێ وەرگرتەوە[1] کەواتە تەمەنی هەشت سەد ساڵ بووە.

---

( ١) الجزاء من جنس العمل، د. سيد حسين العفاني، بەرگی (١) لاپەڕە (١٨٦)






## ٣٢٤- تایبەتمەندییەکانی ژمارە حەوت

ئیمامی ابن القیم الجوزیه دەفەرمووێ :

لە ڕووی ئەندازەو شەرعەوە ژمارە حەوت هاتووە و تایبەتمەندی خۆی هەیە.

- خوای گەورە حەوت ئاسمانی دروست کردوون

- بەهەمان شێوە زەویش حەوت تەبەقەی هەیە

- دروست بوونی مرۆڤ تەواو بوو لە حەوت دەور

- خوای گەورە حەوت دانە جار تەوافی بەدەوری کەعبەدا داناوە بۆ بەندەکانی

- هاتووچۆ (السعی) لەنێوان (صفا و (مروه) دا حەوت جارە.

- بەهەمان شێوە ڕەجمی (حجرات) لە میتادا حەوت جارە.

- تەکبیرەی چەژن لە نوێژدا لە ڕەکعەتی یەکەمدا حەوت جارە.

- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن بە نوێژکردن کە تەمەنیان گەیشتە حەوت ساڵان.

- ئەگەر منداڵ گەیشتە تەمەنی حەوت ساڵی سەرپشکە لە نێوان دایك و باوکی.

- پێغەمبەر (ﷺ)لە کاتی نەخۆشیدا فەرمانی کرد کە لە حەوت شوێندا






ئاوی بۆ بێنن

– کزەبای تورەیی خوا بەسەر قەومی (عاد) دا هات لەماوەی حەوت رۆژ

– نمونەی کەسی خێرەمەند کە خوا پاداشتی بداتەوە وەکو ئەو دانەوێلە کە حەوت گوڵێ لێ سەوزبێت.

– ئەو گوڵە دانەوێلەی هاوڕێکەی حەزرەتی یوسف لە خەون دا بینی حەوت دانە بوون.

– ئەو سالانەی کە دانەویلەیان چاند لە میسر حەوت ساڵ بوو.

– هۆزەبانە (العقیقە) کردن بۆ منداڵ لە دوای حەوت رۆژە لە تەمەنی.

– ئەو قاپەی کە سەگ دەمی لێداوە دەبێ حەوت جار بشۆردرێت.

– قورئان لەسەر حەوت پیت دابەزیوە.

– ئەوانەی لە ژێر سێبەری خوا حەشر دەکرێن حەوت چینن

– ئەو تاوانە گەورانەی کە بە لەناوبەر (الموبقات) ناویان هاتووە بریتین لە حەوت تاوان (السبع الموبقات)

– ژمارەی ئایەتەکانی سورەتی (الفاتحە) حەوت ئایەتە ئەمەش اعجازی قورئان و ژمارەی حەوتە.






## ٣٢٥- نوێژکردن گوناهو تاوان هەڵدەوەرێنێ

ابو عثمان ي الفهدي (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێ :

لەگەڵ سلمان ی فارسی لە ژێر سێبەری دارێك بووین، سلمان دارێکی وشکی هێنا دای لە دارەکە و هەژاندی تاکو گەڵای لێ کەوتنە خوارێ پاشان فەرمووی: ئەی ابو عثمان بۆچی لێم ناپرسیت کەوا بۆچی ئەو کارەم کرد؟

ابو عثمان گوتی: بۆ چی واتکرد؟ سلمان فەرمووی: ئەوها پێغەمبەری خوام بینوە وای لە من کردووە کە لەگەڵی دابووم لە ژێر سێبەری دارێك دارێکی وشکی گرت و دای بەدارەکە و هەژاندی تاکو گەڵای لێ کەوتنە خوارێ پاشان گوتی: ئەی سلمان بۆ چی لێم ناپرسی کە وا بۆ ئەو کارەم کرد؟

منیش گوتم: موسڵمان کاتێ دەس نوێژ هەڵدەگرێ بە جوانترین شێوە ئینجا پێنج نوێژی فەرزی پێ دەکات گوناهو تاوان هەڵدەوەرێن لێ وەك چۆن ئەو گەڵایە لەو دارە هەڵدەورێن، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾ هود: ١١٤ [1].

---

( ١) رواه الامام احمد في مسنده (٢٣٥٩٧)



## ٣٢٦- زانای گەورە ابن طاوس و خەلیفە منصور

ئیمامی مالك دەفەرمووێ:

ڕۆژێکیان خەلیفەی بغداد ابو جعفری (المنصور) ناردی بەشوێن من وابن طاوس ئێمەش چووینە لای، کە چویینە ژووریٚ لەسەر بەڕێکی گران بەها دانیشتبوو، بەدەستی خۆی شمشێری خۆی گرتبوو، پیاوەکانیشی بە دەستی شمشێرەوە لەبەردەم ڕاوەستابوون، هەروەها هەندیٚ لە خزم و کەسانیشی لەویٚ بوون، هەرکە لەدەرگا چووینە ژووریٚ ئاماژەی دانیشتنی ئێمەی کرد، دەمێك لێمان بیٚ دەنگ بوو، پاشان ڕووی کردە ابن طاووس وگوتی: قسەیەکی باوکت بگێڕەوە بۆم، ابن گاووس گوتی: بەڵێ، گوێم لە باوکم بووە دەیفەرموو: بەڕاستی لە هەموو کەسێك عەزاب وئێش وئازاری زیاتر بیٚ لە ڕۆژی دوایی ئەو کەسەیە کە خوا لە حوکمی خۆی کردوویەتی بە هاوبەش — واتە: بڕیارو حوکمی لە ژێر دەست دایە فەرمان ڕەوایە، ئێنجا زوڵم وستەم لە دادپەروەری یەکە دەکات ئیمامی مالك دەفەرمووێ: منیش جل و بەرگی خۆم لە خۆم پێچاوە لە ترسی ئەوەی کە خوێنی ابن طاووس نەپرژێنە سەرم.

پاشان خەلیفە ئاوڕی لیٚ دایەوە گوتی: ئەی ابن طاووس ئامۆژگاریم دەکەیت؟ گوتی: بەڵیٚ: ئایا نەتبیستووە کە خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴿٧﴾ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ ﴿٨﴾ وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ ﴿٩﴾ وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلَادِ ﴿١١﴾

فَأَكۡثَرُواْ فِيهَا ٱلۡفَسَادَ ﴿١٢﴾ فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ ﴿١٣﴾ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ ﴿١٤﴾ ﴾ الفجر: ٦ – ١٤ .

واتە: ئایا نابینیت کە پەروەردگاری تۆ چی کرد لە قەومی عاد، ئیرەم کە خاوەنی پایەو دەسەلآت بوو کەوێنە یان دروست نەکرابوو لە هەموو ولآتدا، وەچی کرد بەگەلی (ثمود) کە شاخی بەردیان داتاشی لەشیوو دۆلەکاندا، وەفیرعەونی خاوەن سینگی زۆر وەك ئەهرامەکان بن کە وەك سینگ چوون بە زەویدا، و ئەوانەی یاخی بوون لە ولآتدا وەزۆریان خراپە تێدا کرد ئینجا پەروەردگاری تۆ دایگرتن بە قامچی سزا بەڕاستی پەروەردگاری تۆ لە کەمینی ستەمکاراندایە.

ئیمامی مالك دەفەرمووێ: جل و بەرگم لە خۆم پێچایەوە لە بەر ئەوەی کە خەلیفە لە ملی بدات خوێنی بڕژێتە سەرم، پاشان خەلیفە یەك کاتژمێر ڕاوەستا ئینجاگوتی: ئەی ابن طاووس ئەو پێنووس و کاغەزەم بدەرێ

– ابن طاووس پێی نەدا توند لەدەستی خۆی گرت.

* خەلیفە گوتی: بۆ چی پێت نەدام؟

– ابن طاووس گوتی: لە ترسی ئەوەی نەوەك شتێك بنووسیت کە تاوانباری بێ منیش لەگەلت هاوبەش دەبم لەوتاوانە کاتێ خەلیفە ئەمەی لێ بیستن پێی گوتن هەستن بڕۆن.

ابن طاووس گوتی: ئەوە لە بەر سنوور نەبەزاندمان بوو کە سەلامەت

بووین لە دەستی خەلیفە وەهیچ شتێکمان نەکرد کە خوا ڕقی لێ بێتەوە.

ئیمامی مالك دەفەرمووێ :

لەوڕۆژەدا گەورەیی فەزڵی ابن طاووس زانیوە وەناسیومە کە چەندە ڕاست گۆو ئازاو چاونەترسە[1].

## ٣٢٧- ئامۆژگاری خوا پەرستێك

محمدی کوڕی حسین ی رامهزی دەڵێ :

گوێم لە ابو معاویەی الاسود بوو، کە لەسەر شوورەکانی شاری طرسوس بوو لە نیوەی شەودا دەگریا و دەیگوت: ئاگاداربن هەرکەسێ دنیاو خۆشەویستی دنیای گەورەترین خەم بێ، ئەوا بەیانی لە قیامەتدا هەقی زۆر دوورودرێژ دەبێ، وەهەرکەسێ بترسێ لە نێوان دەستەکانی کە فەقیرو هەژار بێ لە دنیاو زۆر هەوڵ بدات، ئەوا هەمیشە ڕۆژی قیامەت بێ، دەستی تەنگو کورت دەبێ، کەسێ ترسی هەمیشە ڕۆژی قیامەت بێ بێگومان لەدنیادا ئەوەی بۆ دەبێ کە دەیەوێت، ئەی فەقیر ئەگەر زۆرت بۆ خۆت دەوێت، ئەوا نووستن لەشەودا کەم بکەرەوە مەگەر کەمێك نەبێ، قسەی چاك وئامۆژگاری باش لە پیاوی ژیرو عاقل وەربگرە، گرنگی بەڕزق و ڕۆزی کەسانێك مەدە کە لە دوای خۆت دێن، چونکە تۆ داوات لێ ناکرێت کە ڕۆزیان بێ ببەخشیت،

---

( ١) الوصايا المنبرية / بەرگی (١) لاپەڕە (٥١)




خۆت ئامادە بکە بۆ قسەکردن کاتێ ڕادەگیرێیت بەرامبەر بە خوا بۆ پرسیار لێکردن، کردەوەی. چاك بۆ ڕۆژی دوایی پێشکەش بکە، واز بێنە لەسەر قالْ بوونی زۆر، پەلە بکە، پاشان پەلە بکە پێش ئەوەی کە شتێکت بەسەر بێت کە خۆت لێ بەدوور دەگرت، کاتێگیانت گەیشتە گەردەنت دابڕایت لەوەی کە بگەیتە خۆشەویستانت، وەك ئەوە وام کە گیانم گەیشتۆتە گەردەنم، تۆش لەنێو ئازارەکانی گیان کێشان غەمباریت ئێستا پێداویستیەکانت لەخێزانت دابڕان، واتە: ئەوان ناتوانن یارمەتیت بدەن لەو ناڕەحەتییەی کەلەسەرتە بەڵام ئەوان دەبینێت لەدەورتکۆبوونەتەوە تۆش بەکردەوەکانت راگیراوی، بزانە! کەئارامگرتن ڕاگری هەموو کارەکانەو گەروەترە، زیکرو یادی خوا بە گرنگترین کارت دابنێ، جگە لەزیکری خواش ئاگات لەزمانت بێ و جڵەوی بگرە دەست کاتێ زیکری پێ ناکەیت.

پاشان أبو معاویە زۆر گریا ئینجا گوتی: هاوار لەو ڕۆژەی کە ڕەنگو روخسارت تێیدا دەگۆڕێت، وەزمانم تێکدەئاڵێتو قسەم بۆ نایەت وەگەروم وشك دەبێ وەتوێشوی ئەو سەفەرەم کەم دەبێ.

گوتیان: ئەی ابو معاویە کێ ئەو قسەبەپێزانەی کردووە؟

گوتی: ئەوە هی کەسێکی دانایە واتە حەکیم.



## ٣٢٨- شەیتانەکان دەسەڵاتیان نییە بەسەر ئەو

(أبو موسى)ی المدینی دەگێڕێتەوە لە ابراهیم ی کوڕی الحکم، ئەویش لە باوکی، ئەویش لە عکرمە دەڵێ :

ڕۆژێك پیاوێکی ڕێبوار بەلای پیاوێکی خەوتوو تێپەڕی کرد پیاوە ڕێبوارەکە بینی دوو شەیتان لەلای خەوتووەکەن. گوێی لێبوو یەکێك لە شەیتانەکان بە ئەوی تریان دەگووت : بڕۆ لای ئەو پیاوە خەوی لێ بزەڕێنە و دڵی ئاڵۆز و خراپ بکە، ئەویش چوو کەلێی نزیك کەوتەوە گەڕایەوە لای هاوڕێکەی گوتی : بەڕاستی لە سەر ئایەتێکی قورئان خەوتووە ئێمە هیچ دەسەلاتمان نیە بە سەریەوە.

هاوڕێکەشی چوو بۆ لای، کە لێی نزیك کەوتەوە دەست بەجێ گەڕایەوە گوتی :ڕاست دەکەیت، ئینجا ڕۆشت.

کاتێ پیاوەکە لە خەوەکەی هەستایەوە، ڕێبوارەکە چووە لای هەواڵی دوو شەیتانەکەی پێگەیاندو پێی گوت : وەرە پێم بڵێ تۆ ئەو ئایەتە چی بوو خوێندت پێش نووستنت؟

گوتی: کاتێ کە نووستم ئەو ئایەتەم خوێند ((إن ربكم الله الذي خلق السموات والأرض في ستة أيام ثم استوى على العرش يغشي الليل النهار يطلبه حثيثا والشمس والقمر والنجوم مسخرات بأمره ألاله الخلق والأمر تبارك الله رب العالمين)) سورة الأعراف (٥٤)[1].

---

(١) الوابل الصيب، الامام ابن القیم الجوزیة لاپەرە (١٧٦)




## ٣٢٩- دانانی بەردەکان بوو بە قەڵایەك بۆی لە ئاگری دۆزەخ

عبدالعزیزی کوڕی أبو رواد دەڵێ :

پیاوێك هەبوو لەو دەشت و کێوە مزگەوتێکی کردبوو، حەوت دانە بەردی دانا بوون لەلای قیبلەکەی، هەر کاتێ نوێژی تەواو دەکرد ڕووی دەکردە بەردەکان و دەیگوت؟

ئەی بەردەکان بە شاهید بن کەوا هیچ خوایەك نیە جگە لە زاتی (الله) قەدەری خوا وابوو ئەو پیاوە نەخۆش کەوت، ئینجا هەر لەو نەخۆشیەوە گیانی دەرچوو-مرد-

عبدالعزیز دەڵێ : لە خەومدا بینیم فەرمانی پێکرا کەوا بەرەو ئاگری دۆزەخ بیبەن، منیش یەکێك لەو بەردانەم بینی و ناسیمەوە کە لە مزگەوتەکەی دانا بوو زۆر گەورەو زەبەلاح ببو دەرگایەك لە دەرگاکانی دۆزەخی لێم داخستبوو پاشان چووە لای دەرگاکەی تر، هەمان بەردم ناسیەوە کە زۆر ببو دەرگایەکی تری لێم داخستبوو لە دەرگاکانی دۆزەخ، دەبینم هەموو دەرگای دۆزەخ بەبەردەکانی تر داخستراون[1].

---

(١) الوابل الصیب، الامام ابن القیم الجوزیة لاپەرە (١٦٢).






## ٣٣٠ - پێشەوای گەورەو زاهید ( طاووس )ی یەمانی

نعمانی کوڕی زبێری صنعانی دەڵێ : محمدی کوڕی یوسف کە برای حجاجی کوڕی یوسفی سەقەفییە. حەوت سەد دینار، یان پێنج سەد دیناری نارد بۆ پێشەوا طاووس، بە هەڵگری پارەکەی گووت : پێی بڵێ ئەگەر لێی وەرگرتیت ئەوا أمیر، پۆشاك و جل و بەرگت پێدەدات وە لە گەڵت چاك دەبێ، ئیتر نێردراوەکە پارەکەی بۆ طاووس برد لە بەردەمی دانا و گوتی : پێویستیم پێی نییە، بەڵام ئەو هەر زۆری لێ دەکرد لەسەر وەرگرتنی، هەر وەرینەگرت، ناچار کابرا هەڵیگرت و خستیە ناو دەلاقەیەك و رۆشت، کە گەرایەوە بە ئەمیرو کۆمەڵەکەی گوت : پارەکەی وەرگرت-دوای سەردەمێکی زۆر ناخۆشییك دروست دەبێ لە نێوانیان کە طاووس‌شتێکی کردووە ئەوانیش پێیان ناخۆشە، ئەمیر گوتی : بڕۆن بۆ لای طاووس پێی بڵێن با پارەکانمان بۆ رەت بکاتەوە، نێردراوێکی نارد بۆ لای گوتی :ئەو ماڵەم بدەرەوە کە ئەمیر ناردی بۆت. طاووس گوتی : هیچ ماڵم وەرنەگرتووە لە هیچ کەس، هەواڵەکە گەیشتەوە ئەمیر خەڵکی گوتیان طاووس راست دەکات-بۆیە گوتیان ئەو پیاوەی کە پارەکەی نارد ئەو بنێرن، کە پیاوەکە چوو لای طاووس گوتی: ئەوەی پێمان دابوویت بمان دەرەوە ئەی ابوعبدالرحمن- طاووس گوتی : ئایا هیچ شتێکم لێت وەرگرت؟!

گوتی : نەخێر.

طاووس گوتی : ئایا لە کوێ داتناوە و هەڵتگرتووە؟



گوتی : بەڵێ لە نێو دەلاقەکە دامناوە طاووس گوتی : بڕۆ سەیری بکە بزانە لە کوێیە. دەڵێ : کابرا دەستی بۆ نێو دەلاقەکە درێژ کرد یەکسەر کیسە پارەکە هاتە ناو دەستی، دەبینێ جاڵجاکوکەش ماڵی لەسەر کردووە. طاووس گوتی : کەواتە ببیە، ئەویش بردی بۆ لای ئەمیر[1].

## ٣٣١- ئەو ماڵەی کە لێی دەبەخشرێت هەرگیز کەم ناکات.

جارێکیان سێ پیاو – کە خەڵکی مەدینە بوون –بەلای خێمەیەکدا تێدەپەڕن کە پیرەژنێکی لێدەبێت، بە پیرەژنەکە دەڵێن : داپیرە خەریکە لە برسان و لە تێنووان دا دەمرین شتێکت لانییە بیخۆین؟ پیرەژنەکە تەنها مەڕێکی لاتی بچوکی لەلا بوو گوتی : ئەو مەڕە بدۆشن و شیرەکەی بخۆن، دوای ئەوەی کە مەڕەکەیان دۆشی تێر شیریان خواردەوە پاشان گوتیان : ئەی خواردنت لانییە بیخۆین؟!

پیرەژنەکە گوتی : با یەکێکتان هەستێ ئەو مەڕە سەر ببرێت، منیش بۆتان دەکەم بەژەمە خواردنێکی باش، یەکێك لە پیاوەکان هەستاو مەڕەکەی سەربڕی پیرەژنەکەش بۆی کردن بە چێشتێکی باش هەرسێ پیاوەکەش باش تێر بوون، پاشان گوتیان : داپیرە ئێمە بۆ حەجی ماڵی خوا دەچین ئەگەر بەسەلامەتی گەڕاینەوە، وەرە بۆ مەدینە تا پاداشتی ئەو چاکەیەت بدەینەوە، پاش ماوەیەك پیرەژنەکە لەگەڵ مێردەکەی دەچن بۆ شاری

---

(١) الزهد، للأمام احمد بن حبنل الشيباني، رقم(٢٢٠٤)




مەدینەی پیرۆز، یەکێك لە پیاوەکان دەبینن ئەویش هەزار مەڕو هەزار دیناریان دەداتێ، پاشان دەچن بۆ لای پیاوی دووەم ئەویش بەهەمان شێوە هەزار مەڕو هەزار دیناریان دەداتێ، پاشان دەچن بۆ لای پیاوی سێیەم ئەویش دوو هەزار مەڕو دوو هەزار دیناریان دەداتێ، لە پاداشتی یەك مەڕ چوار هەزار سەر مەڕ وەردەگرن لەگەڵ چوار هەزار دینار، بۆیە دەگوترێ ئەو ماڵەی کە لێی دەبەخشرێت هەرگیز کەم ناکات بەڵکو زۆریش زیاد دەکات[1].

## ٣٣٢- دوو کێوی گەورە لە ئاگر

یەکێك لە پیاو سالّحان دەڵێ :

سەردانی دراوسێکی خۆم کرد کە کرین و فرۆشتنی گەنمی دەکرد کاتێ دانیشتم لەلای سەری، گوێم لێ بوو دەیگوت: دوو کێوی گەورە لە ئاگر، دوو کێوی گەورە لە ئاگر.

منیش پرسیم لە خێزانەکەی، ئەمە چی یە ومەبەستی چی یە؟

گوتی: کاتی خۆی کرین و فرۆشتنی گەنمی دەکرد ودوو پێوانەی هەبوون یەکیان گەورە ئەویتر بچوك هەرکاتێ دەیکڕی بە گەورەکەی پێوانە دەکرد بۆ خۆی، وەهەرکاتێکیش بیفرۆشتایە بە بچوکەکەی دەیفرۆشت وابزانم ئەمە ئەو دوو پێوانەیە بۆی بووەتە دووکێو لە ئاگر[2].

---

(١)چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان. لاپەرە(٢٧٩)چاپی چوارەم، ٢٠١٢م.

( ٢) بحر الدموع، ابن الجوزي (٢١١)



## ٣٢٣- تاوانی غەیبەت

ابو الحسن ی – القرطبي – لە کتێبی (الزاهر)دا دەفەرمووێ:

مامێکم هەبوو لە شاری (فاس) لە ساڵی (٥٥٥) کۆچی وەفاتی کردبوو، لە خەومدا بینیم کە هاتە لام لە ماڵم، منیش هەستام پێشوازی لێ بکەم و لە دەرگا پێی گەیشتم سەلامم لێی کرد وهاتە ژوورێ منیش بەدوایدا هاتمە ژوورێ، کە هاتە ناوەڕاستی خانووەکەم دانیشت پاڵی بەدیوارەکەدا ومنیش لەبەرامبەری دانیشتم، بینیم ڕەنگی خراپ گۆڕاوە، بۆیە پێم گوت: ئەی مامە ! چیت بەسەرهات لەلای خوای خۆت؟ گوتی کورەکەم چیم بەسەر بێ لەلای خوایەك کە خاوەن کەڕەم ولوتف و سۆزە، لە هەموو شتەکانم خۆش بووە تەنها غەیبەت نەبێ، چونکە لەوەتەی لە دنیا جیابوومەتەوە تاکوو ئێستا ڕاگیراوم لە غەیبەت، بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم غەیبەت ودووزمانی نەکەیت چونکە لێرەدا هیچ شتێ وەکو غەیبەت نییە کە لەسەری ئازار بدرێت وداوای بکرێت وبانگی بکرێت لەبەر ئەوە غەیبەتی کردووە، ئینجا لەلام ڕۆیشت و بەجێی هێشتم [١].

---

(١) بحر الدموع، ابن الجوزي (١٨٦)




## ٣٣٤- ملکەچی هارون الرشید (تواضع هارون الرشید)

هارون الرشید یەکێك بوو لە خەلیفەکانی عەباسی لە بەغدا، هەندێ لەڕەوشتەکانی ئەوەبوو کە زۆر ملکەچ بوو بەرامبەر بە ئامۆژگاری زانایان وەزیاتر لە خەلیفەکانی تری دوای خۆی ڕێزی لە زانایان گرتووە دەڵێن: کۆشکێکی یەکجار گەورەو تایبەتی دروست کرد،وەخواردنو خواردنەوەیەکی زۆریشی تێدا ئامادە کرد بۆ ئەو خەڵکەی کە سەردانی دەکەن، ئێنجا یەکێکی لە شاعیرانی بەناوبانگی ئەو سەردەمەی بانگ کرد و پێی گوت: هەندێك باسی ژیان و خۆشی دنیاو ئەو نازو نیعمەتەمان بۆ بکە کەوا تێیداوین

شاعیر گوتی:

| | |
|---|---|
| عیـش ما بدا لك سالما | في ظل شاهقة القصور |
| تسعى اليك بما اشتهيت | لدى الرواح الى البكور |
| فاذا النفوس تقعقعت | عن ضيق حشرجة الصدور |
| فـهناك تعلم موقنا | ما كنـت الا في غـرور |

واتە: لە ژێر سێبەری کۆشکی بەرزت ژیان بەسەرببە ئەوەندەی ساغ وسەلامەتی، هەرچی ئارەزوو بکەیت ئەوا بۆی دێتە بەردەمت لە ئێوارە تاکو بەیانی، بەڵام کاتی گیانەکانە هاواریان لێ هەڵسا لەبەر تەنگی وناخۆشی گیان دەرچوون لە کاتێ مردن دا لێرەدا چاك بزانە و دڵنیابە کە تۆ تەنها مەغروری لە خۆبایی بوویت.



کاتێ خەلیفە هارون الرشید ئەمەی بیست زۆر کاری تێکردو زۆرگریا، ئینجا بە شاعیرەکەیان گووت:

امیر المؤمنین بۆ ئەوە بانگی کردیت تاکو دڵی خۆش بکەیت و بەشان وبالأی کۆشکەی شیعر بڵێت بەلأم تۆ بەڕاستی غەمبار و ناڕەحەتت کرد.

خەلیفە گوتی: وازی لێ بێنن! ئێمەی لە تاریکی و کوێرەوەری بینی بۆیە پێی خۆش بوو کەوا ئەو تاریکی و کوێرەوەری یەمان لێ زیاد نەکات[1].

## ٣٣٥- درەختی سێو – شجرة التفاح

لە دێر زەمانەوە دەڵێن دارێکی گەورەی سێوهەبوو، منداڵێکیش کردبووی بە نەریت دەچووە ژێر ئەوداره سێوە یاری دەکرد.

ناوەناوە دارەکەی دەهەژاند و سێوی لێ دەخوارد، دواتر لە ژێر سێبەرەکەی دادەنیشت ئەو منداڵە ئەو دارە سێوەی زۆر خۆش دەویست، ئەویش زیاتر منداڵەکەی خۆش دەویست وحەزی دەکرد یاری بکات لە ژێر سێبەری، ساڵانێك تێپەڕی کرد بەسەر تەمەنی منداڵەکە و گەورەبوو لە بەرئەوە نەهاتە ژێر دارەکە یاری بکات.

ڕۆژێك لە ڕۆژان منداڵە بەغەمباری هات بۆ لای، دارەکە پێی گوت: وەرە یاری بکە لە گەڵم.

---

(١) هارون الرشيد سيره وتاريخ تراجم، تاليف مرزوق بن سالم الغامدى

منداڵەکە گوتی: من ئێستا وەك جاران منداڵ نیم وگەورە بووم وەکو جارانیش لە ژێر سێبەری داران یاری ناکەم، بەڵام من دەمەوێت سەیارەیەك بکڕم وبێویستیم بە پارەیەکی زۆر هەیە، دار سێوەکە گوتی: بەداخەوە پارەم نییە بەس وەرە بەروبوومی من (سێو) هەمووی لێ بچرەو بیفرۆشە تاکو کارەکەت بێ جێ بەجێ دەبێ، کوڕەکە دڵی خۆشبوو هەستا هەموو سێوەکانی لێ کردنەوە و بەدڵ خۆشی ڕۆیشت، بەڵام ساڵانێك ڕۆیشت کوڕە نەهاتەوە لای دارەکە سوپاسی چاکەی بکات بۆیە زۆر غەمباربوو بۆی، لەناکاو ڕۆژێك لە ڕۆژان کوڕەکە گەڕایەوە لای دارەکە پێی گوت: وەرە یاریم لەگەڵ بکە.

کوڕەکە گوتی: کاتم نییە لە یاری بەزایە بدەم پێویستە کار بکەم تاکو ماڵ و منداڵم بژێینم، وەدەمەوێت خانوێك بۆ خۆم و کورەکەم دروست بکەم تاکو پێکەوە لێ بژین، ئایا تۆ دەتوانی هاوکاریم بکەیت؟

دارەکە گوتی: بەداخەوە ماڵم نییە خانووم نییە ! بەڵام ئەتوانی لقەکانم لێ ببریت بۆ ئەوەی خانووێکی بۆ خۆیت و خێزان ومنداڵت دروست بکەیت.

کوڕەکە دڵی زۆر خۆش بوو بەمە گوتی: زۆر باشە، بۆیە هەستا هەموو لق و پۆپی دارەکەی برین وبەدڵ خۆشی ڕۆیشت، دارەکەش دڵی زۆر خۆش بوو چونکە پێداویستی ئەو کوڕەی جێ بەجێ کردووە.

بەڵام کوڕەکە نەهاتەوە، داریش بەبێ گەڵاولق هەرهەناسەی غەمباری هەڵدەکێشا وبەتەنیا مایەوە.

لەوەرزی هاوین لە ڕۆژێکی گەرم لەناکاو کوڕە پەیدا بوو داری بێ نازیش دڵێ زۆر خۆش بوو بەمە گوتی: کوڕە وەرە با یاری پێکەوە بکەین

گوتی: تازە کەڵکی یاری وئەو شتانەم نەما پیربووم، وەدەمەوێت لە ناو بەحردا بەبەلەم هاتوو چۆ بکەم تاکو لاشەم دەحەسێتەوە، ئایا تۆ دەتوانی بەلەمێکم بدەیتێ؟

دارەکە: بەدانەوە ناتوانم بەلاّم تۆ دەتوانی ڕەگ و لق و توێکڵی من لێ بکەینەوە وبەلەمێکی لێ دروست بکەیت وتاکو دوور بڕۆینت لەناو بەحر و بە ئاسوودەییش بژیت.

کوڕە هەستا وای کرد کە پێی گوت نەگەڕایەوە تاکو ماوەیەکی دوورو درێژ

دوای چەند ساڵانێکی زۆر کوڕە گەرایەوە، دارەکە گوتی: بەداخەوە کوڕەکەم هیچ شتم لەلانەماوە یارمەتیت پێ بدەم وەهیچ سیو و سێبەریشم نەماوە کە ئارامی پێ بگرێت.

کوڕە گوتی: گرفت نییە منیش ددانم نییە سێوی پێ بخۆم و ئەو توانایەم نەماوە

دار سێو گوتی: هیچ لقێکیشم نەماوە بیهەژێنیت

کوڕە گوتی: نەخێر توانای ئەوەم نییە پیر بووم

دار سێو گوتی: بەچاوی فرمێسکەوە بەڵی منیش هیچم نەماوە پێت




ببەخشم تەنها دارێکی وشك نەبێ کوڕە گوتی: منیش زۆر ماندوو بووم لەو ساڵانە و تووشی ئازاری پشتم هاتووەم دارسێو گوتی: ئاسانە وەرە پاڵ بدە بە من تاکو پشتت چاك دەبێتەوە وەچاك دەحەسێتەوە، وەرە وەرە نزیکم دانیشە لەلام کوڕە دانیشت لە پاڵ دارەکە وەدارەکەش زۆر بەمە بەختەوەر بوو، پێدەکەنی وفرمێسکی کەیف و خۆشی هەڵدەوارند لە چاوانی برای بەڕێزم ئەمە بەسەرهاتە کەمان بوو.

ئایا دەزانی ئەو دارسێوە کێ بوو کە چەند دڵسۆز و بەپەرۆش بۆ ئەو کوڕە؟

بێگومان ئەمە نموونەی دایك وباوك بوو کە لەکاتی منداڵی دا چەند ئێمەی خۆش دەویست وياريمان لەگەڵ دەکرد بەڵام کە گەورە بووین وازمان لێ هێنا لەبەر سەرقاڵی خۆمان وەبەجارێ فەرامۆشمان کرد مەگەر بۆ کارێکی پێویستی خۆمان نەباسەردانمان نەدەکرد[1].

## ٢٣٦- سزای نوێژ نەکەر

دەگێرنەوە کە ئافرەتێکی بەنی ئیسرائیل هاتە خزمەت حەزرەتی موسی (علیه السلام) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من تاوانێکی زۆر گەورەم کردووە، وەتۆبەم لێ کردووە، هاتوومەتە لات بەڵکو تۆش لە خزمەت خوای گەورە داوای لێ بووردنم بۆ بکەیت، حەزرەتی موسی فەرمووی: گوناهو تاوانەکەت

(١) قصص اعجبتنی، بەدەس کارییەوە، لاپەرە (٦٢)






چییە؟ گوتی: من زینام کردووە ومنداڵەکەشم کوشتووە، فەرمووی: برۆ بۆ دەرەوە تاکو خوا بەهۆی شوومی وپیسی تۆوە سزای نەداوین وئاگری نەباراندووە بەسەرماندا، ژنەکە بە دڵ شکاوی چووە دەرەوە، جوبرەئیل هاتە خوارەوە و چووە لای حەزرەتی موسی فەرمووی: ئەی موسی بۆ چی بەو شێوە دڵی ئەو ئافرەتەت شکاند؟ وەدەرتکرد ئایا ئەی موسی بەهۆی ئەو ئافرەتە تووشی هیچ شتی هاتی وەیان هەستت بە هیچ شتێك کرد؟ حەزرەتی موسی فەرمووی: تاوان لەوە خراپتر هەیە وە چ شتێ لەوە خراپترە؟

جوبرەئیل فەرموی: بەڵی تاوان هەیە لەو تاوانەش گەورەترو خراپترە

موسی فەرمووی: چییە؟

جوبرەئیل فەرمووی: کەسێکە کە بەنقەست واز لە نوێژ کردن بێنێ تاوانی لەوە گەورەترە[1].

## ٣٣٧- بەندەی خوا وپیاو چاك – صالح المری

دەڵێ: جارێکیان شەوی هەینی بوو وەکوو عادەتی خۆم چووم بۆ ناوگۆرستان لە نێو گۆڕەکاندا نووستم، بینیم کە گۆرەکان هەموو دەمیان دایەوە و مردووەکان هەموویان هاتنە دەرەوە بە کۆمەڵ دانیشتن وخواردنیان بۆ دابەزی وهەموویان سەریان داپۆشرابوو، منداڵێکی لاوی تازە

(١) كتاب الكبائر – الامام الذهبي



پێگەیشتوویان تێدا بوو کە سزادەدرا بەهەموو جۆرە شێوەیەك لەناویاندا دەڵی چوومە پێشەوە پێم گوت: ئەی گەنجە لەسەرچی و هۆکار چییە بەو شێوەیە سزا دەدرێت لە نێو ئەو کۆمەڵە خەڵکەدا؟ گوتی: ئەی صالح ی پیاو چاك توخوا من چی دەڵێم وچیت پێ ڕادەگەیەنم بۆم جێ بەجێ بکە وەك ئەمانەتێك وە بەزەییت بە غەریبیم دا بێتەوە بەڵکو خوای گەورە وابکات کە لە سەردەستی تۆودا ڕزگارم بکات، من کە مردووم دایکێکم هەیە هەمیشە خەریکی گریان و لاواندنەوەو خۆڕنین ولە خۆدان و هاوار و شین و واوەیلایە وەبەدەنگی بەرز ئەو شین و بەزمە دەگێڕێت، خوا ئەوەی پێناخۆشە و بەهۆی ئەوەوە ئەوەتا من ئەو سزایە دەدرێم بەهۆی ئەو کارە ناڕەوایە و ناڕازی دەربڕینەی ئەوەوە کە ئەنجامی دەدات، کە خۆی بە کارێکی باشی دەزانێت، بەڵام ئەوەتا بۆ من بۆتە هۆی سزاو ئازاردانم کە ئاگر لای چەپ وڕاست پێش و دوامەوە بەهۆی گوتنی خراپەی دایکمەوەیە، هەرگیز خوا پاداشتی لەلاین منەوە ناداتەوە، ئیتر دەستی کرد بە گریانێکی وا منیشی خستە گریان بەدوای خۆیدا، ئینجا گوتی: ئەی صالح-ی پیاو چاك خوا ئەوەی لەسەر تۆیە بچۆرە لای دایکم کە ماڵەکەیان لە فلان شوێندا و بەتەواوی ماڵەکەیان پێ نیشاندام، گوتی: پێ بڵێ سزای کوڕەکەت مەدە ئەی دایکە، ئەی دایکە پەروەردەت کردم لە هەموو خراپەیەك منت پاراست، بەڵام کە مردم فڕێتدامە نێو ئازار و ئەشکەنجەی زۆرەوە، دایکە گیان ئەگەر دەمبینی کە لە چ حاڵێکدا کۆت و زنجیر کراوم لە مل ودەست و قاچمدا وەفریشتەی سزا چۆن لێم دەدا و ئازارم دەدا، ئەگەر چاوت لێم بایە بەزەییت

پێمدا دەهاتەوە ئەگەر وازم لێ ناهێنیت لەسەر ئەو گریان و لە خۆدان و هاوارە، ئەوا خوا لە نێوانمان دایە لە ڕۆژێك كە ئاسمانەكان لەیەكتر جیادەبنەوە و وەخەڵكی ئامادە دەكرێن ولە گۆڕەكان دێنە دەرەوە بۆ لێپرسینەوە –صالح– دەڵێ لەوخەوەدا هەستام وزۆر ترسام وهەتا بەیانی بەغەم و پەژارە مامەوە خەوم لێ نەكەوت كە بەیانی هات هیچ غەمێكم نەبوو جگە لە غەمی دایكی كوڕە لاوەكە بەولاوە، چووم ماڵەكەم دۆزیەوە هاتنە بەرماڵەكەیان كە دەرگایەكی ڕەش بوو، گوێم لە دەنگی گریان وهاوار لاواندنەوە بوو لە دەرگام دا و پیرێژنێك دەرگای كردەوە گوتی: ئەی كابرا چیت دەوێت؟ گوتم: دایكی ئەو مردووە لاوەم دەوێت، گوتی: چیت دەوێت لێی ئەو تووشی غەم و پەژارەبووە، گوتم: بۆم بانگ بكە و بۆم بنێرە دەرەوە نامەیەكم لە كوڕەكەیەوە پێیە، بۆی چووە ژوورەوە ئاگاداری كردەوە لە ڕوداوەكە هاتە دەرەوە جلێكی ڕەشی لەبەردا بوو ڕووی ڕەش هەڵگەڕا بوو چاوی خوێنی تێداڕاوەستابوو بەهۆی فرمێسكی زۆرو لێدانی دەم و چاوی یەوە كوڵمەكانی زۆر تێك شكاو وشڵەژابوو پێی گوتم: بۆ كێیت؟ گوتم: من – صالحی– المری م دوێنی شەو ئاواو ئاوام بینی چۆن بوو بۆم گێڕایەوە كە دیتبووم وپێم گوت: كوڕەكەت وا لە ژێر عەزاب و سزایەكی زۆر داو دەڵێ: ئەی دایە گیان پەروەردەت كردم بە ناخۆشی وزەحمەت، وە لە خراپەت پاراستم، بەڵام كاتێ كە مردم فڕێتدامە ناوسزاو ئازارو ئەشكەنجە، ئەگەر وازنەهێنی لەو كارەی وای لەسەری، ئەوا خوا لەنێوان من و تۆدایە ڕۆژێك كە ئاسمانەكان لەیەك جیا دەبنەوە، كاتێك كە ئەوەی بیست لە هۆش




خۆی چوو بوورایەوە کەوتە سەر زەوی، وەکە هۆشی هاتەوە سەرخۆی دەستی کرد بە گریانێکی بەکوڵ گوتی: ئای کورە خۆشەویستەکەم ئەگەر بمزانیایە بە حاڵت کە ئەوهایە هەرگیز ئەوەم نەدەکرد، وەئێستا لەم کارەم پەشیمانم تەوبە بێت لای خودا واز لەو کارە دەهێنم دەڵێ: چووە ژوورە ودەستێ جلی تری لەبەرکرد وکیسەیەکی بۆ هێنام کە پارەی زۆری تێدابوو گوتی: ئەی – صالح– ئەمە ببە وبیکە بە خێر وبیبەخشەرەوە بۆ کورەکەم.

– صالح– دەڵێ: خوا حافیزیم لێ کردوو بەجێم هێشت وە پارەکەم بۆ کورەکەی کردە خێر، شەوی هەینی داهات وەك عادەتی خۆم هاتم بۆ ناو کۆڕستانەکە و نووستم هەم دیسان ئەهلی گۆڕستانەکەم بینی یەوە هەموویان هاتنە دەرەوە لە گۆڕەکانیان دانیشتن لەسەر عادەتی خۆیان خوانەکانی خواردنیان بۆ هات و کورە لاوەکەشم بینی ئەویش خوانێکی خواردنی بۆ هات و وەریگرت زۆر دڵی خۆش بوو، وەدەمی بە پێکەنینەوە بوو وەزۆر خۆشحال بوو کە منی بینی وهات بۆ لام و پێی گوتم: ئەی صالح خوا پاداشتت بداتەوە بۆ چاکەیەك لەگەڵ منت کرد چونکە بووە هۆی ئەوەی کە خوا ئەو سزاو ئازارەی لەسەر کەم کردمەوە و هەڵیگرت، ئەوە بەهۆی واز هێنانی دایکم بوو لەو کارە ناڕەوایەی کە دەیکرد وەئەو خێرەی کە بۆی کردم پێم گەیشت،

–صالح– دەڵێ: لێم پرسی کە ئەو خوانانە چین؟ گوتی: ئەوانە هەمووی دیاری زیندووەکانن بۆ مردووەکانیان لە چاکە و خێرو قورئان خوێندن و دوعایەك هەموو شەوێکی هەینی بۆیان دێت هەموو یەکێك پێی دەڵێن: ئەمە خێری فلانەکەسە بۆتۆ. بگەڕێوە بۆلای دایکم سەلامی منی پێبگەیەنەو وپێی



بڵێ خوا پاداشتی باشت بداتەوە ئەو خێرەی کە بۆت کردبووم پێم گەیشتووە تۆش لەم نزیکانەدا دێیتە لام وخۆت ئامادە بکە، صالح دەڵێ: لەخەو هەستام پاش چەند ڕۆژێك هاتمە لای ماڵی دایکی کوڕەکە، دەبینم هەواڵی مردنی لەسەر دیوارەکەیان هەڵواسراوە منیش پرسیم ئەمە کێ یە؟ گوتیان دایکی کوڕە لاوەکەیە، مردووە.

منیش ئامادەی نوێژەکەی بووم لەسەری وەلە پاڵ کوڕەکەیدا ناشتم لە هەمان گۆڕستاندا وەدوعام بۆ کردن وبەجێم هێشتن.

– داواکارین لە خوای پەروەردگا کە بە ئیسلامەتیەوە بمان مرێنێت و بمان ژێنێت، وەبمان گەیەنێت بە پیاوچاکانو وەبمان پارێزێت لە دۆزەخەکەی خۆی چونکە هەر ئەو بەخشەندە و لێبوردەیە و بەزەیی بە بەندەکانی[1].

## ٣٣٨- سزای کاری خراپ

وەك گێڕاویانەتەوە کە حەزرەتی (عیسی)ی کوڕی مریم – (علیە السلام) کاتێ کەلە گەشتەکەیدابوو چاوی بە ئاگرێك کەوت کە دەسووتا بەسەر پیاوێکدا (عیسی) علیە السلام پەلاماری دەدات کە ئاویکات بە سەریدا بیکوژێنێتەوە ئاگرەکە دەبێ بە منداڵێك وەپیاوەکەش دەبێ بە ئاگر عیسی (علیە السلام) زۆر سەرسام بوو لەو ڕووداوە فەرمووی: ئەی خوایە داوات لێ

---

( ١) کتاب الکبائر – الامام الذهبي لاپەڕە (٢٠٠) چاپی پێنجەم چاپخانەی – دار السلام – قاهیرەی میسر




دەکەم کە ئەمانە زیندووبکەیتەوە تاکو پرسیاریان لیّ بکەم لەو حاڵەیان بزانم ئەمە چ ڕووداوێکە؟

خوای گەورە فەرمانی کرد هەردووکیان زیندوو بوونەوە کە پیاوێك و منداڵێك بوون – عیسی (علیه السلام) لیّ پرسین پێم بلێن بۆچی ئەوهاتان بەسەر هاتووە؟! پیاوەکە هاتە قسەکردن و وڵامی دایەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە دنیادا گیرۆدەی خۆشەویستی ئەو منداڵەببووم، ئیتر هێزی شەهوەت پاڵی پێوەنام کە کاری خراپم لەگەڵێدا کرد، کاتیّ من مردم وئەمیش مرد لەوکاتەوە ئەو دەبیّ بە ئاگر ومن دەسووتێنیّ وئینجا من دەبم بە ئاگر و ئەو دەسووتێنم هەتا ڕۆژی قیامەت ئەوە حاڵمانە[1].

## ٣٣٩-گریانی خوا پەرستان

سوفیان دەڵیّ: ڕۆژێك لە ڕۆژان ئیمامی (عمر)ی کوڕی عبدالعزیز لەناو خەڵکدا دانیشتبوو خۆی بیّ دەنگ کرد بوو – هیچ قسەی نەدەکرد خەڵکی گوتیان: ئەی میری ئیمانداران بۆچی قسەناکەیت؟

فەرمووی: بیرم لە ئەهلی بەهەشت دەکردەوە کە چۆن سەردانی یەکتر دەکەن ویەکتر دەبینن، هەروەها بیرم لە ئەهلی دۆزەخ دەکردەوە کە چۆن هاناو هاواریان بەرز دەبێتەوە ئینجا گریا.

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٦٨)






- ڕۆژێك ئیمامی (عمر)ی کوڕی خەتاب بە عوتبەی کوڕی عامری گوت: (کە لەو سەردەمەدا لە هەموو کەس دەنگی خۆشتر بوو بە قورئان خوێندنەوە) فەرمووی: وەرە سوڕەتی (برآءة)م - التوبە - بۆ بخوێنەوە ئەویش بۆی خوێندنەوە زۆر گریا فەرمووی: هەرگیز گومانم نەدەبرد کە ئەو سوڕەتەدابەزی بێ

- عبدالله ی کوڕی ئیمامی (عمر) ڕەزای خوایان لێ بێت کاتێ کە لە قورئان خوێندنەوە ئەگەیشتنە ئەو ئایەتە (الم یان للذین امنوا ان تخضع قلوبهم لذکر الله) واتە: ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە دڵیان نەرم بێ بۆ یادی خوا؟

ئینجا لەسەر ئەو ئایەتە ڕادەوەستا ئەوەندە دەگریا تاکو ڕیشی تەڕدەکرد بە فرمێسکەکانی دەیگوت: بەڵێ ئەی خوایە کاتی هاتووە.

- محمدی کوڕی واسع دەڵێ :

پیاوی وا هەبوو ماوەی بیست (٢٠) ساڵ دەگریا و خێزانیشی لەگەڵدا بووە نەیدەهێلا خێزانی پێ بزانێ [١].

---

( ١) قصص العابدين، لاپەڕە (٧٩)



## ٣٤٠- كاتێ كوڕەكەی دەمرێ پێدەكەنێ

ابو حاتەمی – الرازی – دەڵێ :

هاوڕێتی – فضیل ی كوڕی عیاض – م كرد بۆ ماوەی سی (٣٠) دانە ساڵ نەمبینی پێبكەنێ ودڵی خۆش بێ وەبەرزەردە خەنەیش، تەنها ئەو ڕۆژە نەبێ كە كوڕەكەی (علی) مرد منیش پێم گوت بۆ چی ئێستا پێدەكەنی؟

گوتی: خوای گەورە شتێكی پێ خۆش بوو منیش دڵم خۆش بوو بۆ ئەو شتەی كە خوا پێی خۆش بوو [1].

## ٣٤١- گەیشتنی حەزرەتی عیسی بە شەیتان

ابو جەلد دەڵێ: حەزرەتی عیسی (علیە السلام) گەیشتە شەیتان پێ گوت: ئەی ابلیس ! سوێندت دەدەم بەو خوایەی كە هەمیشە زیندوو و نامرێ وەخاوەن هێزو دەسەلآتی سەربەخۆیە كە لەعنەتی لێت كرد، چ شتێك لاشەت لاواز وكز دەكات، وچ شتێك پشتت دەشكێنێ؟

شەیتان گوتی: ئەی عیسی ئەو سوێندەت نەدابام بەخوا ئەوا قسەم بۆ نەدەكردیت وەوەڵآم نەدەدایتێ، بەڵآم بزانە ئەوەی كە لاشەم بێ هێزو لاواز كز دەكات ئەوا حیلەی ئەسپەكانە لە كاتی جیهاد و غەزادا لە پێناوی خوادا

---

( ١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٨١)




وەئەوەی پشتم دەشکێنێ ئەوا نوێژی فەرزی مرۆڤی باوەڕدارە لە مزگەوت وەنوێژی سوننەتی یەتی لەماڵەوە[1].

## ٢٤٢- تاكو كەی غەیری خوا دەپەرستی؟

(مالـك)ی‌كوڕی دینـار دەفـەرمووی:ڕۆژێكیـان لەبـەردەم دەرگـای پەرستگایەك ڕاوەستام كـە ڕاهبێكـی تێدابوو گوێم لـێ بـوو دەیگـوت: ئـەی ئەوكەسەی كە بەندەكان پەنات پێ وەگرن بەترسەوە وە داواكاران لەلای تـۆ روغبەتی یان پەیدابوو داوات لێ دەكەم ڕزگارم بكەیت لەو قیساس و تۆڵەیە، وەداوای لێ خۆشبونت لێ دەكەم لەتاوانێك كە تام چێژەكەی نەماوە.

منیش بانگم كرد گوتم: ئەی ڕاهیب چۆن وازت هێناوە لە دنیا.

گوتی: پێش ئەوەی دنیا وازم لێ بێنێ من وازم لە ئەوهێناوە.

گوتم: باسی بەسەرهاتی خۆتم بۆ بكە گوتی: بەڕاستی من كەسێك بووم بوو بانگی خەڵكم دەكردلەسەردینی نەسراتیەت (المسیحیە) شەوێك لە خەومدا یەكێك بانگی كردم گوتی: هاوار بۆ تۆ تاكو كەی غەیری خوا دەپەرستی بێگومان عیسی بەندەیەكە لەبەندەكانی خوا، گوتم: تۆ كێت؟ گوتی من تكاكاری تاوانبارانم (شفیع المذنبین) من ئەو كەسەم كە (عیسی) موژدەی پێم داوە وحەزرەتی موسی شاهیدی بە پێغەمبەرایەتی منی داوە،

---

١الوصایا المنبریە، بەرگی (٢) لاپەڕە (٣٧)



منم کە لە تەورات باسکراوم وەلە ئینجیل ناسراوم، ئینجا دەستی بەسەر سینگم داهێناو گوتی: ئەی خوایە هیدایەتو ڕینموماییی بخەرە دڵی، وەیارمەتی بدە بۆ ئەوەی بەردەوام بیت لەسەر ئەو هیدایەتە، ئینجا بەخەبەر هاتم لەوخەوە هیچ شتێ وەکو ئیسلام لەلام خۆشەویست نەبوو بۆیە دەست بە جێ موسلمان بوم وەلەپەرستگای خۆم نیشتەجێ بووم [1].

## ٣٤٣- هەریەکەو بە گوێرەی توانای خۆی

ڕۆژێك لە ڕۆژانی پایزدا، جووتیارێك چۆلەکەیەکی بینی کە لەسەر پشتی کەوتبوو لەناوەڕاستی کێلگەکەی، کابرای جووتیار کێڵان وجووتەکەی ڕاگرت وسەیری ئەو مەخلووقە زەعیفەی کرد ولێ پرسی

بۆ چی ئەو ها لەسەر پشت پاڵت داوەتەوە؟

چۆلەکە وەڵامی دایەوە گوتی: بیستوومە کە ئەمرۆ کە ئاسمان دەکەوێت خوارەوە

جووتیار پێکەنی وگوتی: تۆ وا گومان دەبەیت کە هەردووك قاچە بچوکەکانت ئاسمان ڕادەگرێ وناهێڵێ بکەوێتەوە خوارەوە؟

چۆلەکە وەڵامی جووتیاری دایەوە گوتی :

---

١نزهە المجالس لاپەڕە (٣٠) المکتبە العصریە – بیروت

لەسەر هەموومان پێویستە بە گوێرەی توانامان هەوڵ بدەین من تەنها ئەوەندەم پێ دەکرێت، تۆش توانات لە من زیاتر بێ زیاتر هەوڵ بدە[1].

## ٣٤٤- ئەوەبوو کە بۆم کرا پێشکەشت بکەم

ڕۆژێك پیاوێکی پیر و بەساڵاچوو ویستی کێڵگەی ناوماڵی خۆی نوێ بکاتەوە و بکێڵێت لەیەکێك لە گوندەکانی فەڵەستین، بۆئەوەی پەتاتەی لێ بچێنێت، بۆیە کوڕە تاقانەکەی خۆی هاتەوە بیر کە چەندین مانگە دەستگیر کراوە لەلایەن هێزە چەکدارەکانی ئیسرائیل، چونکە ئەو بەڕاستی یاریدەدەری تەواوی بوو لەو جۆرەکارانە بەڵام ئێستا بەتەنیا دەژیت وهیچ کاری بۆ ناکرێ، هەر ئەوەندە بە خەیاڵی دا دێت کە نامەیەك بنووسێ بۆ کوڕەکەی، کە نامەکە باس غەریبی و بێ تاقەتی باوکی دەکات، وەپێویستی بە ئەو بوو بۆ کێڵانی ئەو پارچە زەوی یەی پێشماڵیان، کوڕەکە نامەکەی پێ گەیشت، دوای چەند ڕۆژێك باوکەکەش نامەی کوڕی پێگەیشت کەتێیدا نوسرابوو باوکە نەکەی باخچەی ناوماڵ هەڵبکەنی و بیکێڵی چونکە چەکەکەم لە ناو ئەو پارچە زەوی یەداناشتووە.

دوای دوو ڕۆژ هێزە چەکدارەکانی ئیسرائیل هاتن بۆ ماڵی پیاوە پیرەکە بەرەو باخچەکە ڕۆیشتن – لە ڕیگای نامەکەوە زانیویانەکە چەکی تێدا

---

(١) قصص اعجبتني، لاپەڕە (٨)

نێژراوە دەستیان کرد بە هەڵکەندن و کێڵانی هەموو باخچەکە بە جوانی بەپۆختی هەر دەتگوت کرێکاری تایبەتین بۆ مامە پیرە هاتوون دەگەڕان بەدوای چەك بەلاّم هیچیان نەدۆزیەوە ناچار گەڕانەوە دوای ئەوەی کە باخجەکەیان بۆی بەجوانی کێلاّ بێ ئەوەی هەست بکەن کە مامە پیرە دەیەوێت ئەو باخچەیە بکێڵێ دوای چەند ڕۆژێك باوکەکە نامەی دووەمی پێگەیشت لە کوڕەکەی کە تێدا نووسرابوو: باوکی خۆشەویستم ئێستا دەتوانی پەتاتە بچینی لەو زەویەدا وەبۆت ئامادە کراوە، ئەوەبوو کە بۆم کرا پێشکەشت بکەم لە یارمەتی دان لەوکارە دا ئومێدم وایە لێم ڕازی بیت و دوعای خۆشی وشادیم بۆ بکەیت [1].

## ٣٤٥- دۆڵێك لە دۆڵەکانی دۆزەخ

ئیمامی غزالی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێ :

ڕۆژێك وەلیدی کوڕی عبدالملك – کە یەکێك بوو لە خەلیفەکانی ئەمەوی – بە دەرگاوانەکەی گوت: لەبەردەم دەرگا ڕاوەستە هەر پیاوێك بەویێ دا تێپەڕی یەکسەر دەستی بگرە و بیهێنە بۆ لای من بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵ بکەم، کابریای دەرگەوان لە دەرگا ڕاوەستا کەمێك چاوەڕوان بوو لە ناکاو (عطاء ی کوڕی ابو رباح) زانای گەورە و پایەبەرز بەوێدا تێپەری یەکسەر – بەبێ ئەوەی بیناسێ دەستی گرت وپێی گووت: یا شێخ برۆ بۆ لای امیر

(١) قصص اعجبتنی، لاپەڕە (٩).




المؤمنين چونكه ئەو فەرمانی كردووه بچێته لای خەلیفه بوو، كاتێ (عطاء) نزیك كەوتەوە گوتی :

السلام علیك یا ولید: نەیگووت: ئەی امیر المؤمنین خەلیفەی بەم وەزعە لە دەرگاوانەكەی تووڕە بوو، بۆیە بانگی كرد و پێی گوت: من پێم گوتیت پیاوێكم بۆ بانگ بكە تاكو قسەی لەگەڵ بكەم بەڵام تۆ كەسێكت بۆ هێنامە ژووریَ كە بەو ناوەش ڕازی نییە كە خوای گەورە بۆی هەڵبژاردووم واتە: وشەی امیر المؤمنین – دەرگاوان گوتی: كەسی تر نەبوو جگە لەوە، پاشان خەلیفە بە (عطاء)ی گوت: دانیشە.!

ئینجا دەستی كرد بە قسە كردن لەگەڵی (عطاء) گوتی: بەخەلیفە پێمان گەیشتووە كە دۆڵێك هەیە لە دۆزەخ ناوی (هبهب)ە خوای گەورە ئامادەی كردووە بۆ هەموو ئەو پێشەوایانەی كە زوڵم وستەم لە حوكم وبڕیاری خوا دەكەن، وەخەڵكی دەچەوسێنەوە، كاتێ خەلیفە ئەمەی بیست یەكسەر لە هۆش خۆی چوو كەوتەخوارێ گەوتە خوارێ وەكەوتە بەردەم لەلای دەرگای ژوورەكەوە لەسەر پشتی كەوتە ناوەڕاستی ژوورەكە، ئینجا ئیمامی عمر گوتی: ئەی (عطاء) (امیر المؤمنین)ت كوشت: عطاء قۆڵی ئیمامی عمری توند گرت وگوشی وەپێی گوت: ئەی عمر ئەو كارە شتێكی ڕاستە دەبێ ڕاست گۆبیت لەوە، وەڕاستی دەوێت، پاشان ڕۆیشت ئیمامی عمر دەڵێ: یەك ساڵ ئازاری شوێنی دەستی (عطاء) لە قۆڵم بەردەوام بوو [1].

---

( ١) احیاء علوم الدین – الامام الغزالي، بەرگی (٣) لاپەڕە(٤١١) دار الفیحاء






## ٣٤٦- ڕازی بوون بە قەدەری خوا

ثابت دەڵێ بە پیاوێك ئەگەر شوێنێکت ئێشی هەبوو لە لاشەت ئەوا دەستت لەسەر ئەو شوێنە دابنێ وبڵێ: بسم الله اعوذ بعزة الله من شر ما اجد واحاذر من وجعي هذا – سێ جاران ئەو ها بڵێ یان پێنج جاران ئەمەش لە (انس)ی کوڕی مالك هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ)بەو شێوە بۆی باس کردووە – رواه الترمذي.

– هەروەها ثابت دەڵێ: بینیم لە کتێبی فردوس العارفین، کەوا ئافرەتێك تووشی ددان ئێشان ببو هاواری دەکرد لەبەر ئازارەکەی بۆیە بانگی کرا هەر کەسێك ئارام نەگرێ لەسەر لێدانی ئێمە ئەوا با کۆچ بکات لە نزیکی ئێمە، هەروەها جوبرەئیل هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ئەی محمد خوای گەورە سەلاوت لێ دەکات وەپێت دەڵێت: بە ابو بکر بڵێ ئایا چاك بوویتەوە لە ئازارەکەت، پێغەمبەر سەرسام بوو لەوە پاشان فەرمووی :ئەی ابو بکر ئەوە چ نەخۆشێك تووشت بووە – من نەمزانیوە؟ فەرمووی: ددانم ئێشی هەیە لەوەتەی حەوت ساڵە، پێغەمبەر فەرمووی: بۆچی پێت نەگوتم؟ فەرمووی چۆن شکایەت لە خۆشەویستم دەکەم![1].

---

(١) نزهة المجالس / لاپەڕە (٩٤)



## ٣٤٧- پیاوە سەخی یەکە

کۆمەڵێك لە عەرەب چوون بۆ زیارەتی گۆڕی یەکێك لە پیاوە سەخی یەکانیان لەلای گۆڕەکەی بارگەیان داناو لە ڕێگای دوور هاتبوون شەویش لەوێ مانەوە یەکێك لەوانە خاوەنی گۆڕەکەی بینی لە خەودا – واتە: پیاوە سەخییەکە – بەگەشتیارەکەی گوت: ئایا وشترەکەت لەگەڵ وشتری من دەگۆڕیتەوە؟

وادیارە مردووەکە وشترێکی ناوداری لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە، ئەو پیاوەش وشترێکی قەڵەوو جوانی هەبوو، گوتی: بەڵێ، لەو خەوەدا وشترەکەی لەگەڵ گۆڕییەوە، کاتێ کۆتایی بە مامەڵەکە هات لە نێوانیان پیاوە مردووە هەستا وشترەکەی خۆی برد هەر لەوخەوەدا دەست بەجێ سەری بڕی، پیاوەکە لەو خەوەدا بەخەبەرهات دەبینی وا خوێن لە وشترەکەی دێتە خواری، بەپەلە هەستا سەری بڕی و دابەشی کردو کردیان بە چێشت وپێداویستی خۆیان جێ بەجێ کرد پاشان بارگەیان پێچایەوە و ڕۆیشتن، کەبوو بە ڕۆژی دووەم هەر لە ڕێگادا بوون لە ناکاو کاروانێك بەرەو لایان هات پیاوێك لە کاروانە گوتی: ئایا فلانی کوڕی فلان لە ناوتاندایە؟ بەناوی پیاوەکەی بانگ کرد، پیاوەکە گوتی: بەڵێ منم،

گوتی: ئایا هیچ شتێکت فرۆشتبوو بە فلانی کوڕی فلان؟

مەبەستی مردووەکە بوو

گوتی: بەڵێ وشتری خۆم بە وشتری ئەو فرۆشتبوو لە خەودا پیاوەکە

گوتی: ها ئەمە وشترەکەیەتی، پاشان گوتی: ئەو مردووە کە ئێوە چوونە سەر گۆڕەکەی ئەوە باوکی من بوو، لە خەومدا بینیم پێی گوتم: ئەگەر تۆ کوڕی منی ئەوا وشتری من دەدەیت بە فلانی کوڕی فلان وە ناوەکەشی بۆی باس کرد[1].

## ٣٤٨- هەرسێکیان مردن

ابو حذيفةي العدوي، دەڵێ: لە ڕۆژی یەرمووکدا بەدوای وئامۆزاکەم دەگەڕام وە هەندێك ئاویشم پێ بوو گوتم: ئەگەر زۆر هیلاك وماندووبێ ئەوا دەیدەمێ وەهەندێکیشی بە دەم و چاوی دا دەکەم تاکو ماندووبونی بحەسێتەوە، لەناکاو دۆزیمەوە زۆر هیلاك بوو وگوتم: ئاودەخۆێت؟ ئاماژەی کرد گوتی بەڵێ، بینیم لەو لاوە پیاوێك هاوار دەکات لە تێنووان، ئامۆزاکەم گوتی: بیدەرە بە ئەو تانەمرێ بڕۆ بۆ لای، کە چوومەلای دەبینم هیشامی کوڕی عاصە پێم گوت ئاوت بدەمێ؟ لەناکاو دەنگی یەکێکی ترم بیست دەیگوت ئاەە.... هاواری دەکرد، هیشام ئاماژەی بۆ کردم کە ئاوەکە بدەم بە کابرا نەك بەئەو، کە چوومە لای دەبینم مردووە، گەڕامەوە لای هیشام دەبینم ئەویش مردووە، ئەوجارە گەڕامەوە لای ئامۆزاکەم ئەویش بەهەمان شێوە مردبوو – ڕەحمەتی خوایان لێ بێت [2].

---

( ١) احياء علوم الدين، الامام الغوالي – بەرگی (٤) لاپەڕە (٣٥٣)

( ٢) احياء علوم الدين/الامام الغزالي، بەرگی (٤) لاپەڕە (٣٧٠)

## ٣٤٩- سەگەكان بە كۆمەڵ هاتن

دەگێڕنەوە لە هەندێك لە پیاوانی تەسەووف دەڵێن: لە شاری طرسوس بووین هەندێكمان كۆبووینەوە و دەرچووین بۆ لای باب الجهاد، سەگێك لەناو شار بە دوامان كەوت، كە گەیشتە نزیك دەرگایەكە دەبینین لاشەیەكی ئاژەڵی مردوو لەوێیە، ئێمەش هەڵمان گرت وبردمان بۆ سەرشوێنێكی بەرز ودانیشتنین، كاتێ سەگەكە سەیری ئاژەڵە مردووەكەی كرد یەكسەر گەڕایەوە ناو شار، دوای یەك كاتژمێر هاتەوە لامان نزیكەی بیست دانە سەگی لەگەڵدا بوون، بردی بۆ سەر مردووەكە بە خۆیشی لەلایەك دانیشت لەبەرامبەریان، ئەوانیش كەوتنە سەر خواردنی گۆشتی ئاژەڵە مردوەكە هەر دەیانخوارد وئەویش سەیری دەكردن تاكو هەموو گۆشتیان ڕنیەوە لە لاشەكە تەنها ئێسك مایەوە، ئینجا سەگەكان بەزگێ تێرەوە گەڕانەوە ناو شار، سەگەكەی تریش هاتە سەر پاشماوەكەیان ئەوەی بە ئێسكەكانەوە مابێ خواردی كە كەمێك بوو ئینجا ئەویش ڕۆیشت [1].

---

( ١) احیاو علوم الدین، الامام الغزالی، بەرگی (٤) لاپەڕە (٣٧١)




## ٣٥٠- دایك لەناو گۆڕیش شیرت پێ دەدا

منداڵێکی تەمەن هەشت مانگ و کچێکی تەمەن پێنج ساڵ دوای ئەوەی باوکیان دەمرێ دوای ماوەیەکی زۆر کەم دایکیشیان دەمرێ، مامیان دەیانباتە لای خۆی بۆ پەروەردە کردن‌و سەر پەرشتیان، چونکە کەسی تریان نەبوو، بەڵام دوای ماوەیەك خێزانەکەی بەهەر هۆیەك بێ نەیتوانی بەرگەی ئەم ئەرکە قورسە بگرێ وپەروەردەیان بکات داوای لە هاوسەرەکەی کرد یان تەڵاقی بدات یان ئەو منداڵانە دوور خاتەوە، ئەویش بە هاوکاری شەیتان و پیلانێکی دڕندانە هەستا بە دوورخستنەوەی منداڵەکان وزۆر بێ ویژدانانە بردنی بۆ گۆڕستان ولای گۆڕی دایك و باوکیان گۆڕێکی هەڵکەند و هەردووکیانی بەزیندوویی لەو گۆڕەنا ولای مردووەکان جێ هێشتن، بەڵام ویستی خوا وابوو کە لە بیری چوو کونێکی بچوك دابخات وئاگای لێ نەبوو، کە بووە هۆی هەناسەو ژیانیان بەم شێوەیە مانەوە تاکو چوار ڕۆژ بەبێ ئەوەی کەس بزانێ، دوای ئەوە مردووەکیان هێنا ودوای شاردنەوەی خەڵکەکە گوێیان لە قسەو یاری منداڵان بووە، بە دوای دەنگەکە گەڕان و لە گۆڕەکە نزیك کەوتنەوە هەڵیان دایەوە، چی ببینن؟ شتێکی چاوەڕوان نەکراو...

دوو منداڵی بێ تاوان.

بەپەلە دەریان هێنان وبردنیان بۆ شوێنی سەر پەرشتی کردن و بە خێو کردن، لە دوایدا مامە تاوانبارەکە دەستگیر کرا لە سەر تاوانەکەی بۆ چی






نەیبردن بۆ دایەنە و پەناگە؟ هیچ وەلاَمێکی نەدایەوە.

دواتر لە کچە پێنج ساڵەکەیان پرسی چۆن ئەو چوار ڕۆژە بەبێ خواردن و خواردنەوە ژیان؟ وەچیتان کرد؟ شتێکی سەیری گوت: وەك دەزووی کارەبا وابوو هەموو گیانم لەرزی وتاسام بە جارێ، گوتی: درەختێکی لێ بوو هەموو جۆرە میوەیەکی پێوەبوو، هەرکاتێ برسیم دەبوو لێم دەکردەوە دەمخوارد زۆر خۆش بوو، بەلاَم کاتی براکەم برسی دەبوو دەگریا، خێرا پیاوێکی سەرو ڕیش سپی لە باوەشی دەکرد و دەیبرد بۆ لای دایکم تا تێر شیری دەخوارد ودەخەوت ئەوەیە دەسەلاَتی خوای پەروەردگار سەربازانی خۆی نارد بۆ رزگار کردنی ڕۆحی ئەم دوو منداڵە بێ تاوانانە کە نازانن شەڕو خراپە چی یە...[1].

## ٣٥١- پێغەمبەر ( یحیی ) علیه السلام – لەگەڵ شەیتان دەدوێت

وەهیب ی کوڕی – الورد – دەڵێ :

پێمان گەیشتووە کە ڕۆژێك شەیتان خۆی نیشان بە پێغەمبەر (یحی)دا وەپێی گوت: دەمەوێت ئامۆژگاریت بکەم، یحی فەرمووی: من پێویستیم بە ئامۆژگاری تۆ نییە بەلاَم هەواڵی ئادەمیزادم بدەرێ بزانم چۆنن وەچەند چینن لەلای تۆ وە تۆ چۆنێت لەگەڵیان؟

---

(١) گۆڤاری چرای ڕووناکی، ژمارە (٢٧) لاپەڕە (٤٩).






شەیتان گوتی: ئادەمیزاد سێ جۆرن

یەکیان: زۆر بەهێزن لەسەرمان دەچینە لای تاکو تووشی خراپە و فیتنەی دەکەین یەکسەر پەلاماری تۆبەو إستغفار دەدات وپەشیمان دەبێتەوە وهەموو شتێکمان لێ تێك دەدا وماندوو بونمان بەزایە دەچێ.

پاشان دووبارە بۆی دەچین و تووشی خراپەی دەکەن، ئەویش دووبارە تۆبە دەکات وپەشیمان دەبێتەوە، ئێمە هیچ کات لێ بێ ئومێدنابین هەر خەریکی دەبین، بەلاّم هیچ کاتێکیش پێی ناگەین وئەوەی مەبەستمانە کە بکەین لە گەلّی دا، ئەوها لە ئازاردەین لەگەلّی.

– دووەمیان: کەسانێکن لە دەستی خۆماندان یاری یان پێ دەکەین وەك چۆن مندالّ یاری تۆپ دەکات هەلّگێرو وەرگێری پێ دەکەین چۆن بمانەوێت ئەوان لە دەستی ئێمەن وجلّەویان بەدەستی ئێمەیە.

– سێ یەمیان: ئەوانەی وەك تۆن – ئەی یحی – بێ تاوانن وپارێزراون لە هەموو خراپە و گوناهێك دەسەلاّتمان نییە بەسەریان لە سەر هیچ شتێ[1].

---

(١) احياء علوم الدين، الامام الغزالي، بەرگی (٣) لاپەڕە (٥٧٨)






## ٣٥٢- وەسوەسە لە شەیتانەوەیە

دەگێڕنەوە کەوا جارێك پیاوێك هاتە لای – ابن عقیل – گوتی: من دەستم یان هەر ئەندامێکم کە دەشۆرم دەڵێم نەمشۆردووە دووبارە دەیشۆرمەوە، بۆ نوێژکردنم دەڵێم – الله اکبر– دواتر بەخەیاڵمدا دێت کە نەمگوتوە – الله اکبر– ئەمە باس لە حاڵی خۆی دەکات تاکو بۆی چارەسەر بکات، بەڵام – ابن عقیل پێی دەڵێ: واز لە نوێژ بێنە چونکە تۆ نوێژت لەسەر نییە خەڵکی بە ابن عقیل دەڵێن چۆن قسەی وادەکەیت؟

وەچۆن نوێژی لەسەرنییە؟

ابن عقیل پێی گوتن: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (رفع القلم عن المجنون حتی یفیق)[1].

واتە: قەڵەمی تەکلیف هەڵگیراوە لەسەر شێت تاکو چاك دەبێتەوە – کەواتە: تۆ شێتی کەسێ – الله اکبر–ی کردبێ وبڵێ نەمکردووە ئەوە بەڕاستی عاقل نییە وەشێتیش نوێژی لەسەر نییە [2].

---

( ١) رواه الامام احمد وابو داود

( ٢) تلبیس ابلیس – الامام ابن الجوزي/لاپەڕە (١٣٤) المکتبة العصریة بیروت ١٤٢٩ك– ٢٠٠٨ ز






## ٣٥٣- سۆزی باوکێکی پیر کە بە مردنی منداڵەکەی گیان لەدەست دەدات

لە بیاباندا دەڕۆیشتم وڕێگەم لێ وون بوو، لەلای ڕەشماڵێکی کۆن وەستام سەیری ناو ڕەشماڵەکەم کرد پیاوێك لەسەر زەوی بە بە ئارامی دانیشتبوو هەردوو دەستی بڕابووە وەچاوەکانیشی لەدەست دابوون، هیچ کەسێکی نزیکیشی لەلانەبوو، لەبەر خۆیەوە بە چەند وشەیەك ورتە ورتی دەکرد، لێ نزیك بوومەوە و زانیم کە دەڵێت (الحمدلله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلا) واتە: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە پلەو پایەی منی بەرزکردەوە بەسەر زۆرێك لە دروست کراوەکانیدا.

سەرم سوڕما کە ئەم وشانەی دەگوت: سەیری حاڵم کرد زۆربەی هەستەکانی لەدەست دابوو، هەردوو دەستی بڕاونەتەوە، هەردووچاوی نابینایە، خاوەن هیچ شتێك نییە، سەیری دەوروبەریم دەکرد گەڕام تا کوڕێك بینیم کە خزمەتی بکات یان خێزانێك کە لەگەڵیدا بژیت، کەسم نەبینی بەرەولای ڕۆشتم وهەنگاوم نا، هەستی پێ کردم وپرسیاری کرد کێ یە؟ گوتم: السلام عليكم، من پیاوێکم ڕێگەم ون کردووە لەڕەشماڵەکەی تۆدا راوەستاوم ئەی تۆ کێ ی؟ بۆچی بەتەنها لێرە نیشتەجێ؟ کەس و کارت ئەی منداڵەکانت لە کوێن وکەس و کارە نزیکەکانت؟

گوتی: من پیاوێکی نەخۆشم خەڵکی وازیان لێهێناوم و زۆربەی کەس و کارەکانیشم مردوون گوتم: گوێم لێت بوو دەتگوت: (الحمدلله الذي فضلني



على كثير ممن خلق تفضيلا) بۆ خاتری خوا کام نیعمەت؟ تۆ نابینای... دەستت نییە.. بەتەنهای گوتی: داواکارییەکم هەیە ئایا بۆم جێ بەجێ دەکەیت؟

گوتم وەڵامم بدەرەوە بۆم باس بکە بۆت جێ بەجێ دەکەم، گوتی: دەمبینی خوای گەورە بە چەندین تاقی کردنەوە تاقی کردوومەوتەوە و تووشی چەندین بەڵاو ناڕەحەتی کردووم بەڵام (الحمدلله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلا)، گوتی: ئایا خوابیستنی پێ نەبەخشیوم؟ گوێم لە دەنگی بانگ دەبێ وقسەتێدەگەم ودەزانم چ لە دەورووبەرم ڕوو دەدات، گوتم: بەڵێ، ئینجا دەستی کرد بە ژماردنی ئەو نیعمەتانەی کە ئەو هەیەتی وخەڵکی لیێ بێ بەشن هەرکەباسی یەکێکی دەکرد دەیگوت (الحمدلله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلا) سەرم سوڕما لەباوەڕی بەهێزی ئەم پیاوە زۆر ڕەزامەندبوو بە بەشی خودا چەندان نەخۆش هەن کە بە چواریەکی ئەو نەخۆش نین وەك ئەو کەسانەی کە تووشی شەلەل بوون، یان کەڕولال بوون، یان هەر ئەندامێکی جەستەیان لە دەستداوە ئەگەر بێت وەك ئەم پیاوە پیرە بەراوردیان لەگەڵ بکەین ئەوا وەکو لەش ساغ وان لەگەڵ ئەوەشدا بێ تاقەت و غەمبارت، زۆر سکاڵای حاڵی خۆیان دەکەن، نائارامن، دەگرین.. لە پاداشتی تاقی کردنەوەکەیاندا دڵنیانین، بەراستی ئەگەر ناڕەحەتیەکانی ئەو پیاوە پیرە دابەش بکرایە بەسەر نەتەوەکەی بەشی دەکرن. هەر بیرم دەکردەوە تاکو گوتی: ها... داواکاریەکەمت لەبیرە: گوتم: بەڵێ ئایا بۆم جێ بەجێ دەکەیت؟ گوتم: بەڵێ، داواکاریەکەت چییە؟ کەمێك سەری داخست و دواتر سەری بەرزکردەوە گوتی: کەسم لەگەڵ نییە تەنها

کوڕێکی تەمەن چواردە ساڵان نەبێت، هەر ئەوە کەنان و ئاوم پێ دەدات، دەست نوێژم پێ هەڵدەگرێت بە کارەکانم هەڵدەستێت لە بەیانیەوە ڕۆیشتووە بۆ ئەوەی خواردنم بۆ پەیدا بکات تاوەکو ئێستا نەگەڕاوەتەوە، نازانم ماوە یان مردووە، پیاوێکی پیرو نابینام ناتوانم بە دوای دا بەگەڕێم هەواڵم بۆ بپرسەو ئاگادارم بکە، منیش هاتمە دەرەوە نەمدەزانی بۆ چ لایەك بچەم وکوێ ی بۆ بگەڕێم، دەمویست کەسێك ببینم پرسیاری لێ بکەم ئاوڕم دایەوە نزیك ڕەشماڵەکە گردۆڵکەیەکم بینی کۆمەڵە قەڵە ڕەشێکی بەسەرەوە بوو، وەك ئەوەی لەسەرشتێك کوببنەوە، لەدڵی خۆمدا گوتم ئەو باڵندانە لەسەر لاشەیەك یان خواردنێك نەبێت کۆنابنەوە، بەسەرگردۆڵکەکەوە سەرکەوتم وبەرەولای باڵندەکان ڕۆیشتم، باڵندەکان هەڵفرین وکاتێك سەیرم کرد کوڕێکی منداڵکاری لێ بوو مردبوو لاشەی پارچە پارچە ببو وەك ئەوەی گورك وای لێ کردبێت وپاشان بۆ باڵندەکانی جێهێشتبێت ئەوەندەی بۆ پیاوە پیرەکە غەمباربووم بۆ مردنی کوڕەکەی غەمبار نەبووم، لە گردۆڵکەکە دابەزیم وهەنگاوم نا لە نێوان دڵ تەنگی وسەرسوڕمانیدا بووم ئایا برۆم وپیاوەپیرەکە بەجێ بهێڵم بەتەنیا بمێنێتەوە یان بگەڕێمەوە هەواڵەکەی پێ ڕابگەیەنم؟بەروە ڕەشماڵی پیاوەکە چووم گوێم لێ بوو یادی خوای دەکرد ودەیگوت (الحمدلله) (سبحان الله) ئالەم کاتە دا پێغەمبەر (ایوب)م هاتەوە یاد چوومە ژوورەوە بۆلای چۆن بەجێم هێشتبوو وهەر وابوو سەلامم لێ کرد، ئەو هەژارە زۆربە تاسەوە بوو بۆ هەواڵی جگەرگۆشەکەی گوتی: کوا کوڕەکەم؟ گوتم: سەرەتا وەلامم بدەرەوە تۆ لای خوا خۆشەویستری یان پێغەمبەر (ایوب)؟ گوتی: (ایوب) گوتم دەی بە دڵنیاییەوە تاقیکردنەوەکەی تۆ






گەورەترە بەلاَم کوڕەکەتم لە پاڵ چیایەکدا بە مردوویی بینی گورك لاشەی خواردبوو ئەویش بە ئاهو حەسرەتەوە هاواری دەکرد ودەیگوت: لا اله الا الله.. منیش هەر ئارامم دەکردەوە پاشان هاوارەکانی زیادی کردوو لەبەردەستمدا گیانی سپارد و مرد منیش بەڕاخەرەکەی ژێریم دامپۆشی چووم بۆ ئەوەی کەشتێك بدۆزمەوە تا یارمەتیم بدات وکارێکی بکەین وبنێژین سێ پیاوم بینی بانگم کردن وپێم گوتن ئایا دەتانەوێ پاداشتان دەست کەوێ؟ لێرەدا پیاوێکی موسلمان مردووە کەسیشی لێ نییە دەتوانن هاوکاری یەکتر بکەن بۆ شۆردن وبە خاك سپاردن؟ گوتیان: بەڵێ.. چونە ڕەشماڵەکە بۆ ئەوەی لاشەکە هەڵگرن کاتێك ڕوخساریان بینی هاواریان کرد – ابو قیلابە... ابو قیلابە... ! کەسێك بوو لە زانا بەناوبانگەکانیان ئێمەش بە ئەرکی سەرشانمان هەستاین و ناشمان لەگەڵیان ڕۆیشتمەوە بۆ ناو شار کە شەو خەوتم، ابو قیلابەم بینی شێوەیەکی جوانی هەبوو جل و بەرگێکی جوانی لەبەر بوو لە شوێنێکی سەوزایی دادەڕۆیشت گوتم: ئەی ابو قیلابە چی وای لێکردیت کە بەو شێوەیە بتبینم؟!

گوتی: خوای پەروەردگار بەهەشتی پێ بەخشیم ولە بەهەشتدا پێیان گوتم: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ٢٤ ﴾الرعد: ٢٤ واتە سەلامتان لێ بێ بەهۆی ئارامگرتنتان لە ژیانی دنیادا – جا سەرەنجامێکی چاکتان بوو[1].

---

( ١) بدائع العريفي، د. محمد عبدالرحمن العريفي.



## ٣٥٤- بۆ چوونێكی هەڵە

ڕۆژێك پیاو چاكێك ڕۆیشت بۆ شوێنێك بەمەبەستی بەجێ کردنی کارێکی گرنگی خۆی، بینی کارمەندی تایبەتی ئەو کارە لەوێ نەبوو، پرسیاری کرد فلان کەس لەکوێ یە؟ گوتیان: چووە نوێژی نیوەڕۆ بکات لە مزگەوت، لە کاتێکدا نوێژی نیوەڕۆیەك سعاتی مابوو، پرسیاری کردشوێنەکەی لەکوێ یە؟

کابرای بینی وپێی گوت: بۆ کارەکەت جێ هێشتووە؟

بە تووڕەییەوە گوتی: ئەی نازانی نوێژ واجبە لەسەر هەموو تاکێکی موسڵمانان؟

پیاوەکەش گوتی: تۆش نازانی ڕاپەڕاندن وجێ بەجێ کردنی کاروباری خەڵکی بەهەمان شێوە واجبە؟

کارمەندەکە گوتی: چۆن دەزانی؟

پیاوەکە گوتی: چونکو لە نێوان تۆو ئەو دەزگایە ڕێکەوتن هەیە بەوەی کە تۆ کاربکەیت وئەوانیش کرێ بدەن بە تۆ، وەنابێ کاروباری خەڵکی ڕاوەستێنی لەبەر بەرژەوەندی خۆت، نوێژەکەت کاتی خەڵکی ناچێ هێشتا کاتی ماوە، کارمەندەکە هەستی بە هەڵەی خۆی کرد وداوای لێبوردنی لە پیاوەکە کرد، وەبەڵێنی دا کە جارێکی تر کەمتەرخەمی نەکات ودەوام جێنەهێڵێ[1]

---

(١)چیرۆکی ئادابە ئیسلامیەکان لاپەڕە (١٨٦)




## ٣٥٥- راهیبێکی بەدەست نوێژ

ئیمامی عمری کوڕی خەتاب کەسێکی نارد بۆ وولآتی شام لە ڕێگادا تێپەڕی بەلای دێری -پەرستگاه و لەدەرگای دا، ئەویش دوای یەك کاتژمێر دەرگای کردەوە پیاوە نێردراوەکە ئیمامی عمر پرسی بۆچی دەرگات زوو نەدەکردەوە؟ راهیب گوتی: خوای گەورە نیگای بۆ حەزرەتی موسی هێنا فەرمووی: ئەی موسی هەرکاتێ ترست پەیدا بوو لە کاربەدەست کە زیانت پێ بگەیەنێ، ئەوا دەست نوێژ هەلگرە و فەرمان بەوانەش بکە کە لەلای تۆن دەست نوێژ هەلگرن، چونکە هەرکەسێ دەس نوێژی هەلگرت ئەوا لە ئەمان وسەلامەتی دەبێ وەهیچ زیان وزەرەری پێ ناگات لەوەی کە لێی دەترسێ، بۆیە من دەرگام نەکردەوە تاکو هەموومان دەس نوێژمان هەلگرت

- هەروەها هاتووە لە -طبقات ابن السبكي- کە خوای گەورە فەرموویەتی: ئەی موسی دەس نوێژ هەلگرە ئەگەر شتێکت بەسەر هات و تۆش دەس نوێژت نەبوو ئەوا لۆمەو گلەیی لە هیچ کەس نەکەیت مەگەر خۆت نەبیت.

- پێغەمبەری ئازیزمان فەرمووی: ئەی (انس) ئەگەر دەتوانێت بەردەوام بەدەس نوێژ بیت ئەوا وابکە، چونکە فریشتەی گیان کێشان کاتێ گیانی بەندەیەك دەکێشی کە دەسنوێژی هەبێ ئەو دەست نوێژە بۆی دەنووسرێ



بەپلەی گەورەیی شەهیدی.

– هەروەها پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرمووێ:

هەرکەسێکی موسلمان دەس نوێژ هەڵگرێ بەدەس نوێژێکی جوان وپوخت، پاشان بۆ نوێژکردن هەستێت ئینجا بزانێ کە بۆچی هەستاوە ئەوا خوا گوناهەکانی لێ دەسڕێتەوە و پاکی دەکاتەوە وەك ئەو ڕۆژەی کە لە دایکی خۆی بووە [1].

## ٣٥٦- هەمیشە دەست نوێژی هەبووە

لەسەردەمی (عیسی) (علیه السلام) ئافرەتێکی چاك وخواپەرست هەبوو ڕۆژێکیان هەستا هەویرەکەی ئامادە کرد وخستیە ناو تەندورەکە ئینجا دەستی کرد بە نوێژکردن بۆ ئەوەی تاکو نوێژەکەی دەکات نانەکەی بۆ ببرژێت.

شەیتان هاتە لای لەسەر شێوەی ئافرەتێك وپێی گوت: هەویرەکەت سووتا خێراکە فریای کەوە، ئەویش هیچ ئاوڕی لێ نەدایەوە گوتی: تاکو نوێژەکەم تەواو نەکەم بۆی ناچم بۆیە شەیتان ویستی زیاتر لای بدات سەرقاڵی بکات، منداڵەکەی گرت وخستیە ناو تەندورەکە، بەلاَم ئافرەتەکە هەر ئاوڕی نەدایەوە لەناکاو مێردی ئافرەت هاتەوە بینی وا کورەکەی لەناو

---

( ١) رواه الحاكم وقال صحيح الاسناد

تەندورەکە یاری بە پشکۆی ئاگر دەکات کە خوا بەتەواوی سووری کردبووە ئەویش هەستا هەواڵەکەی بردە لای (عیسی) پێغەمبەر (علیه السلام) فەرمووی: بانگی ئەو ئافرەتەم بۆ بکە کاتێ ئافرەتە هاتە لای پرسیاری لێ کرد ئەی ئافرەت تۆ چ کاروکردەوەیەکی چاك ئەنجام دەدەیت کە بەو شێوە خوا بۆی کردیت؟ ئافرەتەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەرکاتێ بێ دەست نوێژ بم یەکسەر دەست نوێژ هەڵدەگرم – واتە قەت نایەڵم بێ دەست نوێژ بم وهەرکاتێ دەست نوێژیش هەڵگرم دەست بەجێ نوێژ دەکەم، وەهەرکەسێك داوای هەر پیداویستیەکم لێ بکات کە خوا پێی ڕازی بێ، ئەوا بۆی جێ بەجێ دەکەم، هەروەها سەبروئارام دەگرم لەسەر ئازار و ئەشکەنجەی خەڵك هەروەك مردووان سەبر و ئارامیان هەیە وبێ دەنگن بەرامبەر بە ئازار دانی خەڵك [1].

## ٣٥٧- ژیانی پیاو ساڵحان لە نێو گۆڕدا

وەهب ی کوڕی منبە دەڵێ: (حەزرەتی عیسی– علیه السلام– ڕاوەستابوو لە سەرگۆڕێك و هەندێك لە حەواریەکانیشی لەگەڵدابوون، بیری گۆڕو تاریکی و بێ کەسی و ناخۆشی و مەینەتی گۆڕیان دەکرد، حەزرەتی عیسی فەرمووی: بۆ چی ئێوە لە نێو تاریك ترو ناخۆشترین شوین بوون کە نێو ڕەحمی دایکتانە، ئەگەر خوا حەز بکات فراوانی بکات بۆتان، ئەوا فراوان

---

( ١) نزهة المجالس / لاپەڕە (١٣٣)




و گەورە و پڕ لە خۆشی و شادی دەبێ)، رواه الامام احمد فى الزهد وابن ابى الدنيا فى كتاب القبور والسيوگى فى شرح الصدور ١٩٥

= مغیرەی کوڕی حبیب دەڵێ :

عبدالله کوڕی غالب ی الحدان لە غەزادا شەهید کرا، کاتێ کە بە خاکیان سپارد گۆڕەکەی بۆنی میسکیان لێ دەکرد، وەیەکێك لە براکانی لە خەویدا بینی پێی گوت: چیت کرد و چیت بەسەرهات؟

گوتی: باشترین کەس، گوتی: بەرەوکوێ رۆیشتیت؟

گوتی: بەرەو بەهەشت، گوتی: بە چ چاکەو کردەوەیەکی چاك؟

گوتی: بە جوانی یەقین، بە زۆر شەوو نوێژەکان، بە تێنوێتی وبەرۆژوو بوون لە هاویندا، براکەی گوتی: ئەی ئەو بۆنە خۆشە چییە لە گۆڕەکەت دێت؟

گوتی ئەمە بۆنی خۆشی خوێندنی قورئان و ئارام گرتنمە لەسەر تێنوێتی

– مالك ی کوڕی دینار دەڵێ :

چووم بۆ سەرگۆڕی عبدالله کوڕی غالب، هەندێ لە خۆڵی سەر گۆڕەکەم هەڵگرت دەبینم وەك میسك بۆنی دەڕوات، ئینجا خەڵکی بەوە تووشی فیتنە و گوناهو تاوان بوون بەمە – واتە: زۆر سەردانی گۆڕەکەیان دەکرد و هەڵس و کەوتی نارەوایان ئەنجام دەدا – پاشان کەسانێك چوونە سەر گۆڕەکەی شوێنەواری گۆڕەیان ون کرد و لەگەڵ زەوی ڕاست یان کرد[1].

---

( ١) الوصايا المنبرية، محمد عبدالعاطي بحيري بەرگی (١) لاپەڕە (٥٩٧) هەروەها ابن الجوزی لە کتێبی (صفة الصفوة) دا باسی کردوە وابو نعیم لە (الحلیە) وەئیمامی احمد لە (الزهد)



## ٣٥٨- هۆكاری زاڵ بوونی شەیتان بەسەر ئوممەتدا

دەگێڕنەوە كە لەسەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەر دا (ﷺ) شەیتان لەشكرەكەی خۆی پەرت وبڵاوكرد، بەڵام كە هاتنەوە لای بۆئەوەی چالاكیەكانیان نیشان بە شەیتان بدەن زۆر داماوو بە پەژارە بوون تووشی حەسرەتێكی یەكجار گەورە ببون، شەیتان گوتی: ها ئەوە چیتانە بۆئەوها پەشۆكاو بوون؟ لەشكرەكە گوتیان: هیچ كەسمان وەكوو ئەوانە نەبینوە بەڕاستی هیچ بەشی ئێمەی تێدانی یە كە بەسەریان زاڵ ببین، وە زۆریش ماندوویان كردین، شەیتان گوتی: ڕاستە ئێوە توانا ی ئەوانتان نییە، ئەوان هاوڕێتی پێغەمبەرەكەیان كردووە وئیمانیان بە كتێبەكەی هێناوە كە بۆی هاتوتە خوارێ بەڵام قەومێك لە پاش ئەوانە دێن، ئێوە دەتوانن بەسەریان زاڵ ببن و لە خشتەیان بەرن، كاتێ سەردەمی تابیعین هات، دووبارە لەشكری بۆ ناردنە مەیدان وەلەسەر زەوی پەرت و بڵاوی كردن، بەڵام هەر بە داماوی وسەر شۆڕی گەڕانەوە كەسمان وەكو ئەوانە نەبینوە، بەڕاستی كە گوناهێك دەكەن یەكسەر داوای لێخۆشبوون لە خوا دەكەن، وەخراپەكانیان بۆ دەبێتە چاكە، شەیتان گوتی: ئێوە دەسەڵاتی ئەوانیشتان نییە چونكە یەكتا پەرستی (التوحید) لە ناودڵیان بە پاكی و پوختی ڕوچووە، وەبەڕاستی شوێن پێغەمبەریان كەوتوون، بەڵام قەومێك لە دوای ئەوان دێن چاوتان پێیان پڕ دەبێ وئارام دەگرن چاك یاریان پێ دەكەن وبەسەریان زاڵ دەبن ئینجا قەومێك هات دوای قەومی یەكەم و دووەم و سێ یەم لەشكرەكە

هەواوهەوە سی لە نێو پەرت وبلاوکردن، وبیدعە و خورافیات وشتە ناڕەواکانیان لەنێودا جوان و ڕازاوە کردن ئەوانیش بەڕەوایان زانی و تووشی بوون بەجارێ دوژمنیان بەسەر زاڵ بوو وەبەجارێ ئەو دوژمنە ئازاری دان[1].

## ٣٥٩- دوعاکردن بۆ مردووان

عثمان کوڕی سودەی – الطفاوي – دایکێکی هەبوو، لە خواپەرستان بوو خەڵکی پێیان دەگوت: (ڕاهیبە) دەڵێ: لەوکاتە هاتە سەرەمەرگ و نزیکی مردن بوو، سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان گوتی: ئەی ئەو خوایەی لە ماوەی ژیان ومردنمدا جێگای پشت پێ بەستنی منی ئەی ئەوەی کە نوێشیووی منی، ئەی خوایە لە کاتی مردندا خەجاڵەتم نەکەیت وەبەتەنیا لە نێو گۆڕدا بەجێم نەهێڵی.

کاتێ کەمرد هەموو ڕۆژێکی جوومعە دەچوومە سەرگۆڕەکەی دوعام بۆ دەکرد وداوای لێخۆشبوونم بۆ ئەو و هەموو مردووەکان دەکرد، ڕۆژێکیان لەخەومدا گوتی: ڕۆڵەکەم مردن بە ڕاستی ئازارێکی زۆری هەیە، بەڵام من سوپاس بۆ خوا ئێستا لە ژیانێکی خۆش و سوپاسکراوم لەسەر فەرشی ڕەیحان و پاڵدانەوەم لەسەر سندس واستبرەقە تاکو ڕۆژی قیامەت منیش گوتم، دایکە هیچ پێویستێکت نییە؟

---

( ١) الوصايا المنبريه، محمد العاطي بحيري – بەرگی (١) لاپەڕە (٥٦٤)

گوتی: بەڵێ

گوتم: پێویستیەکەت چییە؟

گوتی: ئەوها ناوە ناوە وەرە سەرگۆڕەکەم دوعام بۆ بکە چونکە موژدەم دەدەنێ بەهاتن لە ڕۆژانی جومعە دا، پێم دەڵێن، ئەی ڕاهیبە ئەوا کوڕەکەت هات، ئینجا ئەوانیش دڵیان خۆش دەبێ – واتە: مردووەکانی دەوروبەرم [1].

## ٣٦٠- موژدە بێ کە تۆ هاوڕێی منی لەبەهەشتدا

ابن الجوزی دەگێڕێتەوە لە کتێبی (المنتظم في تاريخ الامم) کەوا حەزرەتی موسی (علیه السلام) داوای لە خوا کرد کە هاوڕێکەی پێ نیشان بدات لەبەهەشتدا خوای گەورە فەرمووی: بڕۆ بۆ فلاَن شارە پیاوێکی قەساب دەبینی ئەو هاوڕێی تۆیە لەبەهەشتدا موسی گەڕا بە دوای، کە بینی وا لە دوکانەکەی خۆیەتی وە زەمبیلێکیشی لەلای خۆی دانابوو، گوتی: بە حەزرەتی موسی ئەی ڕۆخسار جوان ئەمڕۆ کە دەبیتە میوانم؟ موسی فەرمووی: بەڵێ لە گەڵی چوو تاکو ماڵی پیاوە قەسابەکە، خواردنەکەی لەلای خۆی دانابوو هەر کە پارووەنانێکی ئەخوارد دووپارووی دەخستنە ناو زەمبیلەکەوە، لەناکاو لە دەرگا درا گەنجەکە ڕایکرد دەرگا بکاتەوە و وازی هێنا لە زەمبیلەکەوە حەزرەتی موسی سەیری کرد دەبینی پیاوێکی پیرو پیرەژنێکی زۆر بە ساڵا چوو کە زۆر تەمەنیان کردبوو وەکو منداڵ بچوك

---

(١) قصص الصالحين، د. مصطفى مراد، لاپەڕە (٢٤٦)




ببونەوە، کاتێ سەیری حەزرەتی موسی یان کرد بە زەردەخەنەوە وەشایەدی پەیامی پێغەمبەریان پێ هێنا پاشان هەردووکیان مردن، کاتێ کە گەنجەکە هاتە ژوورێ وسەیرێکی زەمبیلەکەی کرد، یەکسەر حەزرەتی موسی چوو دەستی ماچ کرد، گوتی: تۆی موسی پێغەمبەری خوا، موسی فەرمووی: کێ پێی گوتی؟

گوتی: ئەو دوانەی لە نێو زەمبیلەکە بوون دایك و باوکم بوون کە پیرببون منیش لە نێو ئەم زەمبیلەم هەڵگرتبوون، وەهیچ کات خواردن و خواردنەوەم لە پێش ئەوان نەبوو تاکو ئەوان نەیانخواردبا وەهەموو ڕۆژێك دوعایان دەکرد دەیانگوت؟ خوایە نەمرین تاکو حەزرەتی موسی دەبینین، کاتێ تۆیان بینی هەردووکیان مردن بۆیە زانیم کە تۆی (موسی) پێغەمبەریت، حەزرەتی موسی پێ گووت: دەکەواتە موژدەبێ کە تۆ هاوڕێی منی لە بەهەشتدا [١].

## ٣٦١- پارێزگاری خوا بۆ زید

ئافرەتێك هەبوو کوڕێکی هەبوو ناوی زید بوو، ڕۆیشت بۆ بازرگانی ڕێگایەکەشی دەبوایە لە دەریادا پەریبایەوە هەرکە لە دایکی ون بوو دەستی کرد بە ڕۆیشتن دایکی هەستا درهەمێکی خۆی کرد بە خێر، بۆئەوەی بە ساغ و سەلامەتی بگەڕێتەوە.

---

(١) نزهە المجالس، لاپەڕە (٢٣٨)




لەو ڕۆژەدا کە گەشتەکەی دەست پێ کرد شەپۆلی باهەلکردن دای لە دەریا کە وادانیشتووانی کەشتیەکە نزیك بوون هەموویان لە دەریادا بخنکێن لەناکاو دەنگێك هات وگوتی: مەترسن ئەو شتەی کرا بە قوربانی وەرگیرا، هەروەها بە هانای (زید)یش هاتین [1].

## ٣٦٢- بەبەرکەتی ئەو خێروچاکەیە بەلای مارەکەی لەسەر لاچوو

ئیمامی الیافعی لە کتێبی (الترغیب والترهیب) دا دەلێ: لەسەردەمی پێغەمبەر (صالح) علیە السلام پیاوێك هەبوو جل وبەرگی خەلکی دەبڕی وپاکی دەکردەوە، بەلام ئەو هەر زیان و زەرەری لە خەلك دەدا و جل و بەرگی لێ خراپ دەکردن، قەومەکەش هاتنە لای پێغەمبەر (صالح) گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا دوعا لەو پیاوەبکە، چونکە جل و بەرگی خەلك خراپ دەکات، کابرا لە مالێ دەرچوو بەخۆی وئامێری کارکردن (صالح) یش دوعای لێ کرد کەوا بەسەلامەتی بگەڕێتەوە، کە بووبە ئێوارە کابرا بە ساغی و سەلامەتی گەڕایەوە بە پۆشاك و عەباکەی خۆی، حەزرەتی (صالح) پێی گوت: ئامێری کارکردنت بکەرەوە ئەویش کردیەوە، تەماشای کرد مارێکی گەورە لە نێو جل و بەرگەکانی دا بە ئاسن بەستراوەتەوە پێغەمبەر صالح

(١) هەمان سەرچاوە، بەرگی (٢) لاپەڕە (٣١١)






پێی گوت: چیت کرد کاتێ کە لە ماڵ دەرچوویت؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا دور کولێرەم لە ماڵ بردن لە ڕێگادا یەکێکم بەخشی و ئەویترم خوارد، فەرمووی: ڕاست دەکەیت خوا شەروبەلاَی ئەو مارەی لەسەرلابردی وەتۆشی ڕزگارکرد بە بەرەکەتی ئەو خێرو چاکەیەت کەبە کولێرەکەت کرد، بەلاَم بڕۆ بۆخۆت تۆبە بکە و واز لەو کارە بێنە چیتر زیان لە خەلکی مەدە ئینجا پیاوە تۆبەی کرد و وازی هێنا لە خراپ کردنی جل و بەرگی خەلك[1].

## ٣٦٣- شوێنەواری گوناهوتاوان

دەگێڕنەوە لە ئیمامی عمر (ڕەزای خوای لیّ بیّ) کە دەفەرمووێ: نەکەن بەفەرموودەی خوای گەورە لە خۆ بایی بن، کە دەفەرمووێت: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴾ الأنعام: ١٦٠

واتە: هەر کەسێك چاکەیەك بکات، ئەوا لە ڕۆژی دوایی دا دە ئەوەندەی چاکەکەی پاداشتی بۆ هەیە، وەهەرکەسێك خراپەیەك بکات ئەوا تۆڵەی لیّ ناسێندریّ مەگەر بەوێنەی خۆی نەبیّ

چونکە بەڕاستی ئەگەر تاوان یەکیش بێت ئەوا (دە) شتی بەدوادا دێت:

---

( ١) هەمان سەرچاوە، بەرگی (٢) لاپەڕە (٣١١)






یەکەم: هەرکاتێ مرۆڤ گوناهێکی کرد، بێگومان خوای گەورە بەمە تۆڕەدەبێ، وەهێزو تواناشی بەسەردا هەیە.

دووەم: بەهۆی ئەو گوناهوتاوانە شەیتان دڵخۆش دەبێ.

سێ یەم: لەبەهەشت دوور دەکەوێتەوە.

چوارەم: لە ئاگری دۆزەخ نزیك دەبێتەوە.

پێنجەم: بەهۆی ئەو گوناهەوە خۆشەویسترین شت لەلای خۆی ئازاردەدات کە نەفسی خۆیەتی

شەشەم: نەفسی خۆی بەگوناه پیس دەکات، کە چی پاك و خاوێن بووە

حەوتەم: ئازاری ئەو فریشتانە دەدات کە پارێزگاری لە ئادەمیزاد دەکەن

هەشتەم: پێغەمبەری خوا لە ناو گۆڕەکەی غەمبار دەکات

نۆیەم: کاتێ گوناه دەکات، ئاسمانەکان و زەوی و هەموو بوونەوەر شاهیدی بەو گوناهە لەسەر دەدەن.

دەیەم: بەو گوناهە خیانەتی لە هەموو ئادەمیزادکردووە وەفەرمانی خوای شکاندووە[1].

---

(١) بحر الدموع، ابن الجوزي (٣٠)






## ٣٦٤- سەری منداڵەکە لەدەمی گورگەکەدا بوو

راس الطفل في فم الذئب

خوای گەورە دەفەرمووی: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الْأَلْبَابِ ﴾[1] واتە: بەڕاستی لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەوان پەند و ئامۆژگاری تێدابوو بۆ ئەوانەی کە خاوەن عەقل وبیرو هۆش بوون.

– عوروەی کوڕی زبیر یەکێکە لە زانایان و خوا پەرستانی تابعین، هەروەها یەکێکە لە کوڕەکانی هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر – زبیری کوڕی عەوام – دایکیشی – اسمای کچی ابو بکری صدیقە – بە (ذات النطاقین) ناوی دەرکردبوو دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە پووری بوو، وەبرا گەورەکەشی عبدالله ی کوڕی زبیربوو کە هاوەڵی پێغەمبەربوو (ﷺ)بە پیاوێکی زانا و تێکۆشەر و ئازا ناوداربوو، لەو کاتەی سێلاوی گەورە شاری مەکەی گرتەوە ئەو یەکەم کەس بوو کە بەمەلەوانی طوافي بەدەوری کەعبەی پیرۆز کرد.

لە هەواڵی عروەی کوڕی زبیر (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەو هەڵویستە غەریب و ئەو کێوە گەورەیە لە ئارامگرتن لەسەر بڕیارو حوکمی خوا، وەڕاست گۆیی لە داواکردنی پاداشتی دوا ڕۆژ لە خوای پەروەردگار فێردەبین

ئەو بەسەر هاتە سەرسورهێنەرە لەسەر دەمی خەلیفە (ولیدی کوڕی

---

(١) سورە یوسف (١١١)






عبدالملك) ڕوویداوەلە كاتێك داوا لە عروەی كوڕی زبیر دەكات كە سەردانی بكات لە بۆ پایتەختی خەلافەت لە دیمەشق.

عروە خۆی ئامادە كرد بۆ ئەو گەشتە لە شاری مەدینە بۆ شاری دیمەشق پشتی بەخوا بەست وەیەكێك لە كوڕەكانی خۆی لەگەڵ خۆی هێنا، كە لە حەوت كوڕەكانی تری لەلاخۆشەویستر بوو، ڕوی كردە وڵاتی شام بەلام قەدەری خوا وا بو لە ڕێگادا عروە ژانێكی لە قاچی دروست بوو هەركە ڕۆیشت ئازاری زیاتر بوو، تاكو وای لێهات نەیتوانی بڕوات ناچار هەڵیانگرت تاكو چووە ناو دیمەشق.

لەو كاتەدا خەلیفە (ولید) زۆر ناڕەحەت بوو كە میوانەكەی بەو شێوە چاو پێكەوت، بۆیە باشترین و ناودارترین دكتور و حەكیمی بۆ كۆكردەوە تاكو چارەسەر بكرێت، دكتورەكان لەسەری كۆبوونەوە وبڕیاریان دا كە تووشی نەخۆشی (الغرغرينا) بووە، وەهیچ چارەیەكییش نییە بۆ ئەوە جگە بڕینەوەی قاچەكەی نەبێ، خەلیفەش بەو چارەسەركردنە سەرسام نەبوو هە بەر خۆی دەگوت: چۆن دەبێ میوانم لە مالی خۆی دەربچێ بەلەش ساغی و بەبێ نەخۆشی، ئینجا بەیەك قاچەوە بچیتەوە نێو خانەوادەكەی.

دكتورەكان بڕیاریاندا ئەگەر قاچی نەبڕیتەوە ئەوا تاكو ئەژنۆ دایدەگرێ و دواتر دەیكوژێ.

خەلیفە چووە لای عروە دەنگ وباسی دكتورەكانی پێ ڕاگەیاند، عروە تەنها ئەوەندەی گوت: اللهم لك الحمد.






دکتورەکان لەدەوری کۆبوونەوە، گوتیان: دەبێ دەرمانی خەو لێکەوتن بخۆیت، ئەویش نەیخوارد گوتی: پێم ناخۆشە ئەندامێکم لێ جیا بێتەوە و ئاگام لێ نەبێ

گوتیان: هەندێك عەرەق بخۆەوە تاکو کەمێك بێ ئاگابێت.

بە توندی ڕەتی کردەوە گوتی: چۆن شتێك دەخۆم کە چی خوا حەرامی کردبێ

گوتیان: کەواتە چیت لێ بکەین؟

گوتی: وازم لی بێنن تاکو نوێژ دەکەم، کە نوێژم دەست پێ کرد ئێوەو کارەکەتان — وادیارە عروە یەکێك بووە لەوانەی کە نوێژی دەکرد هەموو شتێکی دەوروبەری لەبیر دەکرد ودڵی دەبەستەوە بەخوا و بەس

عروە دەستی کرد بە نوێژ، وازیان لێ هێنا تاکو چوە سوجدە، قاچیان ڕووت کردەوە، دەستیان کرد بە هەڵدڕینی گۆشتەکەی تاکو گەیشتە ئێسکەکە ئینجا مشاریان هێنا ئێسکەکەشیان بڕی تاکو لەلاشەیان جیاکردەوە ئەو هەر لە سوجدەدا بوو خۆی نەدەجولاند.

خوێن زۆر هاتە خواری ناچار دکتۆرەکان زەیتی سوورکراوەیان هێنا بەسەر قاچیان دا کرد تاکو بڕینەکە وشك بێ

بەڵام بەرگەی گەرمی ڕۆنەکەی نەگرت لە هۆش خۆی چوو لەوسەین وبەینەدا هەواڵێك لەدەرەوەی کۆشکی خەلیفە هات کە گوایە کوڕە خۆشەویستەکەی عروەی کوڕی زبێر چۆتە ناو ئەسپەکانی خەلیفە، یەکێك لە



ئەسپەکان جووتەیەکی وەشاند دای لە کوڕی عروە دەست بەجێ گیانی لە دەستداو مرد.

خەلیفە زۆر بەوە دڵتەنگ بوو لەو ڕووداوە بەدوای یەکانەی دێت بەسەر میوانەکەی، سەری سوڕما کە چۆن ئەو جارە هەواڵی مردنی کوڕەکەی پێ بگەینین.

خەلیفە وازی هێنا لە عروە تاکو بە خۆی هاتەوە، ئینجا لێی نزیك کەوتەوە پێ گوت: (احسن الله عزاوك من رجلك).

خوای گەورە پرسەکەت جوانتر بکات لە قاچەکانت، واتە ئارامیت زیاتر پێ ببەخشێ، عروە گوتی: اللهم لك الحمد وانا لله وانا اليه راجعون)

خەلیفە گوتی: خوای گەورە پرسەوتەعزیەکەت جوانتر کات لە کوڕەکەت

عروە گوتی: اللهم لك الحمد وانا لله وانا اليه راجعون، خوای گەورە حەوت دانە کوڕی پێداوم یەکیانی بردەوە

هەروەها چوار ئەندامی پێداوم یەکێکیانی بردەوە.

ئەگەر تووشی نەهامەتی هاتووم بەڵام ئومێد دەکەم خواڵیم ببورێ و خۆشیم بۆ بنێرێ وەئەگەر لێم وەرگیراوەتەوە ئەوا پێم بەخشراوە، داواکارم لە خوا کە وا هەردوکمان کۆبکاتەوە لە بەهەشت

پاشان تەشتێکیان بۆ هێنا کە قاچە براوەکەی تێدا بوو ئێنجا قاچە براوەکەی گرت و گوتی: خودای گەورە دەزانێ کە بە تۆم هیچ هەنگاو نەناوە




بۆ هیچ گوناهو تاوانێك وەخۆشم دەزانم.

عروە ناوە ناوە هەڵدەستا خۆی ڕادەهێنا لەسەر ڕۆیشتن کرد بەیارمەتی ئەو عەسایەی کە لەلای بوو، ڕۆژێك چووە مەجلیسی خەلیفە بینی پیاوێکی ڕیش سپی جوان وبەسام لەوێ دانیشتووە کە نابیناش بوو خەلیفە گوتی: ئەی عروە پرسیار لەو پیاوە پیرەبکە کە ڕووداوەکەی چۆن بووە.

عروە گوتی: ڕووداوەکەت چۆن بوو؟

گوتی: ئەی عروە شەوێك لە شەوان لە دۆڵێك مامەوە لەو دۆڵەش هیچ کەس لە خۆم دەوڵەمەنتر نەبوو، وەهیچ کەس لە خۆم زیاتر منداڵ ونەوەی نەبوو، لەناکاو لافاوی ئاومان بەسەرداهات و ئەوەی ماڵ و منداڵ وخێزان بێ هەموی برد لەوشەوەدا، بووە بەیانی تەنها من و منداڵێکی بچوك و وشترێکم مابوو، وشترەکە ڕایکرد کرد، منیش بەدوای کەوتم کە بیهێنمەوە کەمێك دوورکەوتمەوە دەنگی گریانی منداڵەکەم بیست کە ئاوڕم دایەوە دەبینم سەری منداڵەکەم لە ناودەمی گورگ دایە، ڕامکرد تاکو ڕزگاری بکەم بەلآم بێ سوود بوو نەمتوانی، تاکو چوومە لای گورگەکە منداڵەکەی پارچە پارچە کرد بەکەڵبەکانی، ناچار گەڕامەوە لای وشترەکەم کە بیگرمەوە ئەویش بە لووشکەیەکی توورەیی لێدام کە بە چاوم کەوت چاوەکانم کوێر بوون.

عروە گوتی: مامە پیرە ئێستا چی دەڵێی

مامە پیرە گوتی: دەڵێم: خوایە گیان سوپاس تۆ زمانێکی پاراوە بەزیکرت بۆ بەجێ هێشتووم لەگەڵ دڵێکی ئاوەدان.






براکانم: ئەمە بە بەڕاستی سەبرو ئارامییە، دەبێ ڕازی بوون بە قەدەرو قەزا ئەوهابێ، ڕەحمەت لە عروە ونمونەی ئەو کە بەڕاستی مانای ئیمانیان انی بەقەدەرو قەزاو وەسەبرو ئارامیان لەسەر ناخۆشی وبەلآبەڕاستی هەبوو[1].

## ٣٦٥- ئیمامی جعفری صادق و کۆیلەکەی

ڕۆژێکیان ئیمامی جعفری صادق داوای کرد لە خزمەت کارەکەی کە ئاوی بۆ بێنێ بەدەستی دا بکات لەسەر تەشتێك، کاتێ خزمەتکارەکە ئاوی هێنا ویستی بەدەستی دا بکات یەکسەر ڕژایە سەر جلەکانی، ئیمامی جعفر بەتووڕیی یەوە سەیرێکی کرد، کوێلەکە گوتی: گەورەم (والکاظمین الغیظ) واتە: ئەوانەی کە توورەیی لە دڵیان دەخۆنەوە و زاڵ دەبن بەسەر نەفسیان ئیمامی جعفر گوتی: ئەوە توڕەییەکەم خواردەوە و کوێلەکە گوتی: (والعافین عن الناس) واتە: ئەوانەی لە خەڵکی دەبۆرن و عەفویان دەکەن، ئیمامی جعفر گوتی: ئەوە عەفووم کردیت، کوێلەکە گوتی: (والله یحب المحسنین) واتە: خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە چاکەکاربن ئیمامی جعفر گوتی: بڕۆبۆ خۆت ئازاد بە ئەوا لە پێناوی خوا بەڕەڵلآم کردیت، وەلە ماڵی منیش هەزار دینار بۆ خۆت بەرە[2].

---

( ١) قصص اعجبتني، لاپەڕە (١١٥).

(٢) بحر الدموع، الامام ابن الجوزي لاپەڕە(٢٠٢)






## ٣٦٦- ڕۆژی عەرەفەی پیرۆز

ابن جارود دەڵێ: من وهاوڕێکم دەرچووین بۆ مەبەستی داواکردنی زانست وزانیاری ئێوارەی عەرەفەبەسەر شوێنەواری شاری قەومی لوط تێپەڕین منیش گوتم بەهاوڕێکەم ئەو ئێوارەیە دەچینە ناو ئەو شارە شوکرانەی خودا دەکەین کە ئێمەی پاراستووە لەو بەلآیەی کە هاتۆتە سەریان، گەڕاین بە نێو شاردا لە ناکاو پیاوێکی دەم و چاو تۆزاوی وکەم موومان بینی، پێم گوت: تۆکێیت؟ ئەویش وەك بلێ ی خۆی لێمان گێلّ کرد، گوتمان لەوانەیە شەیتان بیت؟ گوتی: بەڵێ... گوتمان لە کوێ هاتوویت؟ گوتی: ئەم ڕوخسارەم لە (کێوی عرفات) والێهاتووە لەبەر قەومێك کە پەنجا ساڵە گوناح دەکەن ئینجا ڕەحمەت بەسەریاندا باری منیش خۆڵ وتۆزم کرد بە سەر سەرم بۆیە ئێستا هاتووم بۆ ئەو شوێنە سەیری گۆڕی ئەو کەسانە دەکەم کە ئازاردەدرێن تاکو کەمێك تووڕەییم دابمرکێت ودڵم ئارام بگرێت وەتۆبە و پاڕانەوەی خەڵکی عەرەفەم لەبیر بچێت [١].

---

( ١) نزهە المجالس، لاپەڕە (٢٠٨)





## ٣٦٧- ئافرەتێك ئامۆژگاری پیاوێك دەكات

ئیمامی مالك لە (الموطأ) دا دەگێڕێتەوە لە یحیی كوری سعید ئەویش لە قاسم دەڵێ :خێزانم كۆچی دوایی كرد، محمدی كوڕی كعب ی (القرظي) هاتە لام پرسەو سەرەخۆشی لێ كردم وگوتی: لە نێو بەنی ئیسرائیل دا پیاوێكی زاناو شارەزاو خواپەرست و موجتەهید هەبوو، ئەو پیاوە ئافرەتێكی هەبوو زۆر پێی سەرسام ببوو، وەزۆریشی خۆش دەویست، قەدەری خوا وا بوو ئەو ئافرەتە مرد، ئەویش زۆر بۆی ناڕەحەت بوو، وزۆریش داخی لەسەر هەڵدەگرت بە جۆرێك خۆی لە خەڵكی دوورە پەرێز گرت وبەتەنیا لە ماڵ دادەنیشت و دەرگای لەسەر خۆی دادەخست و رێگای بە هیچ كەسێ نەدەدا بێتە ژوورێ، ئافرەتێكی ژیرو ئاقڵ لەو ناوچەیە ئەو هەواڵەی زانی وهاتە لای، وەكەسێكی ناردە لای پێی گوت: بڵێ ئافرەتێك دێتە لات كارێكی هەیە پێت، تەنها هەندێ قسەت لەگەڵ دەكات ودەڕوات، گوتی: بابێتە ژوورێ، ئافرەتە هاتە لای و گوتی: بەڕاستی من بەئەمانەت پارچە زێرێكم لە ئافرەتێك وەرگرتووە وەبۆ خۆشیم بەكارمهێناوە بەئەمانەتیش پاراستوومە، سەردەمێكی زۆر لەلامە پاشان خاوەنی ناردی گوتی: دەبێ بۆم بنێریتەوە، ئایا بۆیان بنێرمەوە؟ پیاوە زاناكە گوتی: بەڵی لەسەرت واجبە بۆی ڕەت بكەیتەوە ئافرەت گوتی: ئاخر دەمێكە لەلای منە — وەك هی خۆمی لێهاتووە — گوتی: ئێ باشە هەرچەندی لەلات بێ واجبە ڕەت بكرێتەوە بۆیان چونكە موڵكی تۆنییە ئافرەتی ژیرو عاقڵ ڕوی كردە زاناكە وگوتی: ئایا تۆ بۆ شتێك غەمباریت تاسف دەكەیت كە خوا بەئەمانەت لەلای داناویت پاشان لێت






وەردەگرێتەوە، کەچی ئەو خاوەنە ئەو لاترە بەو ئەمانەتە کەلێت وەربگرێتەوە؟

پیاوەکە چاوەکانی کردەوە بەوەی کە تێدا بوو وەخوا سوودی پێ گەیاند بەهۆی قسەکانی ئەو ئافرەتە[1].

## ٣٦٨- بەهۆزو تیرەی خۆت مەنازە

پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرمووێ، لە سەردەمی حەزرەتی (موسی)دا دوو پیاو خۆیان لەسەر یەکتر هەڵکێشا بەقەوم و عەشیرەت وهۆزیان یەکێکیان گوتی: من کوڕی فلانی کوڕی فلانم تاکو نۆدانە پشتی ژمارد تۆ کوڕی کێی هەی بێ دایك؟

پیاوەکەی دووەمیان گوتی: منیش فلانی کوڕی ئایینی ئیسلامم خوای گەورە وەحی هێنا بۆ حەزرەتی موسی کە بەو دووکەسە بڵێ تۆ ئەوی ئەو کەسەی کە نازت بە نۆ باپیرەکەت کرد ئەوە بزانە کە هەر نۆیان لەناو ئاگری دۆزەخن وەتوش دەیەمیانن کە لە گەڵیان دەچیە ناو دۆزەخ [2].

---

(١) الوصايا المنبرية، محمد عبدالعاطي بحيري، بەرگی(١) لاپەڕە (٥٣٠)

( ٢) رواه النسائي والبيهقي في شعب الايمان (صحيح)






## ٣٦٩- کە ڕۆیشتم (عمر) بووم کە هاتمەوەش هەر عمر بووم

دەڵێن ڕۆژێك ئیمامی عمری کوڕی عبدالعزیز میوانێکی هاتەلای ئیمامی عمریش نووسینی دەکرد، خەریك بوو چرایەکەی دەکوژایەوە، میوانەکە گوتی: بڕۆم ئەو چرایە چاك بکەم؟ فەرمووی: لە ڕێزو ڕەوشتی پیاو نییە کە خزمەت بە میوانەکەی بکات، میوان گوتی: بڕۆم خزمەتکارەکە ئاگادار بکەمەوە؟ فەرمووی نەخێر تازە خەوتووە خەوەکەی زۆر خۆشەو با پشوویدات، بۆیە بەخۆی هەستا چراکەی پڕ کرد لە زەیت، میوان گوتی: ئەی پێشەوای ئیمانداران تۆ بەخۆت هەستایت و ئەم کارەت کرد چۆن دەبێ فەرمووی: کە ڕۆیشتم عمر بووم کە هاتمەوەش هەر عمر بووم هیچم لێ کەم نەبوەوە، چاکترین کەس ئەو کەسەیە کە لەلای خوا ملکەچ وخۆ بەکەم زان بێ[1].

## ٣٧٠- تۆیشووی سەفەر

کمیل ی کوڕی زیاد دەڵێ، ڕۆژێکیان لەگەڵ ئیمامی (علی) کوڕی طالب دەرچووین بۆ مەبەستی زیارەتی گۆڕستانی بەقیع لە مەدینەی پیرۆزدا کاتێ ئیمامی (علی) بەسەر گۆڕستان هەڵگەیشت فەرمووی: ئەی خەڵکی گۆڕستان ئەی ئەوانەی کەوا لاشەتان لەگەڵ خاك تێکەڵ بووە، ئەی شاری خامۆشان و شاری بێ دەنگان، ئەی شاری بێ کەس و کارو بێ ئولفەت، هەواڵ چییە لەلای ئێوە؟

---

(١) تنبیه الغافلین الامام السمرقندي، لاپەڕە (١٤١) مکتبە التقوی






چونکە بەڕاستی هەواڵی لای ئێمە ئەوەی :

ماڵو سامان بوو هەمووی دابەش کرا لەدوای بەسەرمیراتگرەکان ڕۆڵەکانتان هەتیوو بێ نازبوون بە مردنتان.

هاوسەرو خێزانەکانتان لە دوای ئێوە مارە بڕان لە غەیری ئێوە فەرمووی:

ئەوە هەواڵ و دەنگ و باسی دنیای ئێمەیە بەڵام هەواڵ و دەنگ و باسی دنیای ئێوە چییە؟

کمیل دەڵێ: پاشان ئاوڕێکی لێ دامەوە فەرمووی: ئەی (کمیل) سوێند بەخوا ئەگەر مۆڵەتی وەڵام وقسەکردنیان پێ درا بایە ئەوا دەیانگوت (إِنَّ خَيْرَ الزاد التقوى) واتە: چاکترین وباشترین توێشوو بۆ ئەو سەفەرە تەقواو پارێزگاری یە پاشان زۆر گریا و گوتی: ئەی کمیل گۆڕ سندۆقی کردەوەکانە لە کاتی مردنیش هەواڵەکەت پێدەگات وئاگادار دەکرێتەوە هەروەها کە مردیت دەزانی کە تەقوا چەندە پێویستە بۆ ئەو سەفەرە[1].

(١) حياة الصحابة – للكاندهلوي



## ٣٧١- شێخ حسن ی بەسری وپیاوە ئاگرپەرستەکە

شێخ حسن ی بەسری دەفەرمووێ :

جارێکیان چوومە لای یەکێك لە ئاگرپەستەکان کە خەریك بوو گیان لە دەست دەدا ئەو پیاوە ماڵی لە بەرامبەر ماڵی ئێمەبوو، هەتا بڵێ ی دراوسێکی چاك بوو ئەخلاق ورەوشتێکی جوان وچاکی هەبوو، ئومێدم دەکرد لەسەرەمەرگدا خوا هیدایەتی بدات، وەلەسەر ئایینی ئیسلام بمرێ، بۆیە منیش پێم گووت: حاڵت چۆنە وچیت بەسەرهاتووە؟

گوتی: دڵێکی دەردەدار وهیچ ساغێکی پێوە دیارنییە لاشەیەکی نەخۆش و هیچ هێزێکی نەماوە، گۆڕێکی چۆل و هۆڵ هیچ کەس نییە ئولفەتی پێوەبکرم، گەشتێکی دوورو بێ توێشوو.

پردێکی باریك، کە ناتوانم بەسەریدا تێپەرم ئاگرێکی گەرم کە هیچ لاشەیەکی ئەو هام نییە بەرگەی بکرم، بەهەشتێکی بەرزو بەڵام هیچ بەشی منی تێدانییە ومن لێی بێ بەشم، خوایەکی دادپەروەرو منیش هیچ بەڵگەیەکم نییە بۆمەیدان.

شێخ حسن فەرمووی: ئومێدم وایە خوا هیدایەتی بدات، بۆیە لێ نزیك بوومەوە وپێم گوت: بۆ چی موسلمان نابیت تاکو سەلامەت بیت؟

گوتی: ئەی شێخ کلیلی ڕاستەقینە بەدەست ئەوەیە کە (الفتاح)ە خۆی هەموو شتێك دەکاتەوە، قوفلیش لێرەیە، ئاماژەی بۆ سینگی خۆی کرد. یەکسەر لەهۆش خۆی چوو.




شێخ گوتی: منیش گوتم: ئەی خوایە ئەگەر ئەو ئاگر پەرستە چاکەیەکی هەیە لەلای تۆ کە پێ ببەخشیت ئەی خوایە پەلەی بۆ بکە و زوو پێی بدە، پێش ئەوەی گیانی دەربچێ، ولە ئومێدو خۆشیەکانی دنیا دا ببڕێت.

دەڵێ: بەهۆش خۆی هاتەوە و چاوەکانی کردەوە پاشان ڕوی کردە لای من گوتی: یا شێخ ئەوەی کە زۆر دەرگادەکاتەوە (الفتاح) کلیلی بۆ ناردم دەستی ڕاستەت بێنە ئەوا من دەڵێم: اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمد رسول الله، پاشان گیانی دەرچوو[1].

## ٣٧٢- داوێن پاك بن لە ئاست ئافرەتانی خەڵك

دەگێرنەوە کە ئافرەتێکی چاك و داوێن پاك هەبوو مێردەکەشی پیاوێکی زێرینگر بوو، ئەو ئافرەتە خزمەتکارێکی پیاوی هەبوو کە ئاوی بۆ دەهێنا بە درێژایی سی (٣٠) ساڵ، دەهاتە لای سەیری ناکرد بە هیچ شێوەیەك ڕۆژێك لە ڕۆژان پیاوە ئاودەرەکە هاتە لای دەستی ئافرەتەکەی گوشی بە توندی، کاتێ پیاوەکە هاتەوە پێ گوت: ئەی پیاو ئەمرۆکە تووشی هیچ گوناهێك نەبوویتە؟ گوتی: نەخێر تەنها ئەوەندە نەبێ ئافرەتێك هاتە لام وهەندێك زێڕۆ بازنی لێم کڕی منیش کاتی دەستی ئافرەتەکەم بینی زۆر نەرم و جوان و ناسك بوون پێ سەرسام بووم وبەتوندی دەستم لێ گوشی، ئەویش گوتی:

(١) بحر الدموع – الامام ابن الجوزی، لاپەڕە (٢٣)






بەڕاستی ئەی پیاوەکە تۆڵەوەرگرتنەوە مسۆگەر بوو لەسەخێزانت کاتێ کە وات کرد لە خێزانی براموسلمانەکەت، بۆ ڕۆژی دواتر پیاوە ئاو دێرەکە هاتەوە داوای لێ بووردنی کرد لە ئافرەتەکە، ئافرەتەکەش گوتی: هیچ نییە خراپە وتاوانەکە لە مێردمە ئەو بوو کە ئەو دەرگایەی کردەوە لەسەر من

ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەرمان (ﷺ) زیاتر ئەو ڕووداوە بەهێز دەکات کە دەفەرمووێ: (عفو عن نسأء الناس تعف الناس عن نساءكم) واتە: داوێن پاکی بنوێنن لە ئاست ئافرەتانی خەڵك خەڵکیش داوێن پاك دەبێ لە ئاست ئافرەتانی ئێوە[1].

## ٣٧٣- هەم دنیایان بو وەهەم دوا ڕۆژیشیان بوو

لە نێو بەنی ئیسرائیل دا پیاو و ئافرەتێکی زۆر چاك و خوا پەرست هەبوون خوای گەورە نیگای بۆ پێغەمبەری ئەو سەردەمە یان کرد فەرمووی بڵێ بەو خوا پەرستە من وام بڕیارِ داوە کە نیوەی تەمەنی لە فەقیری تەواو بکەم وەنیوەکەی تریش لە دەوڵەمەندی، ئەگەر ئەو لە گەنجێتی دا دەوڵەمەندی هەڵبژارد ئەوا دەوڵەمەندی دەکەین، پیاوە چاکەکە دەوڵەمەندی هەڵبژارد لە تەمەنی پیری دا بۆ ئەوەی سەرقاڵ نەبێ بە کاروکاسبی هەمووی لە خوا پەرستدا سەرف بکات وەخێزانەکەشی دەوڵەمەندی هەڵبژارد

(١) نزهه المجالس / لاپەرە (١٢٥)






لەتەمەنی لاوێتی دا چونکە لەو کاتەدا بەهێز ترە لەسەر خواپەرستی وەمرۆڤی پیرو پەککەوتە هیچی پێ ناکرێت مەگەر زوهد و واز هێنان نەبێ لە دنیا وکاروکاسبی

خوای گەورە نیگای کرد بۆ پێغەمبەریان فەرموی: برۆ پێیان بڵێ: لە بەر ئەوەی ئەوان تاعەت و عیبادەتی منیان لەسەرەوەی هەموو شتێ هەڵبژارد وەحەزیان نەکرد لەبەر خوا پەرستی سەرقاڵی ماڵی دنیا بن ئەوا بڕیارم داوە کە لە هەموو تەمەنیان دەوڵەمەند بکە بۆ ئەوەی هەم دنیایان هەبێ وەهەم دوا ڕۆژێشیان هەبێ [1].

## ٣٧٤- ابراهیم کوری ادهم و مارەکە

یەکێك لە پیاوە چاکەکان دەڵێ:

چووم بۆلای ابراهیم ی کوڕی ادهم، کە سەردانی بکەم، بۆیە چووم لە مزگەوت بیدۆزمەوە بەلاّم لەوێ نەبوو، پێیان گوتم: تازە دەرچوو لە مزگەوت، منیش بەدوایدا دەگەڕام، لەو دەشت و چۆڵەوە لە ناکاو بینیم لە دۆڵێك خەوتووە لە کاتی گەرمادا، وەمارێکی گەورەش لەلای سەری بوو، لەدەمی مارەکەش پارچە گیایێکی یاسەمینی تێدا مێش و حەشەڕاتی لێ بە دوور دەگرتن منیش بەسەر سامی وەستام دەبینم مارەکە بە قسە هات ئەو خوایە بەقسەی هێنا کە هەموو شتێك بە قسە دێنی، گوتی: بەچی سەرسام بوویت

---

(١) نزهە المجالس، لاپەڕە (١٣٥)






ئەی پیاو؟ گوتم: بەکارەکەی تۆ و زیاتریش بە قسەکانت، کە چی تۆ دوژمنی ئادەمیزادیت.

پێی گوتم: سوێند بەخوای گەورە ومەزن خوا ئێمەی نەکردۆتە دوژمنی هیچ کەسێ جگە لە تاوانباران، بەلاَم پیاوانی گوێ رایەڵ و لە خوا ترس ئێمە بۆیان ملکەچ دەبین[1].

## ٣٧٥- بەدوعای دایکی بوو بە زانایەکی پایەبەرز

سلیمان ی کوڕی ایوب دەڵێ: سەردەمێك داوای زانستم کرد ومەبەستم بوو قورئانی پیرۆز لەبەر بکەم ماوەی دەساڵان بەلاَم هیچم بۆ نەکرا تەنانەت سورەتی فاتیحەشم بە جوانی نەدەزانی، زۆر ناڕەحەت بووم، وە مامۆستاکەشم لێم بێ ئومێد بوو هەر بە تەنیا دادەنیشتم ودەگریام ولە سوجدەدا بە ملکەچی لە خوا دەپاڕامەوە کە گرێیەکانی زمانم بکاتەوە و تاریکی دڵم لابەرێ بێ سوود بوو هیچ دوعام گیرانەوەبوو، بۆیە چوومەلای پیاو چاکێك باسی حاڵی خۆم بە تێروتەسەلی بۆی گێڕایەوە، پرسیاری لێم کرد ئایا دایکت ماوە؟ گوتم: بەڵێ، گوتی پێم: ئایا لەگەڵی دا چاکە دەکەیت؟ گوتم: چاکەی چاکتر و تەواوتر لەگەڵ دەکەم واتە: هەوڵ دەدەم زیاتر لە گەڵی چاك بم، گوتی برۆ لای پێی بڵی با دوعات بۆ بکات بۆ لەبەرکردنی قورئان و شارەزا بوون لە ئایین، منیش بە پەلە چوم بۆ لای ئەوەم پێ گوت

---

( ١) بحر الدموع – الامام ابن الجوزی لاپەڕە (٥٢)



که پیاوەکه پێی گوتم، چاوەڕوان بوون تاکو بوه شەو کاتێ بەرەبەیان هات – کەمێك مابوو له شەودا – دەست نوێژێکی پوخت وجوانی هەڵگرت و پارشێوەکەشی خوارد – وادیاره دەیەوێت بەڕۆژوبێت – پاشان هەستا نوێژی کرد وئەوەندە دوعای بۆ کردم تاکو نوێژی بەیانی بوو، خوای گەورە وەلآمی دایەوە بۆم، فیکرومێشکم وەك ئەوە وابوو که هەوری گەرمی هاوینی لەسەربێ لەناکاو بایەکی بەهێز لێ داو زیرەکی وژیری لەگەڵ خۆی هێنابۆم بەردەوام به پلەکانی قورئان‌و فەرمودە بەرز دەبوومەوە، وەلە دەریای زانست و حیکمەتدا مەلەوانیم دەکرد تاکو بووم به پێشەوایەك هیچ تۆزو غوبارێك ئازاری نەدام، ئێنجا هەر کەسێ پێویستێکی هەبێ که بۆی جێ بەجێ نەکرێت باداوای دوعا له دایك وباوکی بکات[1].

## ٣٧٦- من گوتم بۆ خوایە ئێستا چۆن پەشیمان دەبمەوە؟

دەگێڕنەوە که عبدالله کوڕی ئیمامی (عمر) وشترەکەی لێ دزرابوو، ئەویش زۆر بەدوای گەڕا هەر نەیدۆزیەوە، له پاشان گوتی: با بۆ خوا بێ – واتە: بۆم ببێ بەخێرو چاکە له پێناوی خوا – ئێنجا چووە مزگەوت ونوێژی کرد لەناکاو پیاوێك هات و گوتی: ئەی ابو عبدالرحمن، وشترەکەت له فلان شوێنە بوو، ئەویش هەستا پێڵاوەکانی لەبەرکرد ویستی بۆی بچێ پاشان گوتی: استغفر الله... ئینجا دانیشت، پێیان گوت: بۆ ناچی بیهێنیتەوە: گوتی: من گوتم بۆ خوایە چۆن پەشیمان دەبمەوە[2].

---

( ١)  الوصايا المنبرية/ محمد عبدالعاطي – بەرگی (١) لاپەڕە (٢٤٩)

( ٢)  احياء علوم الدين / بەرگی (٥) لاپەڕە (٥٤٦)

## ٣٧٧- کاتێك فەرمانی خوا هات پێی ڕازی بووین

دەگێڕنەوە کەوا عبدالله ی کوڕی ئیمامی عمر کوڕێکی هەبوو تووشی نەخۆشی بوو عبدالله زۆر بۆی پەرۆش بوو، هەتا دەڵێن :بەڕاستی دەترسین ئەو منداڵە شتێکی بەسەر بێت لەبەر ئەو پیاوە پیرە – عبدالله بن عمر – پاشان منداڵەکە مرد عبدالله لەگەڵ جەنازەکەی دەرچوو وەهیچ کەسێك وەك ئەو دڵخۆش و شادنەبوو، پرسیان بۆچی ئەوها دڵت خۆشە خۆ ئەوە کوڕی تۆیە مردووە گوتی: کاتێ نەخۆش کەوت بۆی غەمبار و پەرۆش بووم ئەوا بە زەبیم پێدا هاتەوە، کاتێکیش فەرمانی خوا هات ومرد ڕازی بووین پێ[1].

## ٣٧٨- ئەوەی کە دەچێتە هەموو ماڵەکان

یزیدی – الرفاشی – دەڵێ: یەکێك لە زۆردارەکانی بەنی ئیسرائیل ی لەناو منداڵەکانی دا دانیشتبوو، لە ناکاو سەیری کرد کەسێك لە دەرگای ماڵی هاتە ژوورێ، ئەویش بۆی هەستا بەتووڕەیی یەوە پێی گوت: تۆ کێیت؟وەکێ تۆی هێنایە ناو خانووەکەم؟

گوتی: ئەوەی منی هێنایە ناوخانوو ئەوا خاوەنەکەی بوو، وەمنیش ئەو کەسەم کە هیچ کەس ڕێگری ناکات لێم وپەردەنییە لە هاتنە ژوورێ بۆم

---

(١) احیاء علوم الدین/الامام الغزالي بەرگی (٦) لاپەڕە (١٠٥) کتاب المحبه والتصوف والانس والرضا




وەهیچ کات ئیزن وەرناگرم کاتێ دەچمە لای پاشا و گەورەپیاوان وەلە تۆڵە و لێدانی دەسەڵاتداران ناترسم وەهیچ زۆردارێك وشەیتانێك ڕێگریم لێ ناکەن، دەڵێ: لەوکاتەدا زۆردارەکە کەوتە خوارێ وتاسا پاشان سەری بەرزکردەوە بە ملکەچی ڕووی کردە کەسەکە گوتی: بەڵێ کەواتە تۆ فریشتەی گیان کێشانێ، گوتی: بەڵێ

گوتی: ڕێگام دەدەیت کەمێکی تر؟ گوتی: دووووره ! کاتەکەت تەواوبوو بڕا وەهەناسەکانت کۆتایی پێ هات، کاتژمێرەکانی تەمەنت لەناو چۆن وهیچ ڕێگاچارەیەك نیە بۆ دواخستن گوتی: ئینجا بۆ کوێم دەبەیت؟

فریشتە گیان کێشان گوتی: بۆ لای ئەو کردەوانەی کە بەپێش خۆت خستونە و بۆ ئەوماڵەی کە بۆ خۆت دروستت کردووە.

گوتی: جا من هیچ کردەوەیەکی چاکم نەکردووە وهیچ ماڵێکی چاکیشم دروست نەکردووە بۆ خۆم،

گوتی: کەواتە بۆ دۆزەخت دەبەم کە ئاگرەکەی بڵێسە دارە ولاشە دەبرژێنی، پاشان گیانی کێشا بە مردوویی کەوتە ناو ماڵ و خێزانی لە نێوان هاوارو گریاندا[1].

---

(١) احياء علوم الدين/الامام الغزالي/بەرگی (٦) لاپەڕە (٣٤٦)






## ٣٧٩- گریان دڵ دەحەسێنێتەوە

ذا النون ی – المصری – دەڵێ

شەوێکیان لە دۆڵی کەنعان دەرچووم وکاتێ بەسەر بەرزایی دۆڵەکە کەوتم دەبینم ڕەشاییێك بەرەولام دێت ودەڵێت: ﴿ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴾ الزمر: ٤٧ ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا دەگریا، کاتێ نزیکی ئەو ڕەشاییە بوومەوە دەبینم ئافرەتێکە عەبایەکی خوری لەبەردا یە وکووپێکی ئاویشی پێیە، پێی گوتم تۆ کێی؟ بێ ئەوەی لێم بترسیت، گوتم: پیاوێکی غەریب.

گوتی: ئەوە چییە ئایا غەریبی لەگەڵ هەبوونی خوادا هەیە – مەگەر خوا لە گەڵت دانی یە؟

دەڵێ: منیش لەبەر قسەکەی گریام، پێی گوتم: بۆچی دەگری؟

گوتم: بەڕاستی دەرمان کەوتە سەردەردم وبەپەلە چاکبوەوە، گوتی: ئەگەر ڕاست دەکەیت بۆچی دەگریت؟ گوتم ڕەحمەتی خوات لێ بێ چۆن پیاوی ڕاست گۆ ناگریت؟ گوتی نەخێر، گوتم: بۆچی؟

گوتی: لەبەرئەوەی گریان دڵ دەحەسێنێتەوە،

منیش بەسەرسامیەوە لە قسەکانی دا بێ دەنگ بووم (١).

---

( ١) احیاء علوم الدین/الامام الغزالي بەرگی (٦) لاپەڕە (٢٣٨)



## ٣٨٠- لە شوێنێکت بەجێی هێشتم زیکری خوای تێدانەدەکرا

یەکێك لە پیاو سالحان دەڵێ: ڕۆژێکیان چوومە بازاڕ و خزمەتکارێکی (جاریە) حەبەشیم لەگەڵدا بوو، منیش لە شوێنێك لەبازاڕ دامنا پێم گوت: لە شوێنی خۆت نەجوولێت و دواتر ڕۆیشتم بۆ کرینی پێداویستەکانم کە هاتمەوە لای دەبینم لەوێ نەماوە، بە تووڕەییەوە هاتمەوە ماڵێ دەبینم لە ماڵێ یە، کە منی بینی وزانی تووڕەیی لە ڕوخسارمدا دیارە گوتی: گەورەم پەلەم لێمەکە تۆ منت لە شوێنێك بەجێ هێشت کەسم نەبینی زیکری خوا بکات منیش ترسام نەوەك خوا زەوی ڕووبچێنێ لەوشوێنە، دەڵێ: کاتێ گوێم لە قسەکانی بوو سەرسام بووم پێی وەپێم گوت: تۆ ئێستاکە ئازادی، گوتی: بەڕاستی خراپەت لەگەڵدا کردم من کاتێك خزمەتم دەکردیت ئەوا دووپاداشتم هەبوون لەلای خوا، بەڵام ئێستا تەنها یەکیان ماوە ئەویترم لە دەست چوو(١).

## ٣٨١- پاداشتەکەی ئەوەیە بەیانی بۆی بەڕۆژووبین

ابو سلمان الدارانی دەڵێ: شەوێککیان لەلای رابعەی – العدویە– بووم هەستا بۆلای میحرابەکەی ونوێژی کرد منیش لە سووچێکی مزگەوتدا نوێژم دەکرد، تاکو بەرەبەیان لەسەر قاچەکانی ڕاوەستا ونوێژی کرد، کاتێ بووە بەیانی گوتم: پاداشتی ئەو هێزو توانایە چییە کە خوا پێی داوین لەسەر زیندووکردنەوەی ئەو شەوە؟ رابیعە گوتی: پاداشتەکەی ئەوەیە کە بەیانی بۆی بەڕۆژوو بین (سبحان الله)(٢).

---

( ١) احیاو علوم الدین/ الامام الغزالی، بەرگی (٦) لاپەڕە (٢٣٩)

( ٢) احیاو علوم الدین /الامام الغزالی، بەرگی (٦) لاپەڕە (٢٤٠)




## ٣٨٢ - پێغەمبەر – ایوب – علیه السلام

ئیمامی ابن الحجری – العسقلانی – دەفەرمووێ :

ڕاسترینی بەسەرهاتی پێغەمبەر ایوب علیه السلام – ئەوەیە کە ابن ابی حاتم و ابن جریح دەریان هێناوە، وەابن حبان وحاکم لە ڕێگای نافع ی کوڕی یزید ئەویش لە عقیل وئەویش لە – الزهری – ئەویش لە – انس – بەراستیان زانیوە کەوا، پێغەمبەر ایوب علیه السلام – تووشی نەخۆشی بوو، لەناوئەو نەخۆشیەش سیانزە ساڵ مایەوە بە ئازار و ئەشکەنجە بردیە سەر، خەڵکی نزیك و دوور نەیانویست و ڕەفزیان کردەوە تەنها دوو پیاونەبێ لە براکانی کە بەیانی و ئێوارە سەردانیان دەکرد، یەکێکیان بە ویتری گوت: بەڕاستی ایوب گوناهێکی زۆر گەورەی کردووە بۆیە ئەو نەهامەتیەی لەسەر لاناچێ ئەوەی تریش چوو بە – ایوب –ی گوت، واتە: دڵی غەمباربوو لەوکاتەدا دوعای کرد و بۆ کارێکی پیویستی خۆی لە ماڵ دەرچوو وەخێزانەکەی دەستی گرت، کاتێ کارەکەی خۆی تەواو کرد خێزانەکەی کەمێ لەسەری سست بوو لێی دابڕا بۆ ماوەیەکی کەم، خوای گەورە نیگای بۆ کرد کەوا بەقاچی لەزەوی بدات، ئەویش بە قاچی لە زەوی داو کانییێکی ئاوی لە شوێن قاچیدا هەلقوڵا لەوکانییەدا خۆی پاك و پۆخت شۆردو بە چاکیو لەش ساغی لە هەموو نەخۆشیەکانی گەڕایەوە، خێزانەکەی هاتەلای نەیناسیەوە گوتی: کوا – ایوب؟ فەرموی: من ایوب –م

– ایوب – دوو چاڵی گەورەی گەنم وجۆی هەبوون – لەبەردەم ماڵەکەی



– خوای گەورە فەرمانی کرد بە پارچە هەورێك کە بچێتە سەر چاڵی گەنمەکەی لە جیاتی ئاو زێڕی بەسەردا ببارێنێ، وەلەبۆ چاڵی جۆیەکەش زیوی بەسەردا ببارێنێ تاکوو لە هەردوکیان وەکو باران زیڕو زیو دەڕژایە خوارێ (1).

## ٣٨٣- دەسەڵات بەروبوومی زانستە

خەلیفەی بەغدا هارون الرشید هاتە شاری – الرقه – کەلە باکوری ولآتی سوریابوو کردبووی بە پایتەختی خۆی بۆکاتی هاوینان وەلەوێ کۆشکی – السلام – ی دروست کردبوو، لەوشوێنەدا بینیان کە خەڵکی بەدوای زانای گەورە پایەدار عبدالله کوڕی مبارك کەوتوون، لەبەر زۆری خەڵك دەنگی پێڵاوەکانیان دەڕۆیشت و تۆزو غوباریان بەرز کرد بوو لەوولآتدا دایکی کوڕی خەلیفە لەسەر بورجی – الخشب – سەیری دەکردن کاتێ ئەو خەلکەی بینی گوتی: ئەوە چییە؟ گوتیان: زانایەکی گەورەی خەڵکی خوراسانە دێتە شاری – الرقه – عبدالله کوڕی مبارك ی ناوە.

گوتی: سوێند بەخوا ئەوە دەسەڵات وگەورایەتی یە نەك هی هارون الرشید، کە خەڵکی بۆی کۆنابنەوە مەگەر بەمەرج ویارمەتی دان نەبێ وبەرژەوەندی ئەوانی تێدانەبێ (2).

---

(١) فتح الباري، شرح صحيح البخاري – بەرگی (٦) كتاب احاديث الانبياء ژمارة (٢٠) لاپەڕە (٥١٠) – دار السلام – الرياض دار الفيحاء – دمشق

( ٢) قصص الصالحين، د.مصطفى مراد، لاپەڕە (١٨٢)




## ٣٨٤- شوێنی سوجدەی بوویە یەك پارچە نوور

مەڕڕەی – الهمدانی – کە یەکێك بوو لە خواپەرستان زۆر سوجدەی دەبرد و تاکو وای لێهاتبوو ناوچاوانەکەی بە خۆڵ هەمووی خواردبوو، کاتێ ئەو پیاوە خواپەرستە دەمرێ، یەکێك لە لە خەودا دەبینێ، کە شوێنی سوجدەکەی وەك ئەستێرەی ڕووناك دەدرەوشایەوە پرسیاری لێ کرد ئەو شوێنە وارە چییە کە دەبینم بەڕوخسارتەوە؟

گوتی: بە خۆی ئەوەی کە خۆڵ لەدنیادا ناوچاوانی خواردبووم شوێنی سوجدەم داپۆشرا بەیەك پارچە نوور، پیاوەکە گوتی: لێرەدا شوێنت چۆنە؟ گوتی: باشترین شوێن وماڵە بۆم، خانووێکە دانیشتووەکانی هەرگیز لێ ناگواسترێنەوە وەهەرگیز نامرن[١].

## ٣٨٥- عاقل ترین شێت

لەوکاتەی کەوا حجاجی یوسف ی سەقەفی بێ ڕێزی کرد بەرامبەر بە ماڵی خوا وکەعبەی پیرۆز – پیسایی فرێ داناو وەعبداللە ی کوڕی زبێری شەهید کرد، پیاوێکی فەقیری گێلۆکە هات و عەبایەکی لەبەردابوو لە چکەکانی بە ئەستۆی وەگرێدابوو هات حەوت جار بە دەوری کەعبەدا تەوافی کرد و پاشان بەسەر میحرابی کەعبە کەوت گوێیان لێ بوو، لەقسەکانیدا گوتی:

---

(١) قصص الصالحين، د.مصطفى مراد، لاپەڕە (٢٣٢)



ئەی خەڵکینە کەسێ من بناسێ ئەوا دەمناسێ، وەکەسێ نەمناسێ ئـەوا ناوی خۆمی پێ دەڵێم من ناوم مەیمونە، کونیەم – ابو المبارك –ی شێتە گوێ بگرن بۆ قسەکانم، چونکە من قسەتان بۆ دەکەم بێ ئـەوەی لەکـەس بترسم بەزوبانێکی ڕاست دەڵێم، ناترسم لەسزا، بەڵکو ئومێدی پاداشت دەکەم لە خوای گەورە و پەروەردگاری جیهانیان، کە خاوەن نیعمەت وگەورەییە ئەوم مەبەستە، داوای ئەوەدەکەم کە لەلای ئەوە، پاشان سوپاسی خوای کرد و بەجوانی ئینجا چەند دوعائێکی کرد زمان پاراوی فەساحەتی تێداکرد گوتی: ئەی خوایە بۆ تۆ سوجدە دەبات هەموو ناوچاوانەکان، وەگەردەنەکان هەموی بۆ تۆ ملکەچ بوون، گەورە دەسەڵاتدارانی دونیا بۆ تۆ زەلیل بوون، تۆی کە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی بەبێ پرس و ڕاو ماندووبوون، ئەوی دەتەوێت کەس بێ تاقەتت ناکات لێی، ئەوەی داوای دەکەیت کە ناتوانێ بیفەوتێنێ، هیچ شتێکت لێ ون نابێ لەبەر دووری، زیاتر هیچ شتێ ناناسیت لەبەر نزکی – واتە دووورونزیك لەلای خوا وەك یەك وایە – شتە بەنهانەکانی دڵەکان دەزانی، وەك چۆن شتە دیارەکان دەزانی، ئاسمانەکان بۆت ملکەچ بوون، زەویەکانیش بۆت گوێ ڕایەڵ بوون، هەسارەکان لە فراوانی ئاسمان دا بۆت دەسووڕێنەوە و مەلەوانی دەکەن لە بۆشایی دا، فریشتەکان بۆت لە هەوڵی خواپەرستی دان، پێغەمبەران پەیامەکانت دەگەیەنن بۆت، هەورەکانیش لێك جیادەبێتەوە، بەهەشت بە حور العین – ڕازاوەتەوە، ئەی خوایەی کە دادپەروەری لە بڕیاردان وحوکم فەرمانڕەواییدا، ئەی ئەو خوایەی کە ڕەزامەندیت لەگەڵ

سوپاسگوزاری دایە، وەخۆت بۆ خۆشەویستانت بەدەردەخەیت لەبەهەشت، بەڕاستی بە زمانێکم قسە کرد بە سوپاسگوزاری بۆتۆ دراوە بەدڵێك کەملکەچە بۆ هەیبەتت، وەبەچەند ئەندامێك کە بۆ پیرۆزی و مەزنیت سەردادەنوێنن، داوات لێ دەکەم ئەوەی کە لە هەموو شارەکانی بەندەکانت تۆیان مەبەستە، ئومێدیان پاداشتە لە ترسی سزاو ئازاری دوا ڕۆژ، داوات لێ دەکەم ئەی خوایە وەك کەسێك کە ئومێدی گیرابوونی پاڕانەوەکەی هەبێ ودڵنیابێ کە کاروپێداویستەکانی بۆ جێ بەجێ دەبن، حجاج ی هێرش کەر بۆ سەرماڵەکەت بە پیسانی لەناوببەیت وەکە بکوژی هاوەڵانی پاکی پێغەمبەرەکەت لە هەموو گومان ودوودلیەك خوایە ئەگەر بەرەحمەت و میهربانی خۆت باس ی بەندەکانت دەکەیت ئەو بەخراپترین وتوندترین تورەیی باسی حجاج بکە، تۆی ئەی خوایە کە وەڵامی پاڕانەوەی بەندەکانت دەدەیتەوە، پەروەردگار ئەو ماڵە ماڵی تۆیە، ئەی خوایە تۆی خاوەنی ڕێزو گەورەیی وبەخششی.

پاشان چووە (مینا) خەڵکیش وەکو خۆی کۆببونەوە – واتە پەرت وبڵاونەببوون ئینجا نوێژی بەیانی کرد و پاشان هەستا سەر پاو گوتی: ئایا مەبەستتان لای خوا نییە؟ وەئەوەتان ناوی کە لەلای ئەوە؟ هەرکاتێ داواتان لێ کرد ملکەچ بن وە نەفرەتییش لە حجاج بکەن.

ئەی خوایە ڕزگاری نەکەیت لە تووڕەیی خۆت وبێ بەشی بکە لە بەزەیی خۆت کە هەموو شتێکت فراوان کردووە، تۆی کە خاوەن گەورەیی و پیرۆزی و ڕێزی، ئینجا خەڵك لێ ی کۆبوونەوە پێیان گوت: تۆ کێیت؟ و لەکوێ هاتیت؟




گوتی: لە شارەکانی خوا

گوتیان: لە کویّ دەمینیتەوە وبۆ کویّ دەچیت؟

گوتی: بۆ ئەرزی خوا

گوتیان: بەسەرهاتت چییە لەگەڵ حجاج ئایا ستەمی لێت کردووە بەشتێك؟

گوتی: بەڵێ

گوتیان: چی لێت کردووە؟

گوتی: ماڵی خوای منی پیس کردووە بەبیّ ڕێزی هێرشی بردۆتە سەری وهاوەڵانی پێغەمبەری کوشتوون وئیهانەی کردوون بۆیە شیاوی نەفرین لیّ کردنە و شیاوی دوژمنایەتییە کە ئێمە لەگەڵی بکەین، هیچ شوێنێك نازانم کە لێرە گەورەترو پیرۆزتر بیّ، شوێنی لەدایك بوون پێغەمبەر و هاوەڵانە، بۆیە دەمەوێت لە پێناویدا خۆم ئازار بدەم، وەخۆم ئازاربدەم بە دوعا کردن لەسەر حجاج، پاشان تێپەری و عەباکەی خۆی ڕاکیشا و ئاسەواری برسێتی پێوە دیار بوو، پیاوێکی بازرگانی بەدواکەوت وگوتی: السلام علیك ئەی باوکی مبارك گوتی: وعلیك السلام ئەی نوێنەری خوا، گوتی من کارێکم پێت هەیە، گوتی: کارەکەت چییە بازرگان گوتی: دەبیّ بێتە ماڵم وپارچە نانێك وشۆرباییێك بخۆییت، گوتی: بەمەرجێك

بازرگان: مەرجەکە چییە؟






گوتی: نابێ ستەم بکەیت ویارمەتی ستەمکاریش بدەیت پاشان گوتی: تۆ چ کارەیت؟

گوتی: بازرگانم

گوتی: ئایا نەتزانیوە کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (یحشر التجار فجارا الا من اتقی وبر وصدق)[1]. واتە لە ڕۆژی دواییدا بازرگانەکان بە پیاوی خراپ و دڵ ڕەق و گوناهبار حەشر دەکرێن، تەنها ئەو کەسە نەبێ کەوا خۆپارێز و چاك وڕاست گۆ بێ لە کارەکەی

بازرگان گوتی: من لەکاتی فرۆشتندا بەچاك باسی شتەکانم ناکەم وەلەکاتی کرینیشدا بە خراپ باسی کالآی خەڵك ناکەم گوتی: بە تۆوە میوانداریەکەمان کە زیاتر پاك و بەتام بوو، پاشان ابو المبارك چووە لای کەل و پەلەکەی کولێرەیەك و هەندێ خوێ ی هێنا وخواردی ئینجا گوتی: بەبازرگانەکە ئەی براکەم، هەر دەخوێ ونان بخۆ چونکە بەوە بەزی سەر گورچیلەکانت دەتووێتەوە

بازرگان دەڵێ: منیش گوتم: ئامۆژگاریم بکە گوتی: لە خوابترسە وەك ترسی کەسێك کە زۆر بێدارو هۆشیارە لەسەر نەکردنی خراپە و تاوان، وەتەما ئومێدت بەخوا هەبێ وەك کەسێك کە لە خوا زۆر بترسێت.

وەماڵی حەڵاڵ بخۆ وبەفەقیرو هەژارانیش ببەخشە، بەسەلامەتی دەچیتە بەهەشت گوتی: منیش بەقسەکانی سەرسام بووم، کاتێ وەرزەکە تەواو بوو پیاوانی حجاج ڕوویان کردە حجاج و هەواڵی (میمون ی ابو المبارك)یان پێ

---

( ١) رواة الترمذي وقال حديث حسن صحيح – كتاب البيوع






گەیاند وگوتیان لەبەر خەڵكی ڕەش و ڕووت هیچمان پێی لەگەڵ نەكرا بانگی یەكێك لە پیاوانی خۆی كرد وگوتی: بڕۆ لە شاران بگەڕێ تاكو ئەو پیاوەم بۆ دەدۆزیتەوە دیاری تایبەتێت دەدەمێ.

دەڵێ: گەڕان وسووڕان خۆیان زۆر ماندووكرد بەدوای – میمون – خەڵكی كوفەی عیراق بوو، وەلەوێ دادەنیشت، كابرا چوو بەرەو كوفە كەوتە ڕێی بە دوای دا، دەبینی وا لەگەڵ منداڵان دانیشتووە لەسە رزبلێ دانێك، وەپێ دەگوتن ئێوە قەڵەمی تەكلیفتان لەسەر نییە، وەهەنگاوەكانتان بە گوناه لەسەر نانوسرێ، بەڵام وریابن بەقسەی شەیتان نەكەن، چونكە بەڕاستی دوژمنی باوكتان بوو ئادەم، هەر ئەویش بوو دوای قەزاو قەدەری خوا یارمەتی ئادەمی دا بۆ ئەوەی لەبەهەشت بێتە دەر، دەست بگرن بە ڕەوشتی چاكان و پاكان، شوێن باوەڕدارە ڕاستەقینەكان بكەون، لەوان ابو بكری ڕاست گۆ، عمری فاروق كە حەق و مافی خوای هەرگیز لەلا نارۆیشت وبەزایەی نادا، پاشان عثمان ي ذي النورين، ئینجا علی خاوەن شمشێرە بڕەندەكەی بۆ ملی دووڕووان وهەڵگەڕاوەكان، ڕۆڵەكانم ئەگەر ئەو هابن ئێوە لەگەڵ دۆستان وخۆشەویستانی خوا دەبن، بەردەوام ئەوها ئامۆژگاری دەكردن كاتێ تەواوبوو لە قسەكانی پێیان گوت: ئایا خواردنێكی چاك وپاك وبەتام ناخۆیت ! وبەرگێكی پاك و باش لەبەر ناكەیت؟ ئەویش پێ گوتن: درۆدەكەن لەو قسانەتان وئەوەتان ناوێت وبەڵكو دەتانەوێت ئێوەی پیاوانی حجاج بمبەن بۆ لای حجاج، هاتوون داوای من دەكەن بەڵام قۆڵ بەستم نەكەن وقاچەكانم نەبەستنەوە، ئینجا بریان بۆلای حجاج، كە چووە ژوورێ



سەلامی نەکرد لە حجاج لەبەرامبەری وەستاو هیچ قسەیەکی نەکرد وحجاجیش زۆر بەسووکی وکەمی سەیری دەکرد.

ابو المبارك گوتی: اياك ان تزدري الرجال وما يدريك ما يجنه الصدق

واتە: نەکەی پیاوان بە چاوێکی سووك و بچووکەوە سەیر بکەیت تۆ چوزانیت کە ئەوەی شێتی کردووە ڕاست گوێی نەبێ

کاتێ حجاج ئەمەی بیست زانی کە پیاوی حەکیم ودانایە، پێی گوت: ناوت چییە؟ گوتی: ئەمرۆ کە ناوم (میمون)ە، نازانم بەیانی خوا بەچ ناوێك بانگم دەکات؟ وەنازانم بە بەختەوەر بانگ دەکات یان بە لاییدە (الشقی) گوتی: ئەگەر گوتیان فلان کەس بەختەوەربوو ئەوا پێویستیم بە ناوی خۆم نییە، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانە بوو ئەوا لەلای خوا بێ بەشم حجاج گوتی: لە چی دروست کرایت؟

گوتی: لە ئاوێك کە لە نێوان گۆشت وخوێنە

حجاج گوتی: هاوار بۆ خۆت ئەو شتانە دەزانیت دەڵێن شیتێ

گوتی: بەڕاستی خەڵکی بێ ئیش وکار ئەگەر سەیری خۆشەویستانی خوا بکەن دەڵێن ئەوانە شێتن، پاشان حجاج بەڕەڵلای کرد و مەیموونیش – بەسەلامەتی دەروچو [1].

---

( ١) عقلاء المجانين، لاپەڕە (١٩٤)، (١٩٩) بەدەستکاریەوە




## ٣٨٦- شێخ عبدالقادر گیلانی وخەلیفەی مقتفی لامر الله

## ئەوەیە ئازایەتی ونەبەزی وتاربێژان

دەڵێن: شێخ عبدالقادری گیلانی – ڕەحمەتی خوای لێ بێت، جارێکیان بەسەر مینبەرەکەی کەوت و وتاری خوێندەوە لەو وەتارەی دا زۆر بە توندی موحاسەبەی خەلیفەی عباسی – مقتفی لامر الله کرد و وەزۆر سەرزەنشتی کرد لەسەر ئەوەی کە یحی ی کوڕی سعیدی ناودار بە – ابن المزاحم –ی ستەمکاری کردووە بە قازی و داوەری خەڵك گوتی: گوێ بگرە ئەی خەلیفە تۆ ستەمکارترین ستەمکارت کردووە بەگەورەی موسڵمانان، بەیانی وەڵامت چییە لەلای خوای – رب العالمین– کەوا ئەو – ارحم الراحمین–ە

دەڵێ: لەوکاتەدا خەلیفە لەبەر قسە بەسام و پڕ حیکمەتەکانی گیلانی زۆر ترسا و دەست بە جێ ابن المزاحم–ی عەزل کرد ولە گەورایەتی دایبەزاند[١].

## ٣٨٧- نەیزانی کێ قەرزی بۆ داوەتە خاوەنەکەی

محمدی کوڕی عیسی دەڵێ: عبدالله ی کوڕی مبارك زۆر دەرچووە طرسوس و لە شاری – الرقە –ی باکووری سوریاش دادەبەزی و لەوێ گەنجێکی لێ بوو زۆر خزمەتی دەکرد بەدوایدا دەڕۆیشت و پێداویستەکانی بۆ

---

(١) قصص الصالحین، لاپەڕە (١٥٨)



هەڵدەگرت وفەرموودەی لێ دەبیست جارێکیان هاتە ئەوێ بەڵام ئەوجارە ئەو گەنجەی نەبینی بەپەلە ویستی بگەڕێتەوە لەگەڕانەوەکەیدا گوتی: کوا ئەو گەنجەی کە پێشتر زۆر لەلام دادەنیشت، گوتیان، دەهەزار درهم قەرزدار خاوەنەکەش لە بەندیخانەی کردووە لەسەر ئەو پارەیە، گوتی: وەرن ئەو پیاوەم پێ نیشان بدەن – خاوەن قەرزەکە – دەهەزار درهەمی بۆ ژمارد و سوێندی پێ خوارد کە تاکو ماوە بەهیچ کەسێ نەڵێ، پیاوەکەش گەنجەکەی بەرەڵلاکرد عبداللەی کوڕی مبارک بەشەو بەڕێ کەوت لەڕێگادا گەیشتە گەنجەکە لە نزیکەی دوو قۆناغ لە – الرقە– دوور بوو، گوتی: ها ئەی گەنج ئەوە لەکوێ بوویت نەمبینی؟ گوتی لەبەر قەرداری بەند کرابووم.

گوتی: ئەی چیت کرد ڕزگارت بوو لەو قەرزە؟

گوتی: بەڵێ پیاوێك هات قەرزەکەی بۆ دامەوە نەمزانی کێ بوو.

ابن المبارك گوتی: کەواتە سوپاسی خوا بکە

ئینجا دەڵێن ئەو گەنجە نەیزانی کە ابن المبارك قەرزی بۆ داوەتەوە تاکو لە ژیان مابوو هەرکە ابن المبارك وەفاتی کرد خەڵکی پێیان گوت کە ئەو قەرزی بۆت دایەو [1].

---

( ١) موسوعە الحقوق الاسلامیە – محمود المصری بەرگی (٢) لاپەڕە (٧٠٦)




## ٣٨٨- كێ لە حاتەم سەخی ترە؟

پیاوێك لە حاتم ی طائی پرسی، گوتی: ئەی حاتم كێ لە تۆ سەخی ترە ئایا كەس لە تۆ زیاتر ماڵی بەخشیوە؟ گوتی: بەڵێ منداڵێكی هەتیو لە (طَي) چوومە ماڵی كەدە سەر مەڕو بزنی هەبوو، هەستا یەكیانی گرت و سەری بڕی وگۆشتەكەی پاك كردەوە هێنای لەبەردەم منی دانا، وئەوەی كە بۆی هێنام لە گۆشتەكە دەماغی مەڕەكە بوو منیش خواردم زۆرم پێ خۆش بوو،، گوتم: بەخوا خۆشە، چووە دەرێ یەك یەكەی سەربڕین و دەماغەكەشی بۆ من هێنا منیش ئاگام لە هیچ نییە، هەستام برۆم دەبینم دەوری ماڵەكە خوێنێكی یەكجار زۆری لێ ڕژاوە، هەموو سەرەمەڕوبزنی سەربڕی بوون، پێم گوت: بۆچی وات كرد؟ گوتی: سبحان الله، شتێكت پێ خۆش بێ كە هەمبێ چۆن ڕەزیلی پێ دەكەم لەسەرت بەڕاستی شتێكی عەیبە و شوورەییە بۆ عەرەب، گوتیان ئەی حاتم چیت لە جیاتی پێ بەخشی؟ گوتی: ٣٠٠ وشتری سوورو (٥٠٠) سەرمەرو بزن گوتیان كەواتە تۆ سەخی تری گوتی: نەخێر ئەو چونكە ئەو هەمووی هێنایە مەیدان، بەڵام من كەمێكم لە ناو زۆرهێناوە [1].

---

(١) موسوعة الحقوق الاسلامية – محمود المصري بەرگی (٢) لاپەڕە (٧٠٨)



## ٣٨٩- ابو امامە وخێر وچاکەکەی

عبدالرحمن ی کوڕی یزیدی کوڕی جابر دەگێڕێتەوە دەڵێ :

خزمەتکارەکەی ابو امامە بۆی گێڕامەوە گوتی :

بەڕاستی ابو امامە زۆر حەزی بە خێرو چاکە دەکرد ومالی زۆر بۆ کۆدەکردەوە هەر سوالکەرێك داوای لێ بکردایە بە پیازێکیش بایە یان بە دەنکە خورمایەك وەلامی دەدایەوە

ڕۆژێك سوالکەرێك هاتە لای ئەویش تەنها سێ دیناری لەلابوون دینارێکی پێ دا، یەکێکی تریش هات دینارێکی بەویش دا، پاشان سوالکەری سێ یەم هات دینارێکی بەویش دا و هیچی لەلانەما.

دەڵێ: منیش زۆر تووڕە بووم گوتم: هیچت بۆمان نەهیشت

دەڵێ: سەری خۆی دانا و نووست کاتێ بانگی عەسری فەرمووی بەخەبەرم هێنا وهەستا چو بۆ مزگەوت و زۆریش بەزەییم پێدا هاتەوە چونکە بەڕۆژووبوو، بەهەر حالْ هەندێ پارەم قەرز کرد بۆم کردە خواردنی ئێوارە، وەهەندێکیشم زەیت بۆ چراکەی کڕی وپێم داگیرساند، چوومە سەر جێگاکەی بۆ ئەوەی بۆی ڕێك بخەم دەبینم لە ژێر سەرینەکەی چەند زێڕێکی تێدایە یەکسەر ژماردم سێ سەد دیناری زێڕبوو، لە دڵی خۆم گوتم: بۆیە ئەو کارەی کرد وادیارە متمانەی بە من هەیە بۆیە بەجێ هێشت لە مالێ، دوای نوێژ گەڕایەوە مالْ کەبینی سفرەی نان خواردن ڕازاوەتەوە چرا داگیرساوە پێکەنی وگوتی: ئەو چاکەیە کە لەلای ئەو هاتووە، واتە: ئەوەی پاداشتی




چاکەکە بوو.

خزمەتکارەکە دەڵێ: لە لای بووم تاکو نانی خوارد وپاشان پێم گوت: ڕەحمەتت لێ بێ ئەو پاریەت هەبوو بۆ چی پێت نەگوتم تاکو بۆت خەرج بکەم گوتی: پارەی چی؟ ! هیچم بەجێ نەهێشتبوو تەنها سێ دینارەکە ئەویشم کرد بەخێر

دەڵێ: سەرچەفەکەیم هەڵدایەوە لەسەر جێگای کەبینی زۆر سەرسام دڵ خۆش بوو، منیش هەستام وزنارەکەم لە پشتم کردەوە و دەست بەجێ موسلمان بووم، (وادیارە ئەو خزمەتکارە مەسیحی یان مجوسی – ئاگر پەرست بووە)، بۆیە زناری لە پشتی بەستاوە بەو کارەش تەواو تاسا و کاری تێکرد

ابن جابر دەڵێ: ئەو خزمەتکارەم بینی لە مزگەوتی (حمص)ی شام وانەی قورئان وفەرمودە و وانەکانی میراتی بەخەڵکی دەگووت، وەخەڵکی لەسەردەستی ئەو شارەزا دەبوون لە ئایین (١).

## ٣٩٠- چوار دوعا بەچوار درهەم

ڕۆژێکیان پیاوێکی سەرخۆش بانگی هاوڕێو دۆستانی کرد کەلەگەڵی دانیشتن بەمەبەستی کەیفو خۆشی وشادی پاشان بانگی خزمەتکارەکەی کردو چوار درهەمی دایە دەست وپێی گوت بڕۆ لەبازاڕ هەندێ خواردن

(١) موسوعە الحقوق الاسلامیە، محمود المصری بەرگی (٢) لاپەڕە (٧١٠)






میوەبکرە بۆمان، ئەویش چوو لەرێگادا بەلای (منصوری کوڕی عماری زاهید)دا تێپەڕی و گوێ ی لێ بوو دەیگوت: کێ چوار درهەم دەدا بەفەقیرێکی غەریب چوار دوعای بۆ دەکەم،خزمەتکارەکەش هەرچوار درهەمی دایە دەست، منصور گوتی چ دوعایەکت بۆ بکەم، خزمەتکارەکە گوتی: بەڕاستی من گەورەیەکی زۆر دڵ رەق و توندم هەیە دەمەوێت لەدەستی خەلاس بم وئازادم بکات.

دووەم: دەمەوێت خوای گەورە ئەو چوار درەهەمم بۆ بنێرێتەوە.

سێیەم: خوای گەورە تۆبە لەگەورەکەم وەرگریّو واز بێنێ لەو خراپەو تاوانبارییە.

چوارەم: خوای گەورەلەمنو لەگەورەکەم و لەهەموقەومو کەسی کاریو لەتۆش خۆش بێ.

منصوری کوڕی عمار دوعای بۆ کرد و ڕۆیشت، خزمەتکارەکەش هاتەوە لای گەورەکەی کەزۆر ئازاری دا خۆی لێ زویر کرد لە بەر دواکەوتنی

لە هاتنەوەی وپێ ی گوت: بۆچی دواکەوتی کوا میوەکان؟

ئەویش ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە کە چۆن منصور دوعای کرد بۆیان و وەپارەکەی پێ دا بەرامبەر بە چوار دوعایەکان، گەورەکە تووڕەیی دامرکاو وهێور بوەوە گوتی: دوعای چی بۆ کردیت؟

خزمەتکارەکە گوتی: یەکەم جار داوام کرد کە لە بەندایەتی وکوێلایەتی






ڕزگارم بێ، گوتی: ئەوە ئازادم کردیت وڕزگارت بوو لە پێناوی خوا، دووەمیان، گوتم: خوا چوار درهەمم بۆ بنێرێتەوە، گووتی: ئەوەش چوارهەزار درهەم بۆ خۆت، چوارهەزار درهەمی پێدا.

سێیەمیان: خوای گەورە هیدایەتت بدات و تۆبە بکەیت، دەڵێ: سەری هەژاندو گریا و بەدەستی خۆی کووپی عەرەقەکەی ڕژاندو شکاندی پاشان گوتی: ئەوا تۆبەم کردو و پەشیمان بوومەوە لەوکارە.

چوارەمیان: گوتی: خوا لە تۆ و گەورەکەت وهەموو قەومەکەی لە منیش خۆش بێ، گەورەکە گوتی: ئەمە پەیوەندی بەمنەوە نییە پەیوەندی بەو خوایەیە کە غفور رەحیم-ە کاتێ ئەو شەوە گەورەکە خەوی لێ کەوت وگوێ لەدەنگێك بوو بانگی کرد تۆ شتێکی ئەوهات کرد لەلای خۆت ئایا وا گومان نابەیت کە ئێمە شتێکی ئەوها ناکەین بزانە خوا لە تۆ و خزمەتکارەکە و منصور و هەموو ئامادەبوان خۆش بوو [1].

## ٣٩١- چاکە کردن لەگەڵ خەڵك دا هۆکاری بەختەوەرییە.

ڕۆژێکیان عبدالله یکوڕی مبارك بەلای کاروانێك دا تێپەڕی بەمەبەستی حەج کردن بینی ئافرەتێك واخەریکی خواردنی گۆشتی قەڵە رەشێکی مردارەوە بووە، لەسەر شوێنێکی پیسی هەڵگرتۆتەوە،ئەویش

( ١) السلسلة الذهبية، محمود المصري / بەرگی (٣) لاپەڕە (٥٠٢)






خزمەتکارەکەی نارد بەشوێن ئەو ئافرەتەو پرسیاری لێی کرد کەبۆچی ئەو ها دەکەیت

ئافرەتەکەی گوتی: ئەوە لەوەتەی سێ ڕۆژە هیچمان نییە تەنها ئەوە نەبێ کە بیخۆم وخۆمی پێ ڕزگار بکەم لە مردن، عبداللەی مبارکیش فرمێسك لە چاوانی هاتە خوار و فەرمانی کرد کەوا ئەوەی لەناو کاروانەکەیدایە هەموی دابەش بکەن بەسەر ئەو گوندە، ئینجا گەڕایەوە ئەو ساڵە حەجی نەکرد، لەخەودا بینی کەسێك پێی گوت – حج مبرور وسعی مشکور، وذنب مغفور – ئەمە دوعای کەسێکە دەیکات بۆ ئەو کەسەی کە لە حەج گەڕابێتەوە، واتە حەجێکی پڕ خێرو چاکە وەرگیراو، ماندوو بوونێکی سوپاسکراو، گوناهێکی لێبوردراو[1] کەواتە خێرو پاداشتی حەجەکەی بۆ نووسرا لەلای خوا والله اعلم.

## ٣٩٢- ئیتر لەمەودوا تۆ ئازادی

پیاوێکی گەورە خاوەن پلە و پایە ڕۆژێکیان بانگی خزمەتکارەکەی خۆی کرد کە خواردنێکی بۆ دروست بکات تاکو هاوڕێ و دۆستانی بۆ بانگهێشت بکات.

خزمەتکارەکەش دەستی کرد بە ئامادەکردنی سفرە، کاسەیەکی هێنا کەشلەیەکی گەرمی تێدابوو، خزمەتکارەکە لە ڕێگادا قاچی هەڵکەوت هەندێ

---

(١) السلسلة الذهبية / محود المصری، بەرگی (٣) لاپەڕە (٥١٦)






لەشلەکە ڕژایە سەر جل و بەرگی پیاوە گەورەکە، زۆر تووڕە بوو فەرمانی دا کە بەدەستی پاسەوانەکان لە گەردنی بدەن، کاتێ خزمەتکارەکە بینی کە سوورە لەسەر کوشتنی ئەویش تەواوی شلەکەی ڕژاند بەسەر جل و بەرگی گەورەکەی دا، ئەوجارە زیاتر هەڵچوو وتوڕە بوو گوتی: هەی لە ناوبچی ! بۆ وادەکەی!! خزمەتکارەکە گوتی: لەبەرخاتری تۆم ئەو کارە کرد ترسام سومعەی تۆ بشکێ تاکو خەڵکی نەڵێن خزمەتکارەکەت لەسەر هەڵەیەکی بچوك کوشت ویستم تاوانێك ئەنجام بدەم کە پاشان بمکوژی تاکو تاوانبارت نەکەن بەستەمکار، پیاوە گەورەکە بیری کردەوە لە قسەکانی ئەم خزمەت کارەی، ئینجا لای کردەوە بەلای خزمەتکارەکەدا گوتی ئەوا لێت خۆش بووم لەبەرئەوەی زۆر جوان بۆزشت هێنایەوە بۆم، ئیتر برۆ تۆ ئازادی لەمەودوا(١).

## ٣٩٣- زانایان وسەر دەمی عیزەت وگەورەیی

دەگێڕنەوە کە هیشامی کوری عبدالملك هاتە مەکەی پیرۆز بەمەبەستی حەج کردن، کاتێ چووە مزگەوتی حەرام لەمەکە گوتی: یەکێ لە هاوەڵانم بۆ بێنن، گوتیان: ئەی امیر المؤمنین هاوەڵان نەماون و کۆچییان کردووە، گوتی: با تابعین بن، دەڵێ: زانای گەورە پایەدار طاووس ی – الیمانی– یان بۆ هێنا، کاتێ طاووس هاتە لای پێڵاوەکانی لەبەرکردو لەسەر پارچە بەرەکەی خەلیفەی دانیشت، نەبە امیر المؤمنین نەبە ابو فلانیش سلامی

---

(١) چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان، لاپەڕە (٣٥٧)



نەکرد لێ بەڵکو گوتی: ئەی هیشام چۆنی؟ وەبەبێ پرسی لەتەنیشتی دانیشت، خەلیفە بەمە زۆر تووڕەبوو تاکو دەڵێن خەیاڵی کوشتنی کرد بەڵام پیاوانی خەلیفە گوتیان: ئەی امیر المؤمنین تۆلە حەرەمی خوای لە حەرەمی پێغەمبەریت (ﷺ) چۆن شتی وادەکەیت وئەوە نابێ، خەلیفە گوتی: پێم بلێ ئەی طاووس بۆ چی ئەو ڕەفتارەت لەگەڵ کردم؟

طاووس گوتی: چیم کردووە؟

خەلیفە گوتی: پێڵاوەکانت لەسەر پارچە بەڕەکەم داکەناند وسەلامت لێ نەکردم بە امیر المؤمنین ناوم بلێ وەبە کونیەکەی ابو فلانیش ناوت نەهێنام و بەبێ پرسم هاتی لە تەنیشتم دانیشتی وگوتت: هیشام چۆنی.

طاووس زۆر بە بوێری ونەبەزی، یەکە یەکە، وەلامی قسەکانی خەلیفەی دایەوە گوتی: سەبارەت بە داکەندنی پێڵاوەکانم لەسەر پارچە بەڕەکەت ئەوا بزانە کە من ڕۆژی پێنج جار لەبەرامبەر خوای خاوەن هێزو دەسەلات دایدەکەنم و لێشم تووڕە نابێ وئازاریشم نادات دەسەبارەت بەقسەی تۆ کە دەڵێی – یا امیر المؤمنین – ئەوا هەموو ئیمانداران بە گەورێتی وخەلافەتی تۆ ڕازی نین منیش لەوەترسام کە بڵێم ئەی امیر المؤمنین تووشی درۆ ببم هەروەها کە گوتت بە ابو فلان وفلانت بانگت نەکردووم ئەوا زۆر ئاسایی یە چۆنکە خوای پەروەردگار لە قورئاندا بەناوی خۆی بانگی پێغەمبەرانی کردووە ابو فلانیشی بۆ دانەناون وەکو – یاداود– – یا یحی– یا عیسی– هتد– هەروەها ابو فلان و کونیەی بۆ دوژمنی خۆشی داناوە وەك دەفەرموێ




(تبت يدا ابى لهب وتب) سەبارەت بە قسەکەت کە گوتت لە تەنیشتم دانیشی پرست نەکرد، ئەوا بیستومە لە ئیمامی علی کوڕی ابو طالب کە دەفەرمویٚ، ئەگەر دەتەویٚ سەیری کەسیٚ بکەیت کە ئەهلی دۆزەخ بێت، ئەوا سەیری کەسێك بکە کە دانیشتبیٚ وخەڵکیش لە دەوری بە پێوە وەستابن.

خەلیفە گوتی: ئەی طاووس ئامۆژگاریم بکە.

طاووس فەرمووی، گوێم لە ئیمامی علی کوڕی ابو طالب بووە کە دەیفەرموو لە دۆزەخدا هەندیٚ مارودووپشکی گەورەی تێدایە وەك ئێستروان بەهەموو ئەو گەورە و ئەمیروکار بە دەستەوە دەدەن کە دادپەروەری ناکەن لەگەڵ ڕەعیەت و جەماوەریان [1].

## ٣٩٤- وشەی حەق لە هەموو شتێك گران بە هاترە

دەگێڕنەوە کە ابو غیاث ی زاهید لە ناوچەی بۆخارا لە نێو گوڕستان دەمایەوە، ڕۆژێکیان هاتە ناو شار بەمەبەستی سەردانی کردنی برایەکی، خەزمەتکارەکانی ئەمیر (نصرت احمد) لەوکاتەدا لەگەڵ چەند کەسێکی گۆرانی بێژو موسیقاژەن و کەسانێکی دنیاویست دەردەچوون لە ماڵی ئەمیر ئەو ڕۆژەش ڕۆژی میوانداری ئەمیر بوو، کاتیٚ ابو غیاث ی الزاهید ئەوانیٚ بینی گوتی: لەدڵی خۆی، ئەگەر ئەمڕۆکە خۆت بیٚ دەنگ بکەیت لەوانە ئەوا بەشدار دەبیت لە گوناهیان باشتر وایە بیٚ دەنگ نەبم، بۆیە سەری

(١) السلسلة الذهبية/ محمود المصري، بەرگی (٣) لاپەڕە (٥٥٤)



بەرزکردەوە بەرەوئاسمان گوتی: بەیارمەتی خوا ودەستی دایە عەساکەی خۆی بەرەو لایان چوو هێرشی کردنەسەر یەکەیەکەی بەبەر عەسای دەکەوتن دەرئەنجام هەموویان هەلاَتن چوونە مالّی ئەمیر (نصرت) بەسەر هاتەکەیان گێڕاوە بۆی گوتی: بۆم بانگ بکەن، کە بانگیان کرد هاتە لای ئەمیر وپێی گوت:

ئایا نەتزانیوە هەرکەسێ بەوشێوە هێرش بکاتە سەر ئەمیرو دەسەلاَتدار ئەوا لە بەندیخانە خۆراکی پێ دەدرێت؟ ما اقبح هذا الکلام...؟!

ابو غیاث: ئایا تۆش نەتزانیوە هەرکەسێ هێرش بۆ خودا بێنی لە دۆزەخدا خۆراکی پێ دەدرێ؟ ما اجمل هذا الکلام...؟!

ئەمیر: جا خەلیفە منی کردووە بەگەورە و ئەمیری ئەو خەلّکە .

ابو غیاث: بەلاَم خوای خەلیفە منی کردووە بە بانگەوازخوازی ئەمرو نەهیی.

ئەمیر: کەواتە دەتکەم بەوالی ئەمرونەهی لە شاری سمرقند

ابو غیاث: لەوگەورایەتیە و دەسەلاَتەدا خۆم دابەزاند واتە نایکەم

ئەمیر: سەیرە کاری بانگەوازی دەکەیت کە فەرمانت پێ نەکراوە و خۆشی لێ بەدوور دەگریت کە فەرمانت بێ دەکەم

ابو غیاث: لە بەرئەوە ئەگەر تۆ من بکەی بەگەورە و والی خەلك، ئەوا ڕۆژێك دێت دامدەبەزینی، بەلاَم ئەگەر خوا بمکات بە والی کەس ناتوانێ




دامبەزێنی لە ویلایەت جگە لە خوا

ئەمیر: پێداویستیت چییە داوابکە

ابو غیاث: پێداویستیم ئەوەیەکە بمکەیتەوە گەنج وەکوو جاران

ئەمیر: ئەوە بەدەست من نییە، شتێکی تر داوابکە

بو غیاث: نامەیەك بنێرە بۆ – مالك–ی گەورە فەرمانبەری دۆزەخ کە ئازارم نەدات

امیر: ئەوەشیان بە دەست نییە، شتێکی تر داوابکە

ابو غیاث: نامەیەك بۆ –رضوان–ی گەورە فەرمانبەری بەهەشت بنێرە بەڵکو دەمباتە بەهەشت

ئەمیر: هەروەها ئەوەشیان بەدەست من نییە

ابو غیاث: کەواتە هەمووی لەدەست ئەو خوایەدایە کە خاوەنی هەموو پێداویستیەکانە، هەرکە داوایەکی لێ دەکەم ڕەت دانەوەی نییە دەست بەجێ وەڵامم دەداتەوە

– ئینجا ئەمیر وازی لێ هێناو بەڕەڵای کرد[١].

---

(١) السلسلة الذهبية/محمود المصري، بەرگی (٣) لاپەڕە (٥٥٥)






## ٣٩٥- دەرمانی هەموو دەردان تێکەڵاوە لەشەش شتان

خاوەنی کتێبی (الفرج بعد الشده) دەڵێ :

یەکێك لە دانایان – الحكماء– تووشی بەڵاو نەهامەتییێك هاتبوو، دۆستان وهاوڕێیان چوونە سەردانی بەمەبەستی دڵدانەوەی وەسەرە خۆشی لێ کردنی، بەڵام حكیم پێی گوتن: من دەرمانی ئەو دەردەم دۆزیتەوە لە تێکەڵاوی شەش شتی زۆر گرنگ گوتیان: ئەی دانا چییە؟

گوتی: تێکەڵاوی یەکەم: متمانە بوونەبەزاتی خوای گەورە،

دووەم: شارەزابوونم بەوەی کە هەرشتێ خوانەخشەی بۆ دانابێ دەبێ ئەوشتە ڕووبدات.

سێ یەم: سەبر و ئارامگرتن باشترین شتە کە تاقی کراوەکان بەکاری بێنن.

چوارەەم: ئەگەر خۆڕاگر نەبم چی بکەم؟ وەبەشینو واوەیلاهاوکاری نەفسم ناکەم

پێنجەم: دەگونجێ کە من لە خراپترین بەڵادابم لەوەی کە ئێستا تێیداوم.

شەشەم: کاتژمێر بۆ کاتژمێر لەدوای ناخۆشی ونەهامەتی دا خۆشی وشادی دێت، کەواتە پێویست بەو خۆ ئازاردانە ناکات و باشتروایە مرۆڤی خۆڕاگر بێت؟






## ٣٩٦- من هەرگیز نەخۆش نەکەوتووم

هیلالی کوڕی ئیساق دەڵێ: لە خزمەتی هاوەڵێ گەورە وڕێزدار (عماری کوڕی یاسر) بووین، باسی نەخۆشی و دەردو ئازارەکان کرا کابرایەکی ئەعرابی هەڵی دایەوە گوتی: دەنامن هەرگیز نەخۆش نەکەوتووم عمار فەرمووی: تۆ لە ئێمە نیت، چونکە بەڕاستی موسلمان کاتێ تووشی بەلاو ناخۆشی دێت گوناهی لێ هەلدەوەرین وەك چون گەڵا لەدار هەلدەوەرێ، بەلاّم پیاوی خراب ودڵ ڕەق کاتێ تووشی بەلاّو ناخۆشی دێت وەکوو وشتر وایە ئەگەر بەڕەڵلا کرا نازانێ بۆچی بەڕڵلا کراوە، وەئەگەر بەسترایەوە نازانێ بۆچی بەستراوەتەوە[1].

## ٣٩٧- نیعمەت و موصیبەت

سوفیانی – الثوري– دەڵێ: لە پێشتر دەیانگوت: ئەو کەسەی بلاّو نەهامەتی بە نیعمەت نەزانی وەخۆشی و شادی ولەش ساغیش بە بەلاّی گەورە و نەهامەتی نەزانی ئەوا پیاوێکی شارەزاو زانانی یە[2].

---

(١) السلسلة الذهبية/ محود المصري بەرگی (٣) لاپەڕە (٥٧١)

(٢) عدة الصابرين وذخيرة الشاكرين، ابن القيم، لاپەڕە (١٠٣)



## ٣٩٨- بەهەزاران نیعمەتت لەلا هەیە ئینجا داوادەکەیت

پیاوێك هاتە لای یونس ی کوڕی عبید باسی کوورتی دەست وباڵی دەکرد لە ژیانیدا، دەیگووت: حاڵ و وەزعم زۆر تەنگ و ناخۆشە.

یونس پیٚ ی گوت: ئایا پێت خۆشە کە لە جیاتی چاوەکانت سەدهەزار درهەمت بدەنیٚ؟ گوتی: نەخێر

گوتی: ئایا پێت خۆشە لە جیاتی قاچەکانت سەدهەزار درهەمت بدەنیٚ

گوتی: نەخێر

ئینجا دەڵیٚ: هەندیٚ لە نیعمەتەکانی خوای بەسەر خۆی ئەژمار کرد

گوتی: ئەوەندەی پیٚ بەخشیوم...

یونس گوتی: کاکی برا دەبینم بەهەزاران هەزاران نیعمەتت بەسەرڕدا ڕژاوە ئینجا باس لە فەقیری و دەست کورتی خۆت دەکەیت.

## ٣٩٩- کەواتە سوپاسگوزای خوا ئاسانترە لە پاداشت دانەوەی خەڵك

عبدالله کوڕی ابو نوح دەڵیٚ: پیاوێك لەسەر کەناری دەریا پیٚ ی گوتم: چەندە ڕەفتارەت کردووە لەگەڵ خوا بەوەی کە پیٚ ناخۆشە، وەئەویش ڕەفتاری لەگەڵت کردووە بەوەی کە پێت خۆشە؟

منیش گوتم: لەبەر زۆری ئەژمار ناکرێت، گوتی: ئایا لە هەر شتیٚ کە




خوا ناخۆشی بۆ ناردوویت واتێگەیشتوویت کە خەجالەتت دەکات؟

گوتم: نەبەخوا،بەڵکو چاکەی لەگەڵم کردووە ویارمەتی داوم.

گوتی: ئایا داوای هیچ شتێکت لێ ی کردووە کە پێ نەدابێت؟

گوتم: جا چی لێ قەدەغە کردووم تاکو داوای لێ بکەم؟ داوای هەر شتێکم کردبێ پێ بەخشیوم وەهەر کاتێ داوای یارمەتیم لێ کردبێ بەهانام هاتووە

گوتی: وئەگەر هەندێ لە ئادەمیزاد ئەو جۆرە چاکە و یارمەتیانەیان لەگەڵدا بکردایە چۆن پاداشتت دەدانەوە ئایا دەتوانی پاداشتیان بدەیتەوە؟

گوتم: هەرگیز پاداشتی ئەوانم پێ نەدەدرایەوە

گوتی: دەکەواتە خوای تۆ ئەولاترە لەوەی کە خۆت ڕابێنی لەسەر سوپاسکردنی لەسەر ئەو هەموو نیعمەتە زۆرانە کە ئەو بەڕاستی لە کۆن و تازەدا هەر چاکە کارە لەگەڵت، سوێند بەخوا سوپاسگوزاری ئەو ئاسانترە لە پاداشت دانەوەی خەڵك لەسەر چاکەکانیان بەرامبەرت، چونکە بەراستی خوا بە سوپاسکردن و شوکر لەسەر نیعمەت ڕازی یە لەبەندەکانی [1].

---

(١) عدة الصابرين،ابن القيم، لاپەڕە (١٦٠)






## ٤٠٠- چاکبوونەوەت بەرامبەر بە ئازاری دەماری ئەستۆتە

هەواڵی وەهب دەڵێ: پیاوێك پەنجا ساڵ خوا پەرستی کرد، خوای گەورە خەواڵی پێدا کە لیّ ی خۆش بووم،

خوا پەرستەکە گوتی: ئەی خوایە جا من چ تاوانم هەبوو کە لێم خۆش بێت؟

خوای گەورە فەرمانی کرد کە دەماری ملی تووشی ئازارێك بێت نەخەوی لیّ بکەوێت وەنە نوێژیشی پیّ بکرێت پاشان چاکبوەوە ونوست فریشتەیەك هاتەلای وگوتی: ئازاری ملم زۆرە وحەوانەوەم نییە فریشتەکە گوتی: خوای تۆ دەڵێ: عیبادەت وخواپەرستی ئەو پەنجا ساڵەت بەرامبەر بەو چاکبوونەوەیە لەو ئازار و نەخۆشیەت [1].

کەواتە بە کردەوە چاکەکانت لە خۆبایی مەبە، هەمیشە زیاتر نیعمەتەکانی خوا بێنە پێش چاوانت، بەرامبەریان بکە بە یەکتر، ئایا کامیان بەهایان زیاترە...؟!

---

(١) عدة الصابرين، ابن القيم، لاپەڕە (١٦١)



## ٤٠١- کەمترین نیعمەت

حەزرەتی دادو گوتی: ئەی خوایە کەمترین وبچوکترین نیعمەتت چی یە بەسەرم؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەی داود هەناسەم هەڵکێشە: ئەویش هەناسەی هەڵکێشا، فەرمووی ئەوە کەمترین نیعمەتەکانی منە بەسەرت ئەی داود(١).

## ٤٠٢- ئەوانیش دوژمنی منن

مالکی کوڕی دینار دەفەرموێ :

خوای گەورە نیگای (الوحی) هێنا بۆ یەکێك لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلی فەرمانی پێکرد کە بە قەومەکەی بڵێ: نەچنە ئەو شوێنانەی کە دوژمنم دەچنە ئەوێ، وەئەو بەرگ و پۆشاکەش لەبەرنەکرد کەوا دوژمنم دەیپۆشن، وەسواری ئەو وڵاغەش نەبن کەوا دوژمنم سواری دەبن، هەروەها ئەو جۆرە خواردنانەش نەخۆن کە دوژمنم دەیخۆن، ئەگەر وابێ ئەوا ئەوانیش دوژمنی منن، وەك ئەوان(٢).

---

( ١) عده الصابرين ابن القيم، لاپەڕە (١٦١)

( ٢) الزواجر عن اقتراف الكبائر، ابن حجر الهيثمي/ بەرگی (١) لاپەڕە (٣٠)

## ٤٠٣- ئامۆژگاریەکانی وەیسُ القرنی

**یعقوبی قاریئ دەڵێ:**

**پیاوێکی ڕەش ئەسمرم بینی لە خەومدا کە باڵایەکی بەرزی هەبوو، وەخەڵکی بەدوایدا دەڕۆیشتن گوتم: ئەوە کێیە؟**

**گوتیان: ئەوە وەیسُ القرنی یە، بەدوای کەوتمو وپێم گوت: ئامۆژگاریم بکە ڕەحمەتی خوات لێ بێت، ئەویش ڕووی لێ وەرگێڕام، گوتم: ڕینومایم دەوێت ڕێنومایم بکە، خوا ڕێنماییت بکات، ئینجا بەرولام هات و گوتی: لەوکاتەی خوا پەرستی دەکەیت ئومێدت زۆر بێ بەلوتفی و بەبەزەیی خوا، بەلاّم لە کاتی بێ ئەمری کردنی خوا ئاگات لە تووڕەیی ئەو هەبێو وریابە لێ ی، لەوەش هەرگیز ئومێدت مەپچڕێنە، پاشان وازی لێهێنام و ڕۆیشت.**

**هەروەها لە تەورات هاتووە کە خوای گەورە دەفەرمووێ :**

**ئەی بەنی ئیسرائیل من ئێوەم خۆش دەویست، بەلاّم هەرکاتێ تاوانتان کرد ڕقم لێیان بووەوە[1].**

(١) الزواجر عن اقتراف الکبائر ابن حجر الهیتمی / بەرگی (١) لاپەڕە (٣١)

## ٤٠٤- تاوانە بچووکەکان بە کەم مەزانن

سلیمانی کوڕی عبدالجبار دەڵێ :

تووشی گوناهێك بووم منیش زۆرم بەکەم سەیر کرد وگوتم هیچ نییە شوێنەواری دەڕوات لەسەرم، بەڵام لە خەومدا بینیم یەکی پێم دەڵێ: هیچ گوناهو تاوانێك بەکەم مەزانن ئەگەر بچووکیش بێت، چوونکە ئەو بچووکەی ئەمرۆکەت بەیانی لەلای خوا گەورەدەبێ[1].

## ٤٠٥- چاکەکردن لەگەڵ هەتیو دا

یەکێك لە پیاو چاکانی پێشوو (السلف الصالح) دەفەرمووێ: سەرەتا پیاوێکی سەرخۆش ومەی خۆر بووم وگوناهو تاوان لەگەڵ خوێنم تێکەڵ بو، رۆژێکان کوڕێکی هەتیوو بێ باوکم بینی بەزەییم پێدا هاتەوە و زۆر ڕێزم لێی گرت وچاکەم لەگەڵ کرد زیاتر لەوەی باوك بۆ کوڕی دەکات، پاشان لە خەومدا بینیم فریشتەکان دۆزەخ (الزبانیە) بە منیان گوت و ویستیان فڕێمدنە ناو دۆزەخ لەناکاو دەبینم کوڕە هەتیوە کە بەرگری لێم کرد و گوتی: وازی لێ بێنن تاکوو قسە لەگەڵ خوا دەکەم وکارەکەی بۆ ئاسان دەکەم، ئەوانیش هەر سووربوون لەسەر قسەیان، لە ناکاو بانگێك هات: وازی لێ بێنن ئێمە لێ خۆش بووین بەهۆی چاکەی لەگەڵ ئەو کوڕە هەتیوە، لەوخەوە هەستام زۆر زیاتر لەوە ڕێزی هەتیوم کردو چاکەم لەگەڵی کرد لەوەتەی ئەوڕۆژە[2].

---

( ١) الزواجر عن اقتراف الكبائر، ابن حجر الهيتمي، بەرگی(١) لاپەڕە (٣٢)

( ٢) الزواجر عن اقتراف الكبائر، ابن حجر الهيتمي بەرگی (١) لاپەڕە (٥٤٧)




## ٤٠٦- جگەر گۆشە

پیاو چاکێك چەند جارێك كە منداڵیان دەبێت بۆیان نامێنیت ودەمرێت هەركە منداڵیان دەبێت دڵخۆش دەبێت پێی، بەڵام پاش ماوەیەك وەفات دەكات وپیاوەكەش زۆر دڵگران دەبێت، بەڵام بەهۆی بەهێزی ئیمانی یەوە ئارام دەگرێت لەسەر ئەو ناڕەحەتی یە دەڵێ: (لله ما اعطى وله ما اخذ، اللهم اجرني في مصيبتي واخلفني خيرا منها) واتە: ئەوەی خوای گەورە دەیبەخشێت و دەیباتە وەهی خۆیەتی، خوایە گیان لەسەر ئەو ناڕەحەتیەم پاداشتم بدەرەوە ولەمە باشترم پێ ببەخشە)

تا منداڵی سێ یەمیان دەبێت، دوای چەند ساڵێك منداڵەكەی نەخۆش دەكەوێت ونەخۆشیەكەی زۆری بۆ دێنێ، لەمەرگ نزیك دەبێتەوە باوكیشی بەدیاری یەوە فرمێسكی بۆ دەڕێژی، بۆ ماوەیەك خەو دەیباتەوە، لە خەویدا دەبێنێت كە قیامەت بەرپابووە.. ناڕەحەتیەكانی قیامەت هاتۆتە پێشەوە خۆی لەسەر پردی (صراط) دەبێنیتەوە كە بەسەریەوە دەیەوێت بپەڕێتەوە، بەڵام دەترسا بكەوێتە خوارەوە، كوڕی یەكەمی كە كردبوو هات بە دەمیەوە پێی گووت: باوكەگیان من یارمەتی دەرت دەبم، باوكیشی دەستی كرد بە ڕۆیشتن بەڵام دەترسا بەولادا بكەوێتە خوارەوە، كوڕەكەی تری هات بەدەمیەوە ئەویش لەولاوە دەستی گرت... پیاوەكە زۆر دڵشاد بوو، دوای ئەوە بۆ ماوەیك بەسەر (صراط) دا ڕۆیشت هەستی بە تێنوێتێكی زۆر كرد داوای لەیەكی لە كورەكانی كرد كە ئاوی بۆ بێنن وتێنوێتی بشكێنن، یەكێكیان گوتی: ناتوانین ئەگەر یەكێكمان دەست بەردارت ببین دەكەویتە






ئاگرەکەوە، ئیتر ئێمە هیچمان پێ ناکرێت، یەکێکی تریان گوتی: باوکە ئەگەر برای سێ یەممان لەگەڵ مان بوایە، ئەوا تێنوێتی دەشکاندیت...!

پیاوەکە بە ترسەوە لە خەوەکەی ڕاچڵەکی وسوپاسی خوای کرد کە هێشتا لە ژیاندایە وقیامەت نەهاتووە پاشان لای کردەوە بەلای کوڕە نەخۆشەکەیدا کە لە پاڵیدابوو دەبینی گیانی ئەویش دەرچووە، هاواری کرد و گوتی: سوپاس بۆ خوا تۆ بوویت بە توێشوو پاداشت وەتۆ بویت بە ڕزگارکەری من لە قیامەت بۆیە مردنی ئەو منداڵەی لەسەر دڵی هێمن و ئارام بوو[1].

## ٤٠٧- ناپاکی... و... دەرئە نجامەکەی

چیرۆکەکەم لەوانە کەمێك سەیربێت.. من تەمەنم ٢٣ ساڵە لە قۆناغی چواری کۆلیژی بازرگانیدام پێنج ساڵە زەواجم کردووە پێشتر ژیانم بریتی بوو لە کێوێك لە گوناه، لە کاتێکیشدا کەژنم هەبوو، پەیوەندیم لەگەڵ ئافرەتانی تریشدا هەبوو، لەگەڵ ئەو ئافرەتانەیشدا دەچوومە دەرەوە، لە گوناهدا ئەگەوزاین بەبێ هەستکردن بەتاوان وترسان لە خوا..

من بیرم چووبوەوە یان لە بیرم کردبوو کە پەندێك هەیە دەڵێ: چی بچێنی ئەو دەدوریتەوە، من ئەو پەندەم بیستوە بەڵام هەستم بەهاکەی نەکردووە، ڕۆژێکیان بۆ زانکۆ دەچووم هەستم بە گۆڕانی سیمای ژنم کردبوو،

---

(١) چیرۆکەکانی ڕینمایی – عمروخالد/وەرگێرانی حسین محمود هەڵەبجەیی



گومانی بۆ دروست کردبووم هاتمە دەرەوە لە مال بەڵام پاش نیو سعات گەڕامەوە بۆ ماڵ دەبینم ژنەکەم بە تەلەفۆن لەگەڵ لاوێکدا باسی سۆزداری وخۆشەویستی دەکەن، هەمان ئەو تەلەفۆنەی کە من بەهۆیەوە پەیوەندیم دەکرد بۆیە وەك سوننەتێکی خوایی چیم چاند دوریمەوە..

خەریك بوو بیکوژم بەڵام خوای گەورە ڕەحمی بە من وبەئەو کرد بەتوندی گریام، پاش ماوەیەك چووم بۆ ماڵی باوکی تا تەڵاقی بدەم، بەڵام لەوێ هەڵوێستی خێزانم بە تەواوەتی گۆڕابوو، خێزانم پێی گوتم: لەمەودوا بەڕاستی تۆبە دەکەم ولە خوا دە ترسم ئەگەر تۆ لێم خۆشبیت ودوا فرسەتم بدەیتێ..

پاك وبێگەردی بۆ ئەو خوایە کە دڵخەکان دەگۆڕێت، سوێند بەخوا خێزانم ئێستا بەحەزو ئارەزوی خۆی نیقاب بالاپۆشی دەکات هیچ فەرزوسوننەتێك فەرامۆش ناکات وشەوونوێژیش دەکات وەمنیش هەروەها ئێستا خێزانەکەمان سوپاس بۆ خوا نموونەی دینداری وپابەندبوونە هەردوکمان پەیمانمان دا بە خوای گەورە کە هەرگیز نەگەڕینەوە بۆ سەرتاوان سوپاس بۆ خوا.. لە بیرتان نەچێت چی بچێنیت ئەو دەدرویشەوە[1]. منیش دەڵێم پەلە مەکەن لە بڕیاردان و تەڵاق و کوشتن و بریندا، چونکە نازانن خوای گەورە دواتر چی بەسەرتان دێنێ و چۆن دڵخەکان لە خراپە بۆ چاکە دەگۆڕێ...لە کۆن گوتویانە: ئەوەی لەسەر سەبرانە لەسەر خێرانە..

---

( ١) چیرۆکەکانی ڕینمای، عمرو خالد لاپەڕە (٩٤)

## ٤٠٨- خووی خراپ

ڕۆژێکیان دەباغێك دوای تەواو بوونی کارەکیەی بۆ بازاڕی کردن بەرەوبازاڕ ڕۆیشت، وەها ڕێککەوت کە بە پێش دوکانی بۆن فرۆشان تێپەڕی کرد لە کاتی تێپەڕبوونی بۆنێکی بۆ هات و لە هۆش خۆی چوو، بەربووەوە، خەڵك دەوریان لێدا وهەموویان نیگەران بوون وهەرکەسێك لە خۆیەوە چارەسەرییەکی بۆ دادەنا، یەکێك گوتی: باوەشینی لێ بکەن ویەکێك گوتی قەنداوی بدەنێ، یەکێك گوتی: گولاو لەسەر و چاوی بدەن تاکو بەهۆش خۆی بێتەوە، یەکێك دەست وسەری بۆ دەماڵی، یەکێك شتی دەدایێ.. و بزانێت بۆ بەربۆتەوە، لەوکاتە یەکێك گوتی: گیرفانی بگەڕێن بزانن ئایا عینوانێکی خانوو یان شوێنی کارکردنی تێدانییە بۆ ئەوەی خانەوادەکەی ئاگادار بکەینەوە، لەوانەیە ئەوان بزانن چی بووە، لەوانەیە بەڵکوکاتی داو و دەرمانی بەسەر چووبێ..

پاشان یەکێك گیرفانی پشکنی و ناونیشانی خانووەکەی لەسەر نامەیەك کە بۆی هاتبوو دۆزیەوە

دووکەسیان چوون ئاگاداری ماڵەوەیان کرد وپاشان برای نەخۆشەکەیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ ئەوەی چارەسەری بکات.

لە ڕێگادا برای نەخۆشەکە چاوی بەپیسایی سەگ کەوت و خۆی چەماندەوە و دەستی دایە و هەڵیگرت لەناو پارچە قوماشێك پێچایەوە و کەوتەڕێ دووکەسەکە پرسیاریان لەوە کرد.




ئەویش گوتی: لەوانەیە بەکەڵك بێت بۆی، ئێستا کە من باسی گرفتی برام بکەم هەمووتان تێدەگەن، برای من دەبباغە پێستی ئاژەڵان دەباغ دەکات و خۆشیان دەکات بۆ کاری پێویست، کەواتە هەمیشە لەناو دەردو ئازارو عەزاب و بۆنی ناخۆش ژیانی بردۆتە سەر لە ماڵەوە بۆ دوکان.. لە دوکان بۆماڵ، هیچ ئیشی تری نییە و بۆ هیچ شوێنێکی تر ناڕوات، کەواتە کاتێ بەلای دوکانی بۆن فرۆشان تێپەڕبووە، بۆنی خۆشی بۆنەکان مەستی کردووە وبێ هۆش بووە وبەربۆتەوە.

دوایی پیسایی سەگەکەی لە لوونی براکەی نزیك کردەوە دەست بەجێ براکەی هاتەوە هۆش خۆی وبەیەکەوە بۆماڵ ڕۆیشتن[1].

## ٤٠٩- به بیستنی قورئان ڕێنمایی کرا

مامۆستا عمروخالد دەڵێت: لە سەفەرێکی دوور گەڕامەوە قەدەری خوا وابوو لە نێو فرۆکەکەدا کۆمەڵێ گەنجی هەرزەکار دەوریان دابوو ودەنگە دەنگو هەراو پێکەنینیان ئەو ناوەی پڕ کردبوو لەگەڵ دوکەڵی جگەرەکانیان، حیکمەتی خوا وابوو ئەو فرۆکە پڕبوو لە نەفەر نەمدەتوانی شوێنی خۆم بگۆڕم، هەوڵمدا خۆم دەرباز بکەم لەوقەیرانە دا، بۆیە پەنام بردە بەر ئەوەی کە بخەوم بەڵام هاوار بەحاڵم خەوی چی..

---

( ١) مثنوي معنوي/ جلال الدين الرومي، لاپەڕە (٥٤)



کاتیَ ئیتر زۆر بیَ تاقەت بووم لەو هەراو بەزمە، قورئانەکەم کردەوە بەدەنگێکی هێواش دەستم کرد بە قورئان خوێندن، چەند ساتێکی نەبرد زۆرێك لەلاوەکان هێور بوونەوە وهەندێکیان رۆژنامەیان دەگرت بەدەستەوە ودەیانخوێندەوە، هەندێکیان دەخەوتن، لەناکاو یەکێکیان کە لە تەنیشتمەوە بوو بە دەنگێکی بەرز گوتی: بەسە بەسە!! واگومانم برد کە بەهۆی دەنگی منەوە بێزار بووە، بۆیە داوای لێبوردنم لیَ کرد، پاشان دەستم کرد بە خوێندنەوەی قورئان بە دەنگێکی زۆر هێواش کە تەنها خۆم دەمبیست، بینیم سەری خستۆتە ناو هەردوو دەستی پاشان لە دانیشتنەکەیدا زۆر دەجوولێت، پاشان سەری بەرزکردەوە زۆر بە نارەحەتی پیَ گوتم: تکایە.. بەسە ناتوانم ئارام بگرم پاشان لە شوێنی خۆی هەستاو بۆ ماوەیەك لەبەر چاوان ون بوو پاش کەمێك گەڕایەوە، داوای لیَ بوردنی لیَ کردم، من بیَ دەنگ بووم و نەمزانی چی ڕوویداوە!!

دوای کەمێك لەبیَ دەنگی لای کرد بەلامدا چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك بە چپە پێی گوتم: سیَ ساڵ یان زیاتر دەبێت سەرم نەخستۆتە سەر زەوی سوجدەیەك بۆخوا بەرم وتەنها ئایەتێکیشم نەخوێندۆتەوە ئەوە مانگێکی تەواوە لەم گەشتەمدا بەسەرم بردووە خراپە نەماوە تێی نەگەوزابم، پاشان تۆدەبینم قورئان دەخوێنی، بۆیە دنیا لە بەرچاوم ڕەش بوو، دڵم توندبوو سنگم گوشرا وهەناسەم تنی کردم، بەڵیَ هەستم دەکرد کە هەرئایەتێك دەخوێنیت وەکو قامچی دەکێشرێت بەلاشەمدا بۆیە بەخۆمم گوت: تاکەی ئەو بیَ ئاگاییە..؟!




وەتاکەی بەم ڕێگایەدا بروم؟! دوای ئەو هەموو بێ هودەیی و ڕابواردنە بەتەمای چیم؟ پاشان ڕۆیشتم بۆ تەوالیت دەزانی بۆ چی؟ هەستم دەکرد کە زۆر حەزم دەکرد کە بگریم، وە شوێنێکیشم شك نەبرد خۆم لە چاوی خەڵك بشارمەوە ئەوێ نەبێ !!

بۆیە منیش شتێکی گشتیم بۆ باس کرد لەسەر تۆبەو گەڕانەوە بۆلای خودا، پاشان بێ دەنگ بوو، کاتێ فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانە نیشتەوە، وەك ئەوەی کەبیەوێ لە هاوڕێکانی دوورکەوێتەوە بەڕوخسارێکی زۆر لێبڕاوانە لێ پرسیم و گوتی: ئایا گومان دەبەیت کە خوای گەورە لێم خۆش بێت؟

پێم گوت: ئەگەر تۆ ڕاست گۆبیت لەتەوبەکەتدا وسوور بێت لەسەر گەڕانەوەت ئەوەبێ گومان خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانت خۆش دەبێت.

گوتی: بەڵام تاوانی گەورەم کردووە.. زۆر گەورە پێم گوت: ئایا گوێت لەو ئایەتە نەبووە: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ الزمر: ٥٣

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ)پێیان بلێ: خوا دەفەرمووێ ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە زێدە ڕۆیتان کردووە لەسەر خۆتان بە گوناهو تاوان کردن، هەرگیز بێ ئومێد مەبن لە بەزەیی خوا—ئەگەر بەڕاستی تۆبە بکەن—خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێ، چونکە ئەو خوایە زۆر لێبوردە ومیهرەبانە، بینیم خەندەی بەختەوەری نیشان داو چاوانی پڕببون لە فرمێسك، پاشان خوا حافیزی لێ کردم ورۆیشت.






سبحان الله العظيم مرۆڤ هەرچەندی بگاتە ئەوپەری فەسادو نوقم بون لە گوناهدا لە دڵی هەر تۆوی خێری تێدایە ئەگەر بتوانین بە دڵی وچاودێری بکەین پشت بە خوای گەورە بەردە گرێت بەرهەمدار دەبێت [1].

## ٤١٠- مردوو شۆر

مامۆستا عمر خالد بەسەرهاتی ئافرەتێکی مردوو شۆر دەگێڕێتەوە لەیەکێك لەو ئافرەتانەی کە لە مامۆستاکەی بیستووە دەڵێ:

من کچێکی تەمەن (١٨) ساڵانم حەزدەکەم ئەو بەسەرهاتەتان بۆ بگێڕمەوە کە کاریگەری گەورەی هەبووە لەسەر دڵم بە شێوەیەك نوێژەکانم بەڕێك و پێکی نەدەکرد، بەڵام کاتێ ئەو چیرۆکەم خوێندەو هەموو نوێژەکانم لە کاتی خۆیدا ئەنجام دەدا، ڕۆژێکیان مامۆستاکەمان لەوانەی (ئایین)دا لاپەڕەیەکی بچوکی بەسەردا دابەش کردین کەباس بەسەرهاتی مردوو شۆرێکی ئافرەتی دەکرد گوتی: جارێکیان دەیانەوێت تەرمی کچێك بشۆن تا کفن ودەفنی بکەن، پەیوەندیان کرد بە مردوو شۆرێکی ئافرەتەوە تاکو بیشوات، ئافرەتەکەش هاتەماڵیان چونکە ئەوە کاری ئەوە، کاتێ دەڕواتە ماڵەکەوە پێیان دەڵێ: کوا لاشەکە؟

ئاماژەی دەرگای ژوورەکەی بۆ دەکەن وئەویش دەچێتە ژوورەوە دوای

---

(١) چیرۆکەکانی ڕێنمایی/عمرو خالد، لاپەڕە (١٣٧)






ئەوەی کەس و کاری مردووەکە دەرگای ژوورەکە لەسەر مردوو شۆرەکە دادەخەن ومردووشۆرەکەش دەترسیٚ وتەقە لە دەرگاکە دەدات تابۆی بکەنەوە بەڵام کەس وەڵامی ناداتەوە وەهەستی کرد کە ئاوو کفن لەپاڵ مردووەکەدا ئامادەکراوە بۆی.

کاتیٚ سەری ڕەشی بینی وەکو خەڵووز، سەری سوڕما لەو شێوەیە و هەرگیز ئەوەندە نەترسابوو بۆیە دەستی کرد بە خوێندنی (آية الكرسي) و (المعوذتين) قل اعوذ برب الفلق والناس، ئینجا دەستی کرد بە شۆردنی بەڵام شۆردنی ئەو لاشەیە زۆر ناڕەحەت بوو لە سەری چونکە لاشەی وەکو خۆڵەمێش برژابوو لێهاتبوو، هەرشوێنێکی لەشی بگرتایە لەدەستی بەر دەبوە وە لێك دەپچرا، بۆیە بە خێرایی کارەکەی خۆی ئەنجام دا، تا بچێتە دەرەوە ئیتر نەگەڕێتەوە، کاتیٚ تەواوبوو دای لە دەرگایەکە و دەرگایان لیٚ کردەوە، ئافرەتەکە بە خێرایی چووە دەرەوە وبەرەو ماڵی خۆی ڕۆیشت بەبیٚ ئەوەی پرسیار بکات لە حاڵی ئەو مردووە، دوای چەند ڕۆژێك چووە لای شێخێکی گەورە بەسەر هاتەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش پێی گوت: بڕۆ بولای خاوەن مردووەکە هۆکاری ئەوەیان لیٚ بپرسە، ئەویش ڕۆیشت بۆلایان و پێی گوتن: دەمەویٚ هۆکاری دەرگا داخستنەکەتان لیٚ بپرسم لەگەڵ ئەو لاشەیەدا، گوتیان، چونکە هەرکاتیٚ مردووشۆرێکمان دەهێنا تابیشوات کاتیٚ حاڵەتەکەی دەبینی ڕایدەکرد نزیکەی دە مردووشۆری ئافرەتمان هێنا تۆ دوا هەمینیان بوویت وترساین تۆش ڕابکەیت مردوو شۆرەکە گوتی باشە حاڵی کچەتان چۆن بوو؟ گوتیان: نوێژی نەدەکرد.



ئینجا ئەگەر ئەوە حاڵی نوێژنەکەربێ پێش ئەسپەردەکردنی دەبێ دوای ئەسپەردە کردنی حاڵی چۆن بێ؟ نوێژبکە پێش ئەوەی نوێژت لەسەربکرێ[1].

## ٤١١- چارەنووسێکی گەش

کۆمەڵێ لاو (گەنج) لەیەکێك لەشەقامەکانی شارێك لە شارەکانی وڵاتانی کەنداو کۆبوونەوە لەسەر خراپەکاری، هەرکەسێك بەوشەقامەدا بڕۆشتایە سووکایەتیان پێ دەکرد، هەرکەس بوایە، ئەمە ئەگەر نەیان گرتایە ئەگەر بکەوتایەتە دەستیشیان لێیان دەدا،سەریان دەشکاندیان ئاسایی بوو بەلایان چەقۆی لێ بدەن، وەبەنیسبەتماڵەکانی ئەو ناوەوە ئوتومبێلەکانیان ئەوە هەرمەپرسە، خەڵکی ئەو ناوە نەیاندەهێشت ئافرەتەکانیان بێنەدەرەوە، تاکو ئەو شەقاوانە نەڕۆن، لەگەڵ هەموو ئەوشتانە دا چاوەڕوانی بانگدانیان دەکرد تاکو بچنە مزگەوتی ئەو گەڕەکە (بۆ نوێژکردن نا) بەڵکو بۆ فرێدانی زبڵ و پیسی بەسەر نوێژ خوێنان لە کاتی رکوع و سجودیاندا هەروەها میزیشیان پێدا دەکردن کەسیش نەیدەتوانی شکاتیان لێ بکات، لەیەکێك لە شەوەکانی ڕەمەزاندا وەك نەریتێکی ئاسایی چوون بۆ مزگەوت بۆ ئازار دانی نوێژ خوێنان، لە نێوانیاندا گەنجێکی ئەسمەری تێدابوو (تاك بوو لە نێویاندا) لە هەمویان سەر سەخت ونالەبارتربوو لەوشەوەدا بەتایبەتی بەدەر لە هەموو شەوەکانی تر شتێکی سەیر بەسەر ئەو لاوە (گەنجە) هات، پێشنیاری کرد بۆ

---

(١) چیرۆکەکانی ڕینمایی/عمرو خالد لاپەڕە (٩٦)

شەقاوەکان کە بچیّ بۆ مزگەوت بۆ ئەنجامدانی نوێژی خەوتنان (عشاء) ئەوانیش بەگوێیان کردو دەست نوێژیان گرت پاشان ویستیان بێنە دەرەوە بانگی ئەویشیان کرد ڕازی نەبوو، پێی گوتن: لە زووە نوێژم نەکردووە، وازم لیّ بێنن من دەمەویّ بەردەوام بم لە نوێژ کردن بۆیە بەجێیان هێشت و چوونە دەرەوە، کوڕە لاوەکە تا درەنگی شەو هەر نوێژی دەکرد، تا مێوری مزگەوت هات و ویستی دەرگای مزگەوت دابخات قسەی لەگەڵدا کرد بەڵام سوودی نەبوو، بەتەنها وتەیەکیش وەڵامی نەدایەوە، مجێورەکەش وازی لیّ هێنا و چوو لە دەرەوە دانیشت، باوکی لاوەکە بەوێدا ڕەت بوو، نزیك بووەوە لە خادمەکە ویستی سۆراخی کوڕەکەی بزانێت، تەنیا پرسیارێك بکات چونکە گومانی نەدەبرد لەویّ بێت بەڵام ئەوەی کە چاوەڕوان نەدەکرا ئەوەبوو، مجێور پێی گوت: کوڕێك لە ژوورەوەیە شێوەی لە کوڕەکەی تۆ دەکات نایەوێت بێتە دەرەوە باوکی بە پەلەوە چووە مزگەوت، بینی کە بەراستی کوڕەکەی لەوێیە بڕوای بە چاوەکانی خۆی نەکرد، زۆر سەری سوڕما بەڵام دڵخۆشیەکەی بیّ ئەندازەبوو، ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەوە، کوڕە داوای لێبوردنی لە دایك و باوکی دەکرد کە ئەمان بەردەوام بیّ ئومێدی نەبوون لە ڕەحمەتی خوا و دوعاکردن بۆی بەشەوو بەڕۆژ ئومێدیان بە ڕەحمی خواهەبوو.

(انك لا تهدي من احببت ولكن الله يهدي من يشاء) واتە: ئەی محمد (ﷺ) تۆ ناتوانیت هیدایەتی ئەو کەسەبدەیت کە خۆشت دەویّ بەڵکو خوای گەورە هیدایەتی ئەوکەسە دەدات کە دەیەوێت پاشان داوای لیّ بوردنی لیّ کردن و بەڵێنی پێدان کە لەمەودوا باشتربیّ ئەوەندە دلشاد بوون کە باس




ناکرێت، وەك ئەوەی تازە لە دایك بووبێتەوە پاشان دایك و باوكی ماچ کردو داوای لێکردن کە بۆ نوێژی بەیانی هەڵیسێنن وباش کەمێك چووە سەر جێگاکەی و خەوت چەند سعاتێکی نەبرد دەنگی بانگی بەیانی ئاسۆی پر کرد.

دایکی چوو خەبەر داری بکات بەڵام هەناسەی لیٚ بڕابوو، ئەو ماڵ و ئاواییەی لە ژیان کرد بوو – لا الله الا الله بردیان بۆ مزگەوت تا بیشۆن، چەند پیاوێك کۆبوونەوە دەستیان کرد بە شۆردنی ئاوەکە ئەسمەریەکەیی دەشۆردەوە و دەیتاواندەوە ئەوانیش کە خەریکی شۆردنی بوون بەردەوام هەر (الله اکبر)یان دەکرد، ئەو لاوە ئەسمەرە ڕەنگی ڕوخساری سپی بویەوە !! ئایا ئەوە گوناهەکانیەتی یان فریشتەکان هەستاون بەشۆردنی یان ئەمە ئەنجامی دوعای دایك و باوکی یەتی بۆی؟ کەتەنها ڕۆژێك هیوا بڕاونەبوون لەڕەحمەتی خوایان ئەمە ڕەحمەتی خوایە و موسلمان وکافرو گوێڕایەڵ و سەرپێچکەریش دەگرێتەوە؟ من پێم وایە هەموویان پێکەوە گرێدراون، سوپاس بۆ خوا[1].

---

(١) چیرۆکەکانی ڕێنمایی/ عمروخالد – لاپەڕە (٦٤)






## ٤١٢- میز دەکەن بەگۆڕەکەیدا

ئەو کەسەی کە چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە دەڵێ:

هاوڕێیەکم هەبوو لە جێگای برامدا بوو، هەفتەی ڕابردوو لە ڕووداوێکی ڕێگاوباندا وەفاتی کرد، خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات ودڵنەوایی ببەخشێت بەکەس وکاری، ئەو هاوڕێیە کۆمەڵێ سایتی خراپ و بەڕەڵڵایی لەلابوو، وەخۆیشی سایتێکی هەبوو کە پێك هاتبوو لەوێنەی خراپ و بەڕەڵڵای، کارەساتەکە لەوەدایە گە ئێمە ژمارە نەهێینی یەکە (پاسۆرد) نازانین تاکو لایبەرین.. نەمانتوانی..

ئەی خێرخوازان ئەوپیاوە سەرقاڵی کاری خراپ بوو، وەکۆمەڵەکەشی خریکی ئەوکارە بوون، حسبنا الله ونعم الوکیل، دایکی لە خەویدا بینیبووی کە چەند کچێك بەسەر گۆڕەکەیدا دەڕۆن و میزی پێدادەکەن، ئەو دایکە داماوە ئاگای لە ڕەوشتی کوڕەکەی نەبوو، سوێند بەخوا ئەوانە کەمیزیان دەکرد بە گۆڕەکەیدا ئەوان بوون کە ئێستا ئەو وێنانە دەنێرن بۆ کۆمەڵکەی!

قسەمان لەگەڵ ئەو کۆمپانیایە کرد کە ئەو سایتەی تێداندرابوو، وەلامی ئەوانیش ئەوەبوو کە ناتوانین هیچ کاریێ بکەین.. خەڵکینە مرۆڤەکە مردووە بەڵام ئاسەواری کردەوەکانی خوێن لە دڵی ئێمە دێنێ، تاکەی ئەو حاڵەتە بەو شێوەیە بمێنێتەوە !! ئەو گروپە قێزوەن و ئەو سایتە پیسە بوو بە هۆی سەرنزمی بۆی ئەمەش لە ڕێگا لادانی شەیتانە مرۆڤ وجنوکەکاندایە.. حسبی






الله عليهم.. خوایە تۆڵە لەو کەسە بکەیتەوە کە هانی داوە بۆ دروست کردنی سایتێکی لەو جۆرە !! دەخوازین ئەو پەیامەمان بڵاوبکرێتەوە تا ئەوانەی زیندوون پێش ئەوەی ئەو ژیانەیان لە دەست بچێت بکەونە خۆیان و واز بێنن لەوشتە ناشەرعیانە و لەوسایتە بەرەڵلایانە.

حسبی الله ونعم الوكيل.. حسبی ونعم الوكيل[1].

## ٤١٣- سوڵتان محمود وئەیازی خزمەتکاری

سوڵتان محمود خزمەتکارێکی هەبوو بەناوی ئەیاز رۆژ لە دوای رۆژ لەلای سوڵتان محمود ئازیزترو بەرێز تر دەبوو لەبەر ئەوەی زۆر ئاقل و ژیربوو.

ئەیاز کورێکی ئەسمەرو کورتە باڵابوو، کە گیانێکی لاوازی هەبوو، لەیەکێك لە شەرەکان بەدیل گیرا بە هۆی هۆش و زیرەکی کە هەیبوو بەدەزگای سوڵتان محمود فرۆشرا و لەوێ خزمەتی دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر دەست پاك و زیرەك و بەهۆش و چالاك بوو، رۆژ بە رۆژ لەلای سوڵتان محمود خۆشەویستر دەبوو، هەتاکەم کەم بووە کە جێی دڵنیای سوڵتان محمود بوون وپلەیەکی باشی پێ بەخشی، ئەیاز لەبەرئەوەی میهرەبان بوو هەمووکاتێ هاورێی سوڵتان بوو، لەگەڵی دەچوو بۆ راو و دانیشتنە تایبەتیەکان زۆری پێ نەچوو ئەوانی تر حەسوودی و ئیرەییان پێ

(١) چیرۆکەکانی رێنمایی ، عمروخالد لاپەرە (١١٩)






برد کە چۆن یەکجار لە خزمەتکاری وبەندەگی پاشا گەیشتۆتە ئەو پلەو پایە باشە وسوڵتان ئەوەندە خۆشی دەوێت وئەوی بۆ ڕاوێژ کاری خۆی داناوە ولەبەر ئەوەی پەردەی حەسوودی پێش چاویان گرتبوو کەواتە باشیەکان وچاکەکانی ئەیازیان نەدەدیت وتۆمەتیان لێ دەدا وقسەی نارەوایان پێ دەگوت.

سوڵتان محمودیش چەند جار بیرو هۆشی تاقی کردبووەوە و ئەیازیش ئەرزش وبەهای خۆی نیشاندابوو وسەلماندبووی کە زۆر بەهای زیاترە لەو کەسانەی کە زۆر پلەبەرزن کەواتە زیاتر ئەوی خۆش دەویست.

ڕۆژێك ئەیاز لەگەڵ سوڵتان هاوڕێ بوو بۆ بیابان ڕۆیشتن سوڵتان فیکرەکی بۆ هات و کە ئەیاز تاقی بکاتەوە بۆیە ئەو کیسە پارەی کە پێی بوو کردیەوە مست مست ڕوی دەکردە سەر زەوی بێ ئەوەی تەماشای پشتەوەی خۆی بکات بۆ پێشەوە دەڕۆیشت.

کاتێ بەینێك ڕۆیشتن سوڵتان ئاوڕێکی لە پشتی دایەوە بینی کە هیچ کام لە هاورێ کانی دیار نین ودوا کەوتوونە تەنها ئەیاز لەگەڵی دایە ئەیاز گوتی: برا دەرەکان لەدوای ئێمەنە بەڵام کەمێك دواکەوتوونە گوایە خەریکی کۆکردنەوەی پارەن.

سوڵتان محمود گوتی: کەواتە تۆ لەگەڵ منی وەك ئەوان خەریکی پارەنەبوویت؟ ئەیاز گوتی: ئەوان نیعمەتیان بینی تۆیان لە بیرکرد، بەڵام لەوانەشە ماڵی ئێوە کۆبکەنەوە و بیهێنەوە بۆ لای جەنابت بۆ ئەوەی






سەروەت و سامانت لەدەست نەچێ، چونکە ئەوان تۆیان لەبەر سەروەت وپلە و پایەوپارە دەوێ لەکاتێکدا کە کاری من خزمەتکردنە و من لە خزمەتی ئێوەدام تا مردن، من ئێوەم لەبەر سەروەت و سامان ناوێ بەڵکو ساغی وسەلامەتی تۆم دەوێ، لەگەڵ ئێوەم تا ئەوکاتەی کە من لە خۆتان دوور دەکەنەوە، سوڵتان محمود گوتی: چۆن کاتێ بینیت کە ماڵی حەلاڵم لە بیابان دەرێشت بۆ بیرت نەکردەوە کە نەهێڵی ماڵی من لەناو بچێت.

ئەیاز گوتی: ئەگەر کیسە کۆن دەبوو و پارەکانت برژایە من ئەوەم لەسەر شان بوو کە ئاگادارت بکەمەوە و کە کیسەی پارەت کۆن بووە چارەیەکی بۆ بدۆزەوە بەڵام کە دەبینم خۆت بە ئارەزووی خۆت خەریکی ڕشتنێ پارەی وادەزانم کە بەرژەوەندییەك هەیە کە بۆیە جەنابی سوڵتان ئەو کارە دەکات.

سوڵتان محمود گوتی: ئەی کوڕە مەگەر دەکرێ ڕتنەوەی پارە بە ئارەزوو بەرژەوەندێیکی هەبێت؟

ئەیاز گوتی: بەکورتی وەفاداری برادەر دەکرێ بزاندرێ و برادەری ماڵ لە برادەری گیان جیادەکرێتەوە

لەگەڵ چەند لەم ڕووداوانە و تاقی کردنەوەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەیاز لە پێش چاوی سوڵتان محمود ئازیز تر دەبوو، حەسوودی ئەوانی تریش زیاتر دەبوو، بەڵام سوڵتان ئاگاداری ئیرەیی و حەسوود ئەوان بوو، بۆیە ویستی کە زاناترو زیرەك تربوونی ئەیازی بەدەورووبەری بسەلمێنێت، بۆیەش ئەمری






کرد کە چەندین کەس لەسەرکردەکان ودەسەلاَتدارەکان ئامادەبن بەیانی لەگەڵ ئەو بۆ ڕاو بڕۆن.

ڕۆژی پاشتر بەیانی زوو بەمەبەستی ڕاو لەشار دەرچوون ئەیاز شان بە شانی سوڵتان محمود دەڕۆیشت وقسەی لەگەڵ دەکرد و پێدەکەنی سەرکردەکان لە بینینی ئەو وەزعە زۆر تێکچووبوون وبەیەکتریان دەگوت: ئێمە لە ئەو زاناتر و زیرەکترین، تەجروبەی کاری ئێمە زیاترە، وەلە شەر بەهێزترین لە ئەو، لە خزمەتکاری باشترین لە ئەو بەڵام دیارنیە بۆ پاشان سوڵتان محمود — ئەوی زیاتر لە ئێمە خۆش دەوێت ئەوی لە ئێمە بە بەرزتر دەزانێت، ئەو خزمەتکارە بێ کەس و کارە لە ڕاوگەچی یە؟ تەنها دەزانێت قسەلووسی بکات وسوڵتان بەپێکەنین بێنێت و دڵی بەدەست بێنێت. هەر بۆیەش یەکی لە خۆیان هەلبژاردو بە نیوێنەرایەتی بۆلای سوڵتانیان نارد تا پێی ڕابگەیەنێت کە ئەو ڕێزەی کە ئەیاز هەیەتی جنێوێکە بۆ سەرکردەکان وئەوکارە ئەوانی لە خزمەتی باشتر سارد دەکەنەوە لەوانەیە سوڵتان بەو کارە ببێتە هۆی ئەوە کە دەوروبەری چۆڵ بێت، ئەگەر ئەو لەمان باشتر خزمەت دەکات لە بیابان کەسانی تر چالاکترو زیرەکترن.

هەلبژاردەی سەرکردەکان بۆ پێشەوە چوو ڕوخسەتی وەرگرت و هاوڕێ سوڵتان بوو پەیامی سەرکردەکانی پێ گەیاند هەرشتێك کە باسیان کردبوو بەبێ کەم و کەسری بۆ سوڵتانی گێڕایەوە، سوڵتان گوتی: بەڵێ منیش دەمزانی کە بیرو ڕایەکی ئەوها لە مێشکیان دایە بۆیە داوام لە ئێوە کرد کە ئەمڕۆ بۆ ڕاو بچین و هۆی ئەو بابەتە بۆ ئێوە ڕوون بکەمەوە، ئەگەر هەڵە لە






منە با بزانم چاکی بکەمەوە، وەئەگەر ڕاستیشم با شك و گومان لە ناو بچێت.

پاش بەبنێك کە ڕۆیشتن سوڵتان فەرمانی ڕاوەستانی دا، ئەیازی نارد بۆ لای داریێ: کە چەند مەترێك لێی دوور بوو پێی گوت: ئەیاز بڕۆ بن دارەکە و چاوەڕێ بە ڕووت لای دارەکە بێ تا ئەو کاتەی بانگت دەکەم هەر لەوێ بە، کاتێ گوێت لە دەنگی بەیەك کەوتنی شمشێرەکان بوو ئەوا شمشێرەکەت لەبن دارێك دابنێ و ڕووت وەربگێڕە.

ئەیاز پەیرەوی کرد و لە ئەسپەکەی خۆی خوڕی و لەوان دوورکەوتەوە ڕۆیشتە ژێر سێبەری دارەکە و چاوەڕێ بوو، لەوکاتەدا سوڵتان سەرکردەکانی لە دەرەوەی خۆی کۆکردبوونەوە و گوتی: ئەمڕۆ گومانتان لادەبەم کێشەیەك چارسەر دەکەین، هەمووتان لە پێش چاوم بەڕێزن و لەلای من یەکسانن وئێستا کەسێك هەڵبژێرن کە متمانەتان پێ هەبێ.

پاشان هەلبژاردنیان کرد ونەفەرێکیان هەلبژارد ئەو هەرهەمان کەس بوو کە پەیامی سەرکردەکانی گەیاندبووە پاشا – سوڵتان کە لە هەموویان بەتەمەن تر و عاقل تر بوو هەموویان سیقەیان پێ هەبوو سوڵتان محمود گوتی: ئەی پیاو تۆ نوێنەری ئەو بەرپرسانەی وەرە پێشتر بابڕۆین کاری خۆمان دەست پێ بکەین، ئینجا پەنجا هەنگاو لێیان بە دوور کەوتنەوە گوتی: تەماشاکە لە دوورەوە کاروانێك وا تێپەڕ دەبێ ئەمەوێت بزانێت کە ئەو کاروانە لەکوێ دێت و زووبڕۆ هەواڵی بێنە بۆم.

ئەو بەرپرسە سواری ئەسپەکەی بوو ڕۆیشت تاکو گەیشتە کاروانەکە و



پرسیاری کرد و بە خێرایی هاتەوە گوتی: سوڵتان سەلامەت بێت کاروان لە خوراسان دێت سوڵتان محمود پرسی نەتزانی بەرەو کویێ دەڕۆن؟ گوتی نەخێر نەمپرسی! بەڵام ئەگەر ڕوخسەت بدەی دەپرسم، سوڵتان گوتی: نەخێر پێویست ناکات تۆ لەلای من بمێنیتەوە.

پاشان سوڵتان بانگی یەکێکی تری کرد گوتی: ئەو کاروانە دەبینی برۆ بزانە بۆکویێ دەڕوات؟

بەرپرسەکە چوو پرسی پاشان گەڕایەوە گوتی: جەنابی سوڵتان کاروانەکە لە خوراسانەوە دێت بەرەو مەدینە دەڕوات سوڵتان گوتی: نەتپرسی کاروانەکە چەند کەسن؟ گوتی: نەخێر سوڵتان گوتی: هەرلەلای من بمێنەوە.

پیاوی سێیەمینی نارد وپیێ گوت: برۆ پێشەوە لەو کاروانە بپرسە کە چەند کەسن زوو برۆ هەواڵەکەم بۆ بێنەوە.

سێیەمەکەش چوو فەرمانی سوڵتانی جیێ بەجیێ کرد وگەڕایەوە گوتی: سەد و هەشتا کەسن لە خوراسانەوە دێن و بەرەو مەدینە دەچن سوڵتان گوتی: نەتپرسی کە بازرگانن یان گەشتیارن مسافر – گوتی نەخێر نەمپرسی بەڵام ئێستا دەچم دەپرسم و دەگەڕێمەوە سوڵتان گوتی: نەخێر لێرە بمێنەوە تا بزانم کەسی چوارەم چ هەواڵێك دێنێتەوە بۆمان، پاشان بەرپرسەکەی تری بانگ کرد و گوتی: برۆ لەو کاروانە بپرسە کە بازرگانن یان گەشتیارن و بارەکەیان چییە، کەسی چوارەم چوو لە کاروانەکە ئەو




خەبەرەی هێنا گوتی: سوڵتان سەلامەت بێ زۆربەیان بازرگانن و لە خوراسان مەنجەڵی سعودیە دەبەن و دووسێ کەسیش موسافیرن بۆ حەج کردن دەڕۆن بۆ مەکەی پیرۆز.

سوڵتان گوتی: نەتپرسی کە چ ڕۆژێك بەڕێ کەوتوونە؟ گوتی نەخێر نەمپرسی، سوڵتان گوتی: تۆش لێرە بمێنەوە.

بانگی بەرپرسێکی تری کرد و هەر ئەو پرسیارەی دووبارەکردەوە و چوو لە کاروانی پرسی هاتەوە وئەم هەواڵەی بە سوڵتان ڕاگەیاند کە ڕۆژی (٧)ی ڕەجەب بەڕێکەوتوونە و لە شاری (ڕەی) دوو هەفتە بۆ کڕین ڕاوەستاون.

پاشان یەك یەك بانگی بەرپرسەکانی دەکرد، وپرسیارەکانی لێ دەکرد و بەناتەواویان وەڵام دەدایەوە کاتێ کەس نەما گوتی: ئێستا دەگەینە بابەتی سەرەکی ئێستا شمشێرەکان لێك بدەن تا ئەیاز بێت و تاقی بکەینەوە لەگەڵ دەنگی شمشێرەکان ئەیاز کە لە ژێر دارەکان دا چاوەڕوان بوو گەڕایەوە سەلامی کرد و گوتی: جەنابی سوڵتان من ئامادەم هەرفەرمانێ بکەیت لە خزمەت دامە.

سوڵتان محمود گوتی: ئەیاز گیان ئەو کاروانە دەبینی کە لەو شەقامە دەڕۆن ئەیاز گوتی: بەڵێ

سوڵتان گوتی: دەمەوێ بزانم ئەو کاروانە لە کوێ دێت زوو بڕۆ هەواڵەکەم بۆ بێنەوە دەمانەوێ بڕۆین

ئەیاز سواری ئەسپەکەی بوو بۆ پێشەوە چوو کەمێك لەوانی تر درەنگی



پێ چوو ئینجا گەڕایەوە، کاتێ گەیشتە لای سوڵتان وجەماعەتەکەی سڵاوی کردو گوتی: سوڵتان سەلامەت بێ ! کاروان لە خوراسان دێت و بەرەو مەدینە دەچێت.

سوڵتان: نەتپرسی چەند کەسن؟

ئەیاز گوتی: سەدو چل وپێنج (١٤٥) پیاو وبیست (٢٠) ئافرەت و پانزە (١٥) منداڵی بچوك.

سوڵتان: خۆزگە پرسیارت بکردایە بارەکەیان چییە؟

ئەیاز: پرسیم ئەوان قوماشی ئاوریشم و مافوری خوراسان و فستەقی ڕەفسنجانیان پێ بوون لەگەڵ چەرەزات و بادەمی ئازربایینجان و مەنجەڵی بەردی.

سوڵتان: ئایا نەتپرسی کە چەند رۆژە لە رێگادان؟

ئەیاز: (٧)ی رەجەب بەرێ کەوتوونە دوومانگ و چەند رۆژێك لەرێن ودوو حەفتەیە کە لە شاری (رەی) ئیسراحەتیان کردووە

سوڵتان محمود گوتی: گوێم لە وەڵام بوو هەموو ئەو پرسیارانەی کە هەموو بەرپرسەکان تاك تاك وەڵامەکەیان بۆ هێنام بەڵام ئەیاز بەیەکجاری وەلامی بۆ هینام.

پاشان سوڵتان گوتی: برۆ شمشێرەکەت بێنە کاتی رۆیشتنە کاتێ ئەیاز دوورکەوتەوە سوڵتان محمود گوتی: خۆتان شتەکەتان دێت؟ من هەر یەکێك




لە ئێوەم بەتەنیا نارد وەڵامی ناتەواوتان هێنا بۆم بەلام ئەیاز خزمەتکارێك بوو چوو هەموو ئەو شتانەی کە ئێوە چەند کەس هێنابووتان بەتەنیا هێنای بۆم.

هەرشتێك کە ئەو لێکۆڵینەوەی لەسەر کرد ئێوەش دەتانتوانی بیکەن بەڵام نەتان کرد، من نامەوێ سەرزەنشتی ئێوە بکەم، هەموتان زۆر هونەرتان هەیە زۆر کار دەتوانن بکەن کە ئەو ناتوانێت، بەڵام ئەیاز ئەو کارەی کە دەتوانێت و لە دەستی دێت بەتەواوی دەکات ئایا ڕوون کردنەوەی لەم بارەیەوە پێویستە؟ نوێنەری بەرپرسەکان گوتی: گەواهی دەدەم کە ئێوە لەسەر حەقن ئەو کەسەی کاری خۆی بەتەواوی وبەدروستی ئەنجام دەدات لە هەر شوێنێك بێت ولە هەرپلەوپایەیەك بێت دەبێ خۆشەویست و بەڕێز بێت، بەڕاستی کە ئەو لە ئێمە باشترو شایەن ترە [(١)].

## ٤١٤- بەڕاستی خوا پەرست وتێکۆشەرە

جعفر ـــی کوڕی یزید العبدی دەڵێ:

دەرچووین بۆ غەزا بۆ شاری کابۆلی ئەفغانستان ئەمڕۆ، لە نێو لەشکرەکەمان صیلەی کوڕی اشیم ی – العدوی – هەبوو، کە بەراستی پیاوێکی ئازاو چاونەترس و هەتا بلێ ی لە خواترس بوو، لەشکرەکە دابەزین لە کاتی ئێوارەدا ویستیان بخەون منیش گوتم: ئەمشەو ناخەوم سەیری

---

( ١) مثنوي معنوي/ جلال الدينی رومی لاپەڕە (١١١)






خواپەرستی (صیله) دەکەم بزانم چۆنە، خەڵکی دەڵێن عیبادەت و خواپەرستی لە ئەنداز بەدەرە، نوێژی خەوتنانی (العشاء) کرد و چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە خەڵکی بخەون ولێی بێ ئاگابن منیش هەستم کرد کە هەموویان نووستوون تەنها ئەو نەبێ کە ئاگای لە من نیە، بینیم لە تاریکی شەودا بە هێواشی لەسەرخۆ ڕۆیشت بۆ ناو دارو درەختێکی بەترسدا منیش بە دوای کەوتم، دەست نوێژی هەڵگرت وهەستا بۆ نوێژکردن بینیم شێرێك هات وتاکو لێی نزیك بووەوە،

ڕامکرد بۆ سەر درەختێك لەترسی شێرەکە، تۆ وادەزانی کە ئاوڕی لە شێرەکە داوەتەوە نەخێر هەروای دانا کە مشك بێ وبەس بەردەوام بوو تاکو چووە سوجدە، زۆر ترسام وگوتم: ئێستا دیخوات، ئێنجا لە سوجدەکە هەستایەوە سەلامی دایەوە بەشێرەکەی گوت: ئەی دڕندە بڕۆ لە شوێنیکی تر داوای خواردن و رزقت بکە، شێرەکەش یەکسەر بە ملکەچی بۆ دواوە گەڕایەوە، بەڵام دەنگی گەورەی کێوی دەڕوخاند تاکو ون بوو هەر مرەی دەکرد.

کاتێ بووە بەیانی هەستایەوە سوپاسی خوای کرد بە چەند وشەیەکی سەیر و غەریب کە هیچ کات ئەو وشانەم نەبیستوون الا ماشاءالله.

پاشان گوتی: ئەی خوایە گیان داوات لێ دەکەم لە ئاگری دۆزەخم بپارێزی وەئەو کەسە بپارێزی وەکو من کە غیرەت دەکات و داوای بەهەشتت لێ دەکات، ئێنجا گەڕایەوە ناو لەشکرەکەی وەك ئەوەی کە لە نێو لەشکرەکە مابێتەوە واتە: دابڕانەکەی هیچ کاری تێ نەکرد بوو — منیش



کاتی بەیانی هەستم کرد زۆر بێ تاقەت وماندووبووم.

کاتێ لەشکرمان لە خاکی دوژمن نزیك بووەوە گەورەو سەرکردەکەمان فەرمانی کرد کە هیچ کەس لە لەشکر جیانەبێتەوە دانەبڕێن دەڵێ: ئێسترو بارو پێداویستیەکەی هەموو لێ جیابووە وە ڕۆیشت بەلاّم ئەو هەستا نوێژی کرد، خەڵکی پێیان گوت: وەرە لە گەڵمان هەموویان ڕۆیشتن، بەلاّم ئەو گوتی: وازم لێ بێنن تاکو دوو ڕەکعات نوێژ دەکەم گوتیان نابێ ئەوا خەڵك هەمووی ڕۆیشتن فریای ئەوان ناکەویت ! گوتی: نانا دوو ڕەکعتی سووك و بەپەلە دەکەم وفریا دەکەوم دەڵێ: کاتێ سەلامی نوێژی دایەوە دوعای کرد و گوتی: (اللهم اني اقسم عليك ان ترد بغلبتي وثقلها)

واتە: خوایە گیان من سوێندت لەسەر دەخۆم کە ئەو ئێسترو بارو پێداویستیەم بۆ بگەڕێنیتەوە

دەڵێ: دەست بەجێ ئێسترەکەی بە خۆی و بارەکەی هاتە بەردەمی ڕاوەستا، کاتێ گەیشتن بە دوژمن بەخۆی و بەهیشامی کوڕی عامر هێرشیان بۆ بردن ئەوەندە لێدان وتیری تێگرتن و کوشتنی تاکو لەشکریان هەموی تێکشکاند.

گوتیان: دووکەسی عەرەب ئەوەهای پێ کردین ئەگەر هەمویان لەگەڵمان بجەنگابان دەبوا چیمان بەسەر هاتبایە

ئینجا کەل و پەلیان هەموویان دا بە موسڵمانەکان[1].

---

(١) وصايا الرسول / المجموعه الپانيه: بەرگی (٣) لاپەڕە(٣٦١)




## ٤١٥- هەڵوێستە ئیمانیەکەی ( صیلە )ی عدوی

ثابت ي – البنانی – دەڵێ

صیلەی کوڕی اشیم لەیەکێك لە غەزاکان بەخۆی و کوڕەکەی بەشدارییان کرد، ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد ودەیگوت، ڕۆڵەکەم بەرەوپێش برۆ بجەنگە لەگەڵ دوژمن تاکو خۆدەگرم لەسەر شەهید بوونت، ئینجا هێرشی کردە سەر دوژمن ولە گەلیان جەنگا تاکو شەهید بوو، پاشان ئەویش بەرەوپێش چوو

ئافرەتانی ئەو سەردەمە هاتنە لای خێزانی صیلە کە – موعازەی – العدویە– بوو بۆ پرسە و سەرە خۆشی، معاذە دەیگوت بەخێربێن.. ئەگەر بۆ پیرۆز بایی هاتوون ئەوا بەخێربێن، بەڵام ئەگەر بۆ پرسەی تەعزیە هاتوون بگەڕێنەوە واتە تەعزیە و پرسە لەماڵی ئەو ڕەنگی نەدەدایەوە.

ابن جوزی دەڵێ: صیلەی کوڕی اشیم کۆمەڵێك لە هاوەڵانی بینیوە وەفەرمودەی لە (ابن عباس)وە گێڕاوەتەوە وەلە چەندی هاوەڵی تر لەسەرەتای دەسەلاَت و ئەمارەتی حجاج کوڕی یوسفی سەقەفی لە عیراق دا لە غەزا شەهید بووە، ڕەحمەتی خوای لێ بێت[1].

---

( ١) صفه الصفوه/ ابن الجوزی، بەرگی(٣) لاپەڕە (١٣١)






## ٤١٦- دڵسۆزی لە کردەوەی چاك

شێخ حسن ی – البصری – دەفەرموێ

پیاوێك گوتی: سوێند بەخوا دەبێ خواپەرستێکی ئەوها بکەم کە ناوودەنگم پێ بڵاوبکرێتەوە وخەڵکی باسم بکات دەڵێ: هەرکاتێ دەبینرا لەناو نوێژ بوو هەرگیز دانەدەبڕا لە نوێژ کردن، وەلە پێش هەموو کەسێك دەچووە ژووری مزگەوت و لە دوای هەموو کەسێکیش دەهاتە دەرەوە، بەڵام ئەو هەر بەرێزو شکۆدار نەدەبوو لەناو خەڵکی، بۆیە حەوت (٧) دانە مانگ لەسەر ئەو بیروڕایە مایەوە، هەرکاتێ بەلای خەڵکی تێدەپەری دەیانگوت: سەیری ئەو ڕیابازە بکەن، واتە: لە پێش چاوی خەڵکیش ناشرین و بێ ڕێزبوو چونکە لە کردەوەکانیدا دڵسۆزی واخلاص نەبوو.

بۆیە بیری کردەوە و بەخۆی گوت: وادیارە خەڵکی بەس بە خراپە باسم دەکەن، واباشە ئەو کردەوەی کە دەیکەم نیەتەکەم بگۆڕم چیتر بۆ خەڵکی نەکەم هەموی بۆ خوا بێ، هەستا دەست بەجێ تۆبەی کردو نیەتی خۆی پاك کردەوە هەرکارێکی دەکرد مەبەستی خوابوو وەهیچی لەسەر خوا پەرستی یەکی پێشوو زیاد نەکرد تەنها نیەت پاکی نەبێ، لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام بوو هەرکاتێ بەلای خەڵکی تێپەڕی دەکرد دەیانگوت: ڕەحمەتی خوا لە فلان کەس بەڕاستی ئێستا بۆتە خواپەرستێکی ڕاستەقینە،ئێنجا شێخ حسن ی – البصری– ئەو ئایەتەی خوێنەوە (ان الذین امنوا وعملوا الصالحات سیجعل



لهم الرحمن ودا [1][2].واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاك دەکەن لە ئایندەدا خوای گەورە سۆز و خۆشەویستی و ڕێزی تایبەتیان بۆ ئامادە دەکات.

هەروەها لەلایەن فریشتەکان و ئیمانداران و ئەهلی بەهەشت خۆشەویست و ڕێزدارن.

## ٤١٧- کێ لە دنیادا زۆر غەمبارە لە دوارۆژدا دڵخۆشە

مالك کوڕی دینار دەفەرمووێ:

شێخ حسن ی – البصری –م بینی لەخەودا زۆر جوان ڕوخسار گەشاوەبوو تابڵێ ی ڕۆخساری سپی بوو، شوێنەواری فرمێسکەکان و گریانی دنیای هەمو ڕوخساری ڕەونەق دار کرد بوو.

پرسیم لیٚ ئایا تۆ نەمردبووی لەلای ئێمە ئەی ابو سعید؟

گوتی: بەڵێ

گوتم: لە دوای مردن چیت بەسەرهات لە خانووی دوارۆژ چونکە تۆ لە دنیادا زۆر غەمبار و دڵت هەمیشە عاجز و پڕ لە خەم و خەفەت بوو؟!

---

( ١) سورە مریم – (٩٦)

( ٢) وصایا الرسول المجموعة الثانية – بەرگی (٣) لاپەڕە (٢٩١)

گوتی: بەهۆی ئەوە یان لە پاداشتی ئەوەوە چوومە نێو ماڵەکانی چاکان و پارێزکاران، سوێند بەخوا ئەوەش فەزلی خوایە بەسەرمان گوتم: ئەی ابو سعید فەرمانی چیم پێ دەکەیت؟

گوتی: ئەوەی فەرمانت پێ دەکەم ئەوەیە کە هەرکەسێ زۆر لە دنیایدا دڵ پڕ غەم و ناڕەحەتی وهەمیشە غەمباربێ، ئەوا لە دوا ڕۆژدا لە هەموو کەس دڵێ خۆشترو بێ خەم ترە[1].

## ٤١٨- هارون الرشید لە ترسی ڕۆژی لێ پرسینەوە دەگری

فضل ی کوڕی ربیع دەڵێ: ساڵێك هارون الرشید چوو بۆ حەج کردن منیش لەوێ بووم لەناکاو گوێ بیستی دەنگی دەرگاکە بووم، کە خەوتبوون هەستام وگوتم: کێ یە؟ گوتی: وەڵامی امیر المؤمنین بدەرەوە.

بەپەلە هەستام بۆلای چووم و گوتم: ئەی امیر المؤمنین ناردبات بەشوێنم خۆم دەهاتمە لات، گوتی: هاوار بۆخۆت شتێکی گەورە هاتووە بە خەیاڵم کەسێکم بۆ بدۆزەوە تاکو پرسیاری لێ بکەم.

منیش گوتم: ئەوەتا سفیان ی کوڕی عیینە، گوتی: بڕۆ با بچینە لای ڕۆیشتین چووینە بەردەم دەرگای ماڵیان لە دەرگامان دا و گوتی: کێیە؟ گوتم: وەڵامی امیر المؤمنین بدەرەوە، بەپەلە ڕایکرد بۆ دەرەوە وگوتی: ئەی

---

( ١) صحيح وصايا الرسول ، المجموعه البانيه-بەرگی(٣) لاپەڕە(٣٦٩)

امیر المؤمنین بۆ بەخۆت هاتی ناردبات بە شوێنم من دەهاتم، قسەمان بۆ بکە کە بۆی هاتووین، ئینجا نزیکەی کاتژمێرێك قسەی بۆ خەلیفە کرد، خەلیفە پرسی ئایا قەرزداریت؟ گوتی: بەڵێ پاشان خەلیفە بە فضل ی گوت: قەرزی بۆ بدەرەوە کاتێ هاتینەدەرەوە گوتی: ئەی فضل بەڕاستی هاوڕێکەت سوودی نەبوو بۆم، واتە: ئامۆژگاری قیامەتی لەلا نەبوو، پیاوێکی ترم بۆ بدۆزەروە پرسیاری لێ بکەم، منیش گوتم: عبدالرزاق ی کوڕی همام لێرەیە خەلیفە گوتی: برۆ با بچینە لای، ڕۆیشتنین بۆ لای لە دەرگامان دا گوتی: کێیە، گوتم: وەلامی امیر المؤمنین بدەرەوە، بەپەلە هات و گوتی: بۆ چی بەخۆت هاتی نەتنارد بە شوێنم؟

خەلیفە گوتی: قسەمان بۆ بکە ڕەحمەتی خوات لێ بێت، ئەویش نزیکەی کاتژمێرێك قسەی بۆ کرد بەڵام هیچ کاریگەرنەبوو بۆ خەلیفە، پاشان خەلیفە گوتی: ئایا قەرز داریت؟ گوتی: بەڵێ خەلیفە بە فضیل ی گوت: قەرزی بۆ بدەوە ئەی عەبباسی! ئینجا ڕۆیشتین لە رێگادا خەلیفە گوتی: ئەوهاوڕێەت هیچ سودێکی پێ نەگەیاندم، پیاوێکی زاناو لە خوا ترسم بۆ بدۆزەرەوە تاکو پرسیاری دوا ڕۆژو حەشرو حیسابی لێ بکەم ! گوتی: ئەوەتا ماڵی – فضیل ی کوڕی عیاض – کە بەڕاستی پیاوێکی زۆر زاناو دانا و لە خوا ترس و دنیانەویست بووە، چووینە لای کە لە دەرگاماندا.

بینیمان لە ناونوێژ بوو خەریکی خوێندنەوەی ئایەتێکی قورئان بوو هەر دووبارەی دەکردەوە، کاتێ تەواو بوو گوتی کێیە؟ گوتم وەلامی امیر المؤنین بدەرەوە ! گوتی جا من ئیشم چییە بە امیر المؤمنین؟!

گوتم: سبحان الله گوێ ڕایەڵی امیر المؤمنین ناکەیت؟

دەڵێ: لە شوێنێکی بەرزبوو دابەزی هات دەرگای کردەوە — بەناداڵێ پاشان چووە شوێنی خۆی چراکەی کوژاندەوە وخۆی سوڕاند بۆ سوچێکی ژوورەکەی، ئێمەش چووینە ژوورێ دەستمان لە زەوی دەدا تاکو پێش خۆمان ببینین لەبەرتاریکی دەستمان بۆ لای ئەو درێژ دەکرد بەلام دەستی خەلیفە بە پێش من کەوت و ئەو پێشتر دۆزیەوە، فضیل گوتی: دەستێکی چەند نەرم وناسکە ئەگەر بەیانی لە عەزابی خوا رزگار بێ لە دڵی خۆم گوتم: وابزانم ئەو شەو گەیشتینە پیاوێکی چاك وباش وەخاوەن دڵێکی پاك و بێگەرد، خەلیفە پێی گوت: دەی قسەمان بۆ بکە چونکە بۆ ئامۆژگاریەکانت هاتووین.

فضیل گوتی: بزانە کاتێ عُمری کوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفە بانگی چەند زانای گەورە و پایە بەرزی کرد وەکوو سالمی کوڕی عبدالله و محمدی کوڕی کعب— القرظي — و رجاءي کوڕی حیاة.

پێی گوتن: بەڕاستی تووشی ئەو بەلایە هاتووم مەبەستی پۆستی خەلافەت بوو — کەواتە ئامۆژگاریم بکەن و بیرو ڕاتان بۆ باس بکەن دەبینی ئەی خەلیفە، عمری کوڕی عبدالعزیز خەلافەت بەبەلاو نەهامەتی ئەژمار کرد، بەلام ئایا تۆ و هاوڕێکانت بە نیعمەت وخۆشی و لەزەتی ژیان ئەژماری دەکەن؟!

ئینجا سالم ی کوڕی عبدالله بەخەلیفەی راشیدی گوت: ئەگەر دەتەوێت

لە عەزابی خوا ڕزگارت بێ، لە دنیادا بە ڕۆژوو بە، بەیانیشی لە دوای مردن فتار بکەرەوە و ڕۆژووەکەت بشکێنە.

محمدی کوڕی کعب – یش گوتی: ئەی خەلیفە ئەگەر دەتەوێ رزگارت بێ لەعەزابی خوا ئەوە با گەورە پیاوانی موسلمانان باوکت بن وناوەنجینەکەش برات و بچوکەکەش ڕۆڵە و نەوەت بن، ئینجا ڕێز لەباوکت بگرە وشەرمی لێ بکە و بەچاوێکی گەورە وڕێزەوە سەیری برات بکە، وەبە لوتف ومیهربان بە بەرامبەر بە ڕۆڵەو نەوەکانت.

– رجاء ي کوڕی حیاة–یش پێ گوت: ئەی خەلیفە ئەگەر دەتەوێ لە عەزابی خوا ڕزگارت بێ، ئەوا چیت بۆ خۆت پێ خۆشە بۆموسلمانانیشت پێ خۆش بێ وەچیت بۆ خۆت پێ ناخۆشە دەبێ بۆ موسلمانانیش پێت ناخۆش بێت.

ئینجا ئەگەر حەز دەکەیت بۆ خۆت بمرە – واتە ئاسوودە بە ئینجا فضیل بەردەوام بوو لەسەر ئامۆژگاری کردنی خەلیفەی بغدا، وگوتی: منیش ئەو ئامۆژگاریانەت دەکەم، وەترسم هەیە لەسەرت بۆ ڕۆژێك کە قاچەکانم خلیسك دەبەن و ڕزگارت نابێ، ڕەحمەتی خوات لێ بێ ئەی خەلیفە ئایا تۆش زاناو پیاوی ئەوهات لەدەورو بەرن؟ کە بەوشێوە ئامۆژگاریت بکەن وهەڵەکانت ڕاست بکەنەوە؟

دەڵێ: لەوکاتەدا هارون الرشید زۆر گریا تاکو بێ هۆش بوو، منیش گوتم: بەزەییت بە امیر المؤمنین دا بێتەوە زۆر ئازاری مەدە!

فضیل گوتی: ئەی کوڕی دایکی ربیع تۆ و هاوڕێکانت دەیکوژن منیش ڕەحمی پێ بکەم؟

پاشان بەهۆش خۆی هاتەوە گوتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێ زیاتر ئامۆژگاریم بکە! فضیل گوتی: ئەی أمیر المؤمنین بیستوومە کە عمری کوڕی عبدالعزیز والی یەکی هەبوو شکایەتی والی یەکەی هاتەلای ئەویش نامەیەکی بۆ نارد وتێیدا نووسیبوو (ئەی براکەم بیری شەوە درێژەکانی بێ خەو خواردن بکەرەوە لەناو ئاگری دۆزەخ لەگەڵ مانەوەی هەتاهەتایی لەوێ، چونکە ئەوە ڕاتدەکێشی بۆلای دەرگای خوا جا چ نووستوو بیت یان بێدار، وریابە لەوەی کە لەلای خوا دەربکرێیت بەرەو ئاگر بەڕێ بکرێیت ئەوکاتە ئومێدوتامە دەپچڕێ و کۆتایی تەمەن و ناگەڕییتەوە سەر دونیا بۆ چاکە کردن کاتێ نامەکەی خەلیفەی خوێندەوە، ڕیگای گرتەبەرو شارو دێهاتی لوول دان بەڕۆیشتنی تاکو چووە خزمەت خەلیفە گوتی: چەند زووهاتیت چۆن ئەوها بەپەلە هاتیت؟

گوتی: دڵم شەق بوو بەنوسراوەکەت تاکو دەمرم بۆت نابم بەوالی لە هیچ شوێنێك.

دەڵێ: هارون الرشید زۆر گریا: پاشان گوتی: ڕەحمەتت لێ بێ زیاتر ئامۆژگاریم بکە!

فضیل گوتی: ئەی ڕوخسار جوان تۆ ئەو کەسەی کە خوا پرسیارت لێ دەکات لەسەر ئەوەی کە بوویتە گەورەی ئەو خەڵکە، ئەگەر دەتوانی ئەو

روخسارەت لە عەزابی خوا رزگار بکەیت ئەوا رزگاری بکە، بەلام وریابە نەکەی بەیانی وئێوارە بکەیتەوە غەش و فێلّ لە قەومەکەت بکەیت دیسان هارون الرشيد دەستی کردە گریان و پاشان گوتی: قەرزداریت؟ فضيل گوتی: بەلّێ قەرزی خوام کە لێپرسینەوەم لێی ناکرێ لەسەری بەلام هاوار بۆ خۆم ئەگەر داوای قەرزم لێ بکرێت هاوار بۆ خۆم ئەگەر موناقەشەم لەگەلّ بکرێت لەدوا رۆژدا لەسەر قەرزی خوا، هاوار بۆ خۆم ئەگەر هیچ بەلّگەی راست ورەوام بێی نەبێ.

گوتی: مەبەستم ئەوە نییە مەبەستم قەرزی خەلّکە، فضيل گوتی: خوا ئەمری پێ نەکردووم بەوە، بەلّکو ئەمری پێ کردووم کە راست گۆ بم لەوەعدو بەلّێن دا، وەگوێ رایەلی فەرمانەکانی بکەم ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾ ﴾ الذاريات: ٥٦ – ٥٨

هارون الرشيد گوتی: ئەوە هەزار دینار بۆ خۆت و خێزانەکەت خەرجی بکەوە خۆت پێ بەهێز بکە بۆ خوا پەرستی.

فضيل گوتی: یا سبحان الله!! من رێگای نەجات ورزگاربونت پێ نیشان دەدەم تۆش باسی چی دەکەیت، خوا سەلامەتت بکات وخوا رێنماییت بکات پاشان خۆی بێ دەنگ کرد و هیچ قسەی لەگەلمان نەکرد.

هاورن الرشيد پێی گوتم: ئەگەر پیاوێکت پێ نیشان دام، پیاوێکی ئەو

هام پێ نیشان بدە، بەڕاستی ئەوە گەورەی هەموو موسلمانانی ئەمڕۆیە، ئینجا ویستمان دەربچین وبڕۆیین.

هەر لە نزیك دەرگاکەیان بووین گوێم لە ئافرەتەکەی بوو دەیگوت: ئەوە چییە لەناو ئەو وەزعە ناخۆش و دەردەسەریە داین بۆ چی پارەکەت وەرنەگرت لێ بەڵکو کەمێك حاڵمان باش دەبو، فضیل گوتی: نموونەی من و ئێوە وەکو قەومێك وایە، کەوشترێکییان هەبێ لەبەروبوومی ماندووبونی وشترەکە دەخۆن وکاتێ پیربووپەکی کەوت یەکسەر سەری دەبڕن و گۆشتەکەی دەخۆن کە خەلیفە گوێ لەو قسانە بوو پێ گوتم وەرە بابگەڕێینەوە بەڵکو ئەو پارەیەمان لێ وەردەگرێ،

کاتێ چووە لای فضیل چوو لەسەر بانێك دانیشت کە خۆڵ بوو خەلیفەش لە تەنیشتی دانیشت هەرقسەی لەگەڵ دەکرد و داوای وەرگرتنی پارەی لێ دەکرد بەڵام فضیل هەر وەڵامی نەدەدایەوە، لە ناکاو خزمەتکارێکی ڕەش پێست هات و گوتی ئەرێ بۆ ئەوەندە شێخ ئەزیەت دەدەیت ئەم شەوە زۆر ئازارت دا، بڕۆ بۆ لای کاری خۆت ڕەحمەتت لێ بێ فضیل ی کوڕی ڕەبیع دەڵێ ئێمەش ڕۆیشتین – هیچی لێ وەرنەگرتین.[1]

(ئاگاداری) ئەو بەسەرهاتە هاتووە لە ژمارە (٥٧)ی بەرگی یەکەم بەڵام بەشێوازێکی تر کە ئیمامی – الذهبي – نەقلی کردووە لە – سير اعلام النبلاء–دا

---

( ١) صحيح وصايا الرسول/المجموعة الثانية–بەرگی(٣) لاپەڕە(٣٨٠)




لەبەرگی یەکەم: فضیل ی کوڕی ربیع – هاتووە

لەبەرگی دووەم: فضل ی کوڕی ربیع – هاتووە

## ٤١٩- مەکحول ویزیدی کوڕی عبدالملك

ڕۆژێکیان زانای پایەبەرزو گەورە زانای شام مەکحول لە نێو قوتابیەکانی دانیشتبوو لەناکاو خەلیفەی ئەمەوی یزیدی کوڕی عبدالملك بەخۆی وبە داروودەستی ڕووی کردە کۆڕو مەجلیسیان ویستی لەلایان دابنیشێ، قوتابیەکان ویستیان شوێنی بۆ بکەنەوە و کۆڕو مەجلیسەکە زیاتر فراوان بکەن و وەکو ڕێزێك بۆ خەلیفە بەڵام مەکحول کە زۆر لە خوا ترس وزانا و پایەداربوو گوتی: لێ گەڕێن لە هەر کوێ دادەنیشێ با دانیشێ فێری ملکەچی و تەوازوع دەبێ [1].

## ٤٢٠- ئەگەر ئەوان بیخۆن دەچێتە ژێر عەرشی خوا

حماد ی کوڕی ابو حنیفە دەڵێ :

ڕۆژێك خزمەتکارێکی داودی طائی گوتی: بەداودی طائی: دەمەوێ خواردنێکی چەورت بۆ ئامادە بکەم داود گوتی: منیش پێم خۆشە خزمەتکارەکە دەڵێ: خواردنەکەم بۆی ئامادە کردو بردم بۆ خزمەتی بە خزمەتکارەکەی گوت: منداڵە هەتیوەکانی فلانی چیان بەسەرهات؟

---

( ١) قصص الصالحين. د. مصطفى مراد لاپەڕە (١٦٠)






گوتی: وەکو خۆیان لەسەر حاڵی جارانن

داود گوتی: برۆ ئەو خواردنە بدە بەوان با ئەوان تێر بن نەك من خزمەتکار گوتی: تۆ لەوەتەی چەند ڕۆژە هیچت نەخواردووە چۆن شتی وا دەبێ؟

داود گوتی: ئەگەر ئەو خواردنە بدەیتە ئەوان و بخۆن، ئەوا دەچێتە ژێر عەرشی خوا، بەلام ئەگەر من بیخۆم بێگومان دەچێتە ناوزگم ورگم پڕ دەکات وبەس[1].

## ٤٢١- چۆن هاتۆتە دنیا ئەوهاش دەرچووە !

عباس ی کوڕی دەهقان دەڵێ: هیچ کەسێکم نەبینوە کە دەرچوو بێ لە دنیا وەك ئەوەی کە هاتبێتە دنیا تەنها – بشر کوڕی حارث – نەبێ، لەوکاتەی نەخۆش بوو پیاوێك هاتە لای شەکوای حاڵی لەلاکرد ئەویش کراسەکەی خۆی داکەندو پێیدا، کاتێ وەفاتی کرد کراسێکیان بە ئەمانەت وەرگرت بۆی[2]

---

( ١) صحيح وصايا الرسول المجموعة الثانية، بەرگی (٢) لاپەڕە(٣٠)

( ٢) هەمان سەر چاوە المجموعة الثانية بەرگی (٢) لاپەڕە (٣٠)






## ٤٢٢- بلیمەتی ئیمامی احمد ( رحمه الله )

عبدالرحمن ی کوڕی ئیمامی احمد دەڵێ :

کومەڵێك خەڵك لە پیاوانی فەرموودە گێڕەوە ئامادەی کۆڕو مەجلیسی ابو عاصم ی – الضحاك – بوون، پێیانی گوت: ئایا ئێوە دەتانەوێ خۆتان شارەزا بکەن و کەچی هیچ کەسێکی شارەزاو فەرموودە زانتمان تێدا نییە؟

هەر بەو شێوە ابو عاصم سەرزەنشتی دەکردن وقسەی پێ دەگوتن – گوایە لەو کۆڕەدا کەسی شارەزا و فەرمودەناسی لێ نەبووە، ئینجا گوتی: ئایا کەسێکی شارەزا و فەرمودەناسا نییە لەگەڵتان بێ کە سوودی لێ وەرگرن؟ گوتیان: بەڵێ پیاوێکی زۆر زاناو شەرەزا و فەرموودە ناسمان تێدایە.

ابو عاصم گوتی: کێیە؟

گوتیان: دوای کاتژمێرێك دێت بۆ کۆڕەکەمان ئینجا عبدالرحمن دەڵێ: کاتێ باوکم هات – الامام احمد هەموو گوتیان: ئەوا هات ابو عاصم سەیرێکی کرد و فەرمویی لێ کردو پێی گوت وەرە لای من دانیشە!

ئیمامی احمد فەرمویی: پێم ناخۆشە بەسەر پشتی خەڵك خۆم پا بدەم وئازاریان بدەم، ابو عاصم گوتی: ئەوە نیشانەی شارەزایەتی یەتی وەنیشانەی وەرگرتنی ئامۆژگاری یە لەو فەرموودانەی کە لەبەری یەتی، ئینجا ابو عاصم گوتی: کۆڕەکە کەمێ فراوان بکەن! ئینجا هات دانیشت و ابو عاصم لە تەنیشت خۆی دانا بەڕێزەوە وپاشان پرسیارێکی لێ کرد،






ئەویش دەست بەجێ وەڵامی دایەوە، پرسیارێکی تری لێ کرد وەڵامی دایەوە، پرسیاری سێ یەم و چوارەمی لێ کرد وەڵامی دایەوە،

که ابو عاصم ئەمەی بینی لە ئیمامی احمد گوتی:

بەڕاستی ئەوە لەوکەسانەیەکە لە نێو دەریادا دەڕۆن وزانستیان وەکو شەپۆلی دەریا وایە[1].

## ٤٢٣- بۆ چی بەبێ پێڵاو ناڕۆی تاکو قاچەکانت زبر بن؟

عبدالله کوڕی ئیمامی احمد دەڵێ :

ڕۆژێکیان دانیشتبووم لەلای باوکم سەیری هەردووقاچی کردم کە زۆر نەرم وناسك وبێ قەڵش بوون، پێی گوتم: ئەوە چییە ئەو قاچانە بۆ چی بەبێ پیلاو ناگەڕێیت تاکو قاچەکانت زبر و قەڵش داربن؟

عبدالله دەڵێ: باوکم بەبێ خواسی چۆتە شاری طرسوس بەبێ ئەوەی سواری هیچ پێڕۆیەك ببێ.

ئینجا دەڵێ: باوکم لە هەموو کەس زیاتر خۆڕاگر بوو لەسەر تەنیایی لەکاتی ڕۆیشتن ودانیشتندا، کەس نەیدەبینی مەگەر لە مزگەوت ولەسەر جەنازە وسەردانی نەخۆش نەبا، دەڵێ: زۆریش ڕقی لە ڕۆیشتن دەبووە لە بازاڕەکان[2].

---

( ١) ١٠٠٠ قصه وقصه من حياه الائمه الاربعه / لاپەڕە (٣٦٨)

(٢) ١٠٠٠ قصة وقصة من حياة الائمة الاربعة. لاپەڕە(٣٧٠)






## ٤٢٤- مەچوو بۆ ئەوشارە

ربيع ی کوڕی سليمان دەڵێ :

پێشەوای دنیاودین (ناصر السنه) ئیمامی شافعی دەفەرمووێ: ئەگەر ویستت بچیتە شارێك كە هیچ پاشاو دادەوەرێکی ڕاست و دادپەروەرو ئاوێکی جاری و پزیشکێکی نەرم ونیانی لێ نەبوو، ئەوا باشتر وایە نەچیتە ئەوشارە، چونکە ئەو شارە وێران وچۆڵە وەهیچ سوودێکی نییە بۆت تەنها زیان و زەرەر نەبێ[1].

## ٤٢٥- غەمبار مەبە بەوەی کە خەڵکی سپڵە بن بەرامبەرت

ئیمامی احمد لە کتێبی (الزهد)دا دەفەرمووێ :

خوای گەورە دەفەرمووێ: سەیرم دێ بە تۆ ئەی ئادەمیزاد: بەخۆم دروستم کردوویت کە چی غەیری من دەپەرستی وکرنۆشی بۆ دەبەیت، وەمن ڕزق وڕۆزیت پێ دەدەم کە چی تۆ سوپاسی کەسێکی تر دەکەیت خۆم خۆشەویست دەکەم لەلات بەوەی کە نازو نیعمەتت بەسەردا دەڕێژم، کە چی هیچ پێویستیشم بە تۆ نییە، تۆ خۆت لەلای من وا لێ دەکەیت کە ڕقم لێت بێت بە گوناه کردن، کە چی زۆریش پێویستیت بە من هەیە، چاکەم بۆ لای تۆ دادەبەزێ وشەڕو خراپەت بۆلای من بەرزدەبێتەوە.

(١) ١٠٠٠ قصة وقصة من حياة الائمة الاربعة، لاپەڕە (١٤٧)



هەروەها لە ژیان وبەسەرهاتی حەزرەتی عیسی دا هاتووە کە زیاتر لە ٣٠ دانە نەخۆشی چارەسەرکردوون وەچەندین کەسی نابینای بەیارمەتی خوا چاك کردۆنەتەوە ئینجا لە دژی ئەو هەڵس و کەوتیان دەکرد وهەڵدەگەڕانەوە لە ئاینی مەسیحیەت [1].

## ٤٢٦- لەسەر کردەیی بۆ دارتاشی

علی ی کوڕی مەئموونی عباسی، گەورە و سەرکردەو کوڕی خەلیفەی بغداد، لە کۆشکێکی گەورە زەبەلاح دادەنیشیّ زۆر بە ئاسانیش هەموو ماڵی دنیای لەلا دەست دەکەویّ ڕۆژێکیان لەسەر بانی کۆشك سەیرێکی ئەو خوارووەو دەوروبەری کرد بینی کرێکارێك بە درێژایی ڕۆژەکەی کاردەکات و عەرەق دەرێژی و زۆر ماندووە، کاتیّ دەبێتە بەیانی وچێشتەنگاو دەسنوێژێك هەڵدەگریّ و دوو ڕەکعات نوێژ لەسەر کەناری ڕووباری دیجلە دەکات، کاتیّ دەبێتە نزیکەی خۆرئاوابوون دەڕواتەوە ماڵیّ، ڕۆژێکیان علی سەرکردەو کوڕی خەلیفە بانگی ئەو کرێکارەماندووە دەکات وپرسیاری لیّ دەکات سەبارەت بە بارودۆخی ژیان و گوزەرانی، ئەویش هەواڵی خێزانەکەی پیّ ڕادەگەیەنیّ کە هاوسەرێکی هەیە لەگەڵ دوو خوشك و دایکێك، کە کرێکارێکی بەئازارو ئەشکەنجە دەکات بۆیان، وەهیچ شتێکی نییە لەماڵی نەقووتی خواردن نەپارەهەڵگرتن تەنها ئەوە نەبیّ کە لە بازار پەیدای دەکات

---

(١) لاتحزن، د. عائض القرني، لاپەڕە (١١٠) چاپی چواردە / ١٤٢٥

بەدەستی خۆی، هەروەها هەواڵی پێدا کە هەموو ڕۆژێکیش بەڕۆژووە وبەربانگ دەکاتەوە بەوخواردنەی کە پەیدای دەکات،

کوڕی خەلیفە گوتی: داوای چی دەکەیت؟

گوتی: سوپاس بۆ خوا داوای هیچ شتێ ناکەم.

ئینجا ئەو ڕووداوە کاری لەو سەرکردەیە کردوو وازی هێنا لە کۆشکی و گەورێتی، خۆی خستە سەر ڕوخساری لە ترسی خوا تاکو مردن، دوای چەند ساڵێك بینیان کە مردووە، ئینجا کە وازی هێنا لەدنیا دەستی کرد بە کاری دارتاشی لەناوچەی خوراسان چونکە بینی بەختەوەری لەو کارەی دایە نەك لەگەورێتی وسەرکردەیی (والذين اهتدوا زادهم هدى واتاهم تقواهم)[1].

واتە: ئەو کەسانەی کە هیدایەتیان وەگرتووە خوا شارەزاییان زیاد دەکات وتەقواو پارێزگاریان پێ دەبەخشێ

لەگەڵ ئەو بەسەرهاتە یارانی ئەشکەوتم هاتوە بیر کە لەبەر ڕەزامەندی خوا وازیان لە کۆشکی پاشاو پلەی گەورەیان هێنا وپەنایان بردە بەر قاپی خوا لە شەکەوتێ: کە بەڕاستی بەختەوەری خۆشی زۆر زیاتر تێدابوو لەو خۆشیەی کە لەلای ئەو پاشایە هەبوو، چونکە زانیان کە کوفرو بێ دینی لەو کۆشکەدا نیشتەجێ یە بۆیە گوتیان بە یەکتری (پەنابەرن بۆ ئەو ئەشکەوتە خوا ڕەحم وبەزەیی خۆی دەبارێنێ بەسەرتان و کارەکانتان لەگەڵتان ئاسان

---

(١) سورە محمد (١٧).




دەکات بۆتان) (رحب الفضاء من الاعداء ضيقة، سم الخياط مع الاحباب ميدان) واتە: فراوانی ئاسمان لەگەڵ دوژمنان تەنگی وناخۆشی یە بەڵام کونی دەرزی لەگەڵ دۆستان فراوانی ومەیدانە)[1].

## ٤٢٧- ستەمکاران و تۆڵەی پەروەردگار

سفیان ی – الثوری – رەحمەتی خوای لێ بێت، خۆی دەشارێتەوە لەبەر هەڕەشە لێکردنی خەلیفەی بغداد ابو جعفر – المنصور– بۆیە بەدوای دەکەوێ ودەیەوێت بڕوات بۆ حەرەمی مەکەی پیرۆز لەوێ بیکوژێ – ئەو حەرەمەی کە ئیمامی عمر دەفەرموێ، ئەگەر بکوژی دایکم لە حەرەمی مەکە بدۆزمەوە نایکوژم دەبێ لێم دڵنیابێ (ومن دخله كان امنا) ئینجا سفیان دەچێتە نێو حەرەم و ژێر دیواری کەعبەی پیرۆز هەڵدەستێ دەستی بە پەردەی کەعبەوە دەگرێ وخۆی پێ هەڵدەواسێ ودوعا دەکات لە خەلیفە ودەڵێ: ئەی خوایە ڕێگە بە ابو جعفر نەدەیت کە بێتە ماڵەکەت.

ابو جعفر هەر لە ڕێگا بە پەلە دێت بۆ کوشتنی سفیان لە حەرەم بەڵام نازانی تیری دوعا بەجەرگی ئاسمان کەوتووە بۆیە لەلای بیری مەیموون پێش هاتنی بۆ شاری مەکە دەمرێ و ناگات بە ئاواتی.

– هەروەها – احمدی – کوڕی ابو دؤاد معتزلی – کە لە ئازاردانی

---

(١) لا تحزن، عائض القرني، لاپەڕە (٢٢٨)






پێشەوا – احمدی کوڕی حنبل بەشداری دەکرد ولەبەندیخانە ئازاری دەدا ئیمامی احمد یش دوعایان لێدەکات

خوای گەورە تووشی نەخۆشی شەلەلی دەکات وەدەڵێت: نیوەی لاشەم ئەگەر پێشوولەیەك بکەوێتە سەری وادەزانم قیامەت ڕابووە بەسەرم، بەڵام نیوەکەی تر ئەگەر بە ئاسن ی سوورکراوە لێی بدرێت هیچ هەستی پێ ناکەم

– وەك ئەوان حمزە – ی بەسیونی لە مصر لە بەندیخانەکانی سەرکردەی تاغی جمال عبدالناصر ئازاری موسڵمانەکانی دەدا بەهەموو جۆرێك کە بۆی بکرایە، چ بەلێدان و قامچی بە کارهێنان وچ بە قسەی پڕ لە ئازارو ناشیرین بەرامبەریان.

هەتا دەڵێن یەکێك لەقسە ناشیرینەکانی ئەوەبوو بە موسڵمانێکی گوت: کوا خواکەتان تاکو بیخەمە ناو ئاسن و پۆلا، (تعالى الله عما يقول الظالمون علوا كبيرا) دەڵێ تووشی تێکشانی سەیارەهات و سەیارەکەی تێکشا لە ڕێگایەك لە نێوان قاهیرەو ئەسکەندەریە، لەگەڵ شاحینەیەکی گەورەی بارهەڵگر کە تەنها ئاسن و پۆلای بار کردبوو، دەڵێ پارچە ئاسنێکی چووە ناو لاشەی لەناوەڕاستی سەری لە خوارەوەی هاتە دەرێ، بەڵام کەس نەیتوانی ئەو ئاسنە دەربکات لەلاشەی تەنها بە بڕینەوەی لاشەی نەبێ، کردیان بە پارچە پارچە، (واستكبر هو وجنوده في الارض بغير الحق وظنوا انهم الينا لا يرجعون) واتە: فیرعەون و لەشکرەکەی خۆیان بەگەورە زانی لەسەر زەوی بەناڕەوایەوە وایان زانی کە بۆ لای ئێمە ناگەڕێنەوە.






(وقالوا من اشد منا قوة اولم يروا ان الله الذي خلقهم هو اشد منهم قوة) واته قەومی عاد گوتیان کێ هەیە لە ئێمە بە هێزتر، ئایا نازانن ونابینن کە ئەو خوایەی ئەوانی دروست کردووە زۆر لە ئەوان بەهێزترە[1].

## ٤٢٨- ئامۆژگاری حەکیم بۆ حەکیمێکی تر

ئیمامی شافعی دەفەرمووی :

حەکیمێك نامەیەکی نارد بۆ حەکیمێکی تر کە هاوڕێ بوو، لەونامەیەدا نوسرابوو: (ئەی برام.. ! بەڕاستی خوا زانستێکی پێ بەخشیوی وریابە بە تاریکی گوناهو تاوان پیسی نەکەیت و لێت ون نەبێ ! ئینجا لە ناو گوناهو تاوان تاریکی دەمینیتەوە، تا ئەو کاتەی کە ئەهلی عیلم و زانست ڕێ ڕوونیان بۆ دەکرێت وبە نوورو ڕۆشنایی زانستەکەیان دەڕۆن)[2].

## ٤٢٩- لەوەتەی سێ دانە ساڵە حاڵمان ئەوهایە

ئیمامی شافعی دەفەرمووێ :

پیاوێکی دەشتەکی چووەلای خەلیفە عبدالملك ی کوڕی مروان –

(١) بەدەسکاریەوە لە کتێبی (لاتحزن) د. عائض القرني لاپەڕە (٣٠٥) چاپی / ١٤-٤-٢٠٠٤ ز

(٢ ) ١٠٠٠ قصة وقصة من حياة الائمة الاربعة لاپەڕە (١٤٩)





لەولاتی شام سەلامی لیٚ کردو گوتی: ئەی امیر المؤمنین ڕەحمەتی خوات لیٚ بیٚ لەوەتەی سیٚ دانە ساڵە حاڵمان ئەوهایە، ساڵی یەکەم هەمو ئاژەڵەکان لەناو چوون، ساڵی دووەم گۆشت نەماو، وشك بوو، ساڵی سیٚ یەك، گەیشتە سەر ئیٚسقان، ئیٚستاش تۆ ماڵت هەیە، ئەگەر ئەو ماڵە ماڵی خوایە بیدە بە بەندەکانی خوا وەئەگەر هی خۆتە بیکە بە خیٚرو سەدەقە، چونکە خوا پاداشتی بەخیٚری ئەو کەسانە دەداتەوە کە خیٚر دەکەن.

ئینجا خەلیفە کە ئەمەی بیست دەهەزار (١٠٠٠٠) درهەمی پیٚدا وگوتی: ئەگەر خەڵکی ئەوها چاکە کارو بەوشیٚوە پرسیار بکەن هەرگیز کەسمان بیٚ بەش نەدەکرد[1].

## ٤٣٠- بۆ ئەوەی کە خاوەن دڵ بیٚت

تنوخی دەڵیٚ: لە شاری بغداد وەزیریٚکی ستەمکار هەبوو جاریٚکیان ستەم لە پیریٚژنیٚك دەکات ودەست بەسەر ماڵەکەی دادەگریٚت ومافەکانی هەمووی لیٚ وەردەگریٚتەوە.

پیرەژنەکەش بە چاوی پڕ لە گریانەوە دەچیٚتە لای شەکوای حاڵی خۆی لەلادەکات و باسی زوڵم وستەمی ئەوی لەلادەکات، بەڵام هیچ کاری تیٚناکات و تۆبە ناکات.

پیرەژنەکە دەڵیٚ: بانگی خوا دەکەم و دوعات لیٚ دەکەم کار بەدەستەکە

---

( ١) ١٠٠٠ قصة وقصة من حياة الائمة الاربعة، لاپەڕە (٢١٤)






پێدەکەنی بە گاڵتە وەپێی دەڵێ: ئەگەر دوعاش دەکەیت لە کۆتایی نیوەی شەو بیکە چونکە دوعا لەو کاتەدا قەبولە ئەمە بە گاڵتە وەردەگرێ لەبەر زوڵم وستەمی، بەڵام پیرەژنی داماوو ستەم لێکراو بەردەوام دەبێ لەسەر کۆتایی نیوەی شەو دوعا دەکات ولەدەرگای ئاسمان دەدات، لە ناکاو خوا وەڵامی دەداتەوە، کەمێکی پێ دەچێ ئەو وەزیرە لە گەورێتی ودەسەڵات دا دادەبەزێندرێ و ماڵی هەموی لێ وەردەگیردرێتەوە و زەویەکانی لێ دەسێندرێتەوە، پاشان بەوەش وازی لێ ناهێنین دەیبەن لە بازار دارکاری دەکەن چونکە خەڵکی چەوساندۆتەوە و ستەمی لێ کردوون، قەدەری خوا وادەبێ پیرەژنەکە بەوێ تێپەڕدەبێ وپێی دەڵێ: احسنت.. ئافەرین ڕاستت کرد پێت گوتم کۆتایی نیوەی شەو دوعا قەبوولە تاقیم کردەوە وابوو دوعام چاك قەبوول بوو[1].

## ٤٣١- هۆكار چییە ڕۆخسارت ئەوها دەدرەوشێتەوە؟

زیدی کوڕی اسلم دەفەرمووێ :

چەند پیاوێك چوونە لای ابو دجانە کە نەخۆش بوو، بینیان ڕوخساری زۆر جوان و نورانی بوو لە دوورەوە دەدرەوشایەوە، بۆیە پێیان گوت: هۆکار چی یە روخسارت ئەوها دەدرەوشێتەوە؟

---

( ١) صحيح وصايا الرسول، المجموعة الثانية بەرگی (٢) لاپەڕە (٢٠٣)



فەرمووی: هەر کردارێکم ئەنجام دابێ ئەوها متمانەم پێ نەکردووە وەك ئەوەی کە متمانەم بە دوو شت کردووە.

یەکەمیان: هەرگیز قسەم نەکردووە لە بارەی شتێك کە پەیوەندی بە خۆمەوە نەبێ.

ئەوەی تریان: دڵم هەردەم بەرامبەر بە موسڵمانان پاك و بێگەردبوو وەهیچ کات ڕق وقینە وغەشم لەدڵ نەبووە بەرامبەر هیچ کەسێك [1].

## ٤٣٢- لە شوێنێك خۆم بە گەورە زانی کە خەڵکی تێیدا ملکەچ دەبن

عمروی کوڕی شیبە دەڵێ: لە مەکە بووم لە نیوان – صفا و مروەدا – پیاوێکم بینی لەسەر پشتی ئێسترەکەی بووە هەندێ منداڵی لەدەوروبەربوون وەکو خزمەتکار خەڵکیان لێ لادەدا و تاکو ڕێگای بۆچۆڵ بکەن، وەخەلکیان ئازار دەدا لەبەر خاتری ئەو، دوای ماوەیەك گەرامەوە بغداد و لەسەر جسرێك پیاوێکی قژ ئاڵۆزو وشکم بینی سوالی دەکرد، زۆر سەیرم دەکرد وبیرم لێ دەکردەوە پیاوەکە گوتی: خێرە ئەوها سەیرم دەکەیت؟ گوتم: بە پیاوێکت دەشوبهێنم لەمەکە بینیم، ئینجا بەتەواوی وەسفم بۆی کرد، گوتی: بەڵێ منم ئەو پیاوە پێم گوت: ئەوە خوا چی بەسەر هێناویت؟ گوتی: لە شوێنێك خۆم بەزلّ زانی کە خەڵکی لەو شوێنەدا خۆیان ملکەچ دەکەن ئینجا خوا نزمی کردم ودابەزاندم وبردمی بۆ شوێنێك کە خەلکی خۆیان بەگەورە دەزانن لەو شوێنەدا [2].

---

(١) صحيح وصايا الرسول / المجموعة الثانية، بەرگی (٢) لاپەڕە (١١٠)

(٢) احياء علوم الدين، بەرگی (٣) لاپەڕە (٣٤٣)




## ٤٣٣- ئیرادەیەك كە ئاسن دەشكێنێ

قوتابیێكی موسڵمان بۆ خوێندن كوچ دەكات لە خاكی ئیسلام بەرەو ڕۆژ ئاوا، لە شاری لەندەن بەخۆی، بۆ ئەوەی فێری زمانیان بیت لەگەڵ خانەوادەیەكی بەریتانی كافر لە ماڵیان دەژیت، وادیارە ئەو قوتابیە گەنجێكی لە خوا ترس و خۆگرە لە گوناه وتاوان، وەبەردەوامە لەسەر نوێژەكانی، لەو ماڵەدا لەگەڵ بەرەبەیان هەڵدەستێ ودەچێ بۆلای حەوزەكەیان بە ئاوی سارد دەسنوێژ هەڵدەگرێ و پاشان دەچێتە سەر بەرماڵەكەی نوێژ دەكات، سوجدە و ڕوكوع و تەسبیحات دەكات، پیرێژنێك لەو ماڵەدا زۆر بەوردی سەیری دەكات چەند جار ئەو شتە دووبارە دەبێتەوە لەو قوتابیە، بۆیە دوای چەند ڕۆژێك پرسیاری لێ دەكات وپێی دەڵێ، تۆ چی دەكەیت؟

قوتابیەكە دەڵێ: ئایینەكەم وا فەرمانم پێ دەكات.

گوتی: كەواتە بۆ چی بەو بەیانی یە زووە، كەمێ خۆت تاخیر بكە و خەوەكەت مەزەڕێنە دواتر هەستە ئەو كارەت ئەنجام بدە، قوتابیەكە گوتی: ئەگەر نوێژەكەم دوابخەم وپشوو بدەم خوای من لێم وەرناگرێ ودەبێ لەكاتی خۆی ئەنجام بدرێ، دەڵێ: پیرێژنەكە سەری خۆی هەژاند وگوتی: بەڕاستی ئەوە هێزو هیمەت و ئیرادەیە كە، ئاسن دەشكێنێ[1].

---

( ١) لا تحزن، د. عائض القرني لاپەڕە(٢٥٠)




## ٤٣٤- کەسێك لەبەرخاتری خوا وازبێنی لە شتێك باشتری پێ دەبەخشرێ

ڕۆژێکیان ئیمامی (علی) ڕەزای خوای لێ بێت، چووە مزگەوتی کوفەی عێراق بۆ ئەوەی دووڕەکعات نوێژی چێشت تەنگاو بکات بینی کوڕێك لەبەردەم دەرگا وەستاوە، پێی گوت: ئەی کوڕە ئێسترەکەم ببەستەوە و ئاگات لێ بێ تاکو نوێژ دەکەم، ئیمامی (علی) چووە مزگەوت، ویستی کە هاتە دەرەوە درهەمێك بدات بە کوڕەکە لە پاداشتی ئەو کارەی، کاتێ چووە ناو مزگەوت لە کوڕەکە ون بوو، هەستا لغاوی بیفرۆشێ، کاتێ ئیمامی (علی) هاتە دەرەوە بینی هیچ کەس لەلای ولاخەکەی نەماوە، وە ولاخەکەی بەبێ لغاو ماوەتەوە، ناچار پیاوێکی نارد بەشوێن کوڕەکە وپێی گوت: بڕۆ بۆ بازار بۆی هەیە بیفرۆشێ، پیاوەکە چووە بازار وکوڕەکە دۆزیەوە بینی کە خەریکە ئارایشی دەکات و بە درهەمێکی فرۆشت، ئینجا گەڕایەوە هەواڵی کوڕەکەی گەیاندە (ئیمامی علی) فەرمووی: سبحان الله سوێند بە خوا نیازم وابوو درهەمێکی حەڵاڵی بدەمێ بەڵام ئەو نەیویست تاکو حەڕامەکەی بۆ خۆی برد[1].

---

(١) لا تحزن، د. عائض القرني، لاپەڕە (٤١٨)






## ٤٣٥- بەخششی حاتەمی - طائي

ئیمامی شافعی دەفەرمووێ :

باوکی حاتەمی طائی پیاوێکی زۆر سەخی بوو، هەموو شتێکی لە شوێنی خۆی دەکرد، حاتەمی طائیش پیاوێك بوو زۆر زۆر زیاتر لە باوکی ماڵی دەبەخشی – باوکی ناوی لێنابوو دەست بڵاو ڕۆژێکیان هاوڕێکانی حاتەم لەلای باوکی دانیشتبوون، باوکی زۆر باسی حاتەمی لەلادەکردن ودەیگوت واللە نازانم چی لێ بکەم، هەر شتێکی دەکەوێتە بەردەستی یەکسەر خەرجی دەکات، ئینجا گوتی: هاوڕێیان چارە چی یە لەوە؟ دەڵێ: هەموو ڕاوبۆچوونی خۆیان کردەیەك لەسەر ئەوەی تاکو ساڵێك هیچی نەدرێتێ ڕۆژێکیان یەکێ دێتە لای باوکی حاتەم و پێی دەڵێ: حاتەم لە بارودۆخێکی تەسك و ناخۆشە وهیچی نەماوە، ناچار باوکی سەد و شتری سووری بۆ نارد، کاتی حاتەم ئەو شتەی بینی لەلای گوتی: کێ چەندی بۆ خۆێ دەوێ – لەوشترەکان – با بیبات بۆ خۆی خەڵکیش هات هەموویان برد، باوکی بانگی کرد و گوتی: ڕۆڵەکەم ئەوە چی دەکەیت بۆ چی وات لەوشترەکانت کرد بۆ هەموویت بەخشی؟

گوتی: باوکە گیان بەڕاستی زۆر ناڕەحەت و برسی بووم هەر کەسێك داوای شتێکی لێ بکردبام منیش پێم دەبەخشی، وامدەزانی وەکو من برسی یە و پێویستی پێ هەیە[1].

---

( ١) ١٠٠٠ قصة وقصة من حياة الائمة الاربعة، لاپەڕە (٢١٢)



## ٤٣٦- شەقی شەرمەزاری لە خۆی بدات

پێشەوا – المزني – دەفەرمووێ :

لە هەموو کەسێك ئەولاتر کە یەك جار شەقی شەرمەزاری و تەریق بوونەوە لە ڕومەتی بدات کەسێکە کە بچێتە سەر خوانێك نان بخوات کە بانگێشت نەکرا بێ، واتە: بێ ئەوەی پێی بڵێن فەرموو ئەو بەخۆی بڕوات بۆ ئەو ماڵە نان بخوات، وە لە هەموو کەسێ: ئەولاتر کە دووجار شەق لە ڕوومەتی خۆی بدات کەسێکە کەوا خاوەن ماڵ – لە کاتی هاتنی بە میوانی – پێی بڵێ فەرموو لێرە دانیشە بەڵام ئەو لەوێ دانەنیشێ، وەلە هەمو کەسێ: ئەولاتر کەسێ جار شەق لە ڕوومەتی بدات کەسێك کە – بە خاوەن ماڵ بڵێت بانگی خێزانت بکە یان دایکی مندالان بابێ لەگەڵ ئێمە نان بخوات[1].

## ٤٣٧- احمد ی کوڕی خضروية ودوا ساتەکانی ژیانی

لەوکاتەی پێشەوا احمدی کوڕی خضروية هاتە سەرمردن، یەکێك لە بارەی شتێکەوە پرسیاری لێ کرد، ئەویش فرمێسکی چاوانی باراندە سەر لاشەر وگوتی: ڕۆڵەکەم لەوەتەی نەوەدو پێنج ساڵە لە دەرگایەك دەدەم تازە والێم دەکرێتەوە، بەڵام نازانم ئەو دەرگایەم بە بەختەوەری لێ دەکرێتەوە یان بە لادان لە فەرمانی خوا و شەقی بوون؟

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە وەڵامم بدرێتە... [2]

---

( ١) ١٠٠٠ قصة وقصة من حياة الائمة الاربعة، لاپەڕە (١٢٢)

( ٢) قصص الصالحين، د.مصطفى مراد، لاپەڕە (٢٢١)




## ٤٣٨- نەمویست ئازاری بدەم

پیاوێك ئافرەتێکی مارەکرد، کاتێ چوولای بینی تووشی نەخۆشێکی وابووە کە خەڵکی ئەگەر بزانن بەچاوێکی سووك سەیری دەکەن — پیاوەکە دەست بە جێ گوتی: چاوم زۆر ئازاری هەیە، پاشان گوتی: چاوم نابینا بوو و هەر هیچ شتێ نابینم، ئەمەش لەشەرعدا دروستە — دوای بیست ٢٠ دانە ساڵ کە ئافرەتەکەی کۆچی دوایی کرد نەیزانی کە پیاوەکە چاو ساغ وبینایە، ئینجا خەڵکی پێیان گوت: بۆچی ئەوهات کرد؟ گوتی: نەمویست ئازاری بدەم و هەست بەوەبکات کە من دەیبینم ئینجا بەوەش تەریق دەبێتەوە بۆیە خۆم نابینا کرد بۆ ئەوەی هەروا بزانێ کە من هیچ عەیب وناریکێکم لێ نەبینوە[1].

## ٤٣٩- فریشتەکان لە خەودا فەرمانی پێدەکەن کە شەو نوێژ بکات

لە هەردووك صحیحی بوخاری ومسلم دا هاتووە، کە عبدالله کوڕی ئیمامی عمر دەفەرموێت: لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ)ئەگەر پیاوێك خەوێکی بینیبایە بۆ پێغەمبەری دەگێرا یەوە،

دەڵێ: منیش لەوکاتەدا کوڕێکی گەنجی سەڵت بووم، لەسەردەمی

---

( ١) قصص الصالحين، د. مصطفى مراد لاپەڕە (٩٧)






پێغەمبەردا لە مزگەوت دەنووستم، شەوێکیان لەخەومدا بینیم دووفریشتە منیان گرت و بردمیانە لای ئاگری دۆزەخ، دەبینم ئەو ئاگرە لوول بووە وەك بیر، وە دوو شاخی زۆر گەورەی هەبوون، هەندێ خەڵکیش کە دەمناسین لەناو ئەو ئاگرە دەگەوزان، منیش هەردە مگووت پەنا بە خوا لە ئاگری دۆزەخ، پەنا بەخوا لە ئاگری دۆزەخ، فریشتەیەك گەیشت بەو دوو فریشتانە وپێ گوتم: نەترسی!

ئەو خەوەم گێرایەوە بۆ (حەفسە) ی خوشکم – ئەویش چووە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بۆی گێرایەوە فەرمووی، باشترین پیاو عبدالله یە ئەگەر شەو هەستێ نوێژ بکات.

سالم ی کوڕی عبدالله کوڕی ئیمامی عمر دەفەرموێ: لەو ڕۆژەوە عبدالله ی باوکم کەمێك نەبێ لە شەونە دەخەوت[1].

## ٤٤٠- نازانی کەی دەگەڕێتەوە؟!

احمدی کوڕی سالم دەڵێ :

کەسێك لە دەرگای ماڵی ابراهیم ی – الخواص – ی دا

خوشکێکی هاتە دەرەوە دەرگاکەی کردەوە و گوتی: کێت دەوێ؟ پیاوەکە گوتی: ابراهیم ی الخواص –م دەوێت

---

( ١) قصص العابدين، لاپەڕە (١١) د. حامد احمد الطاهر



خوشکەکەی گوتی: دەرچووە...

پیاوەکە گوتی: کەی دەگەڕێتەوە؟

خوشکەکەی گوتی: کەسێك بردبێتیە دەرەوە ئایا بەدەست کەسێکی تره کە تۆ دەڵێی کەی دەگەڕێتەوە، کێ دەزانی کەی دێتەوە؟! ئەوەی بردویەتی بۆ دەرەوە هەر ئەویش دەیگەڕێنیتەوە.

## ٤٤١- تۆبەی فضیل ی کوڕی عیاض (رحمە اللە)

علی کوڕی خەشرەم دەڵێ: یەکێك لە دراوسێیەکانی – فضیل پێ ڕاگەیاندم و گوتی: فضیل ی کوڕی عیاض پیاوێك بوو بە تەنیا ڕێگری دەکردو ماڵی لە خەڵك دەستاندو ئازاری خەڵکی دەدا، شەوێکیان دەروچو لە ماڵ بە مەبەستی ڕێگری، کاروانێکی بینی بەشەو دەهاتنە لای ئەو، یەکێکیان بە ئەویتری گوت: بزانن! ئاگادار بن لەو گوندە پیاوێك هەیە ڕێگری دەکات پێ دەڵێن فضیل.

دەڵێ :ئەویش گوێ ی لەوە بوو زۆر ترسا و پێی گوتن ئەی خەڵکینەمن فضیل–م بۆ خۆتان تێپەڕن، سوێند بە خوا هەوڵ دەدەم کە جارێکی تر گوناهوتاوان نەکەم، ئینجا گەڕایەوە بە تەواوی وازی لەو کارەی هێنا.

لە ڕێگایەکی تر دەگێڕنەوە کە ئەو کاروانەی لەوشەوەدا بانگێشتی ماڵی خۆی کردن و بەڕێزی هێنان و خزمەتی کردن، پاشان پێی گوتن: ئێوە ئێستا دڵنیا بوون لە فضیل– ئینجا چوو هەندێ عەلەف بۆ وڵاخەکانیان هێنا و لە




کاتی گەڕانەوە بیستی یەکێك ئەو ئایەتەدە خوێنی: ﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴾ الحديد: ١٦ واتە ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ باوەڕدان کە دڵی یان نەرم بکەن بۆ بۆ یادی خوا؟

فضیل- دەیگوت بەڵێ.. سوێند بەخوا کاتی ئەوە هاتووە ئەمەش سەرەتای تۆبەکردنی فضیل ی کوڕی عیاض بوو. کە بەراستی بوو بە زانایەکی پایەبەرز و خواناسێکی یەکجار گەورە کە وتەی حەق نەبا، بەسەر زمانی دا ناهات بەرامبەر بە گەورە و دەسەلأتدارانی سەردەمی خۆی ڕەزای خوای لێ بێت.

## ٤٤٢- ئاوی دەریا بۆی دەوەستێ

ڕۆژێکیان ئەبو ریحانەی پیاو چاك، سواری کەشتی دەبێ، دیارە دەرزییێکی پێ بوو کە دورمانی پێ دەکرد لەناکاو کەوتە ناو دەریا ئەویش ویستی بگەڕێ بەدوای،

گوتی: ئەی خوایە دەبێ ئەو درزییەم هەر بۆ بگەڕینیتەوە دەڵێ: یەکسەر دەریا بۆی ڕوون بوو تاکو بنی بەدەرکەوت و دەرزیەکەی بینی، ئینجا هەڵێ گرتەوە.






هەروەها ڕۆژێکیان زۆر ناڕەحەت بوون لە ناو کەشتی لەبەر گرفتی ڕۆیشتن وباهەڵکردن، ابو ریحانەی خواناس ڕوی کردە ئاو و شەپۆلی دەریا گوتی: ئەی دەریا، ئەی ئاوی خاوەن شەپۆڵ هێواش بە تۆش وەك ئێمە بەندەو درسوتکراوی خوای، دەڵی بینیمان ئاوی دەریا زۆر بەهێواشی دەڕۆیشت وتاکو وەك زەیت خەست بوو[1].

## ٤٤٣- زانایانی دنیاویست

ئیمامی الغزالی – لە خلیل ی کوڕی حمد دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ :

خەڵکی چوار جۆرن :

١- پیاوێك کە زانابێ وشت بزانێ، هەروەهاغ بزانێ کە زانایە و شت دەزانێ ئەوە بەڕاستی زانایە و شوێنی بکەون.

٢- پیاوێکە دەزانێ، بەڵام نازانێ کە زانایە و شت دەزانێ ئەوەشیان پیاوێکی خەوتوە بێداری بکەنەوە!

٣- پیاوێکە هیچ نازانێ، دەشزانێ کە نەزانە و هیچ نازانێ، ئەمەشیان پێویستی بە ڕێنمایی یە، ڕێنمایی بکەن !

٤- پیاوێکی نەزانە، ناشزانێ کە هیچ نازانێ، بێگومان ئەمەشیان جاهیل ونەفامە ڕەفزی بکەنەوە هیچی لێ وەرمەگرن – چونکە خەڵکی گومڕا دەکات

---

( ١) قصص العابدين، د. حامد احمد الطاهر (٦٨)






سفيان ی – الثوري – دەفەرموێ:

زانست بانگی کردەوە دەکات، ئەگەر وەڵامی دایەوە، ئەوا شتێکی چاك و گرانبەهایە، ئەگەر نا ئەو زانستەی بێ کردەوە کۆچ دەکات لەوخانووە

عبدالله کوڕی مبارك دەفەرموێ :

مرۆڤ هەمیشە زانایە تاکوو داوای زانست دەکات، بەڵام هەرکاتێ وای گومان برد وخۆی وا هاتە بەرچاو کە پیاوێکی لێهاتوو زانایە ئەوا ئەوکاتە نەزان و جاهیل بووە.

فضيل–ی کوڕی عياض دەفەرمووێ :

من بەزەییم بە سێ کەس دێتەوە

یەکەمیان: گەورە و دەسەڵاتداری قەومێك کە زۆر زەلیل و زەبوون بێت لە نێوانیان.

دووەمیان: دەوڵەمەندترین قەومێك کە فەقیرو هەژار بووبێت.

سێ یەمیان: زانایەك کە دنیا و جوانی دنیا هەڵی خەڵەتێنێ و گاڵتەی پێ بکات.

هەروەها پێشەوا – الحسن – دەفەرموێی:

سزای دنیا ویستن مردنی دڵ و دەروونە، وەمردنی دڵ و دەرونیش داوا کردنی ماڵی دنیایە بە کردەوەی دوا ڕۆژ



شاعیر دەڵێ:

**عجبت لمبتاع الضلالة بالهدى**

**ومن يشتري دنياه بالدين اعجب**

**واعجب من هذين من باع دينه**

**بدنياه سواه فهو من ذين اعجب**

واتە: بەو کەسە سەرسام بوو کە ڕێگای ڕاست و ڕێنمای فرۆشت بە تاریکی و گومڕاهی، ئەوەی دین و ئایینەکەشی بە دنیا بگۆڕێتەوە ئەو زۆر لەوە سەیرترە

لەو دووانە سەیر تر کەسێکە دینەکەی بە دنیای بفرۆشێ وئەمەشیان لە هەردووکیان سەیرترە

ئیمامی عمر دەفەرموێ :

ئەوەی کە من زۆر لێی بترسم کە تووشی عەزاب و تووڕەیی خوابێت کەسێکە لەو ئوممەتە کە دوو ڕووێکی زانابێ – عالم منافق–

هاوەڵان گوتیان: چۆن پیاوی دووڕوو زانا دەبێ؟

فەرمووێ: بەڵێ بەزویان زۆر زاناو شارەزایە، بەڵام لە دڵ و دەروون و کردەوەکانی زۆر ماڵ وێران و نەزانە[1].

---

( ١) مكاشفه القلوب، الامام ابو حامد محمد الغزالى، لاپەڕە (٢٦٠)




## ٤٤٤-هەندێك لە ئامۆژگارییە كانی لوقمانی حەكیم

لوقمانی حەكیم بەكوڕەكەی گوت :

ڕۆڵەكەم..

ئەو نوێژەی كە لە سەرت واجب كراوە بە پوختی جێ بەجێ بكە لە هەمو ئەو كردەوە چاكانەی كە دەیكەیت باشترە، چونكە نموونەی نوێژ و تەسبیحات كردنی خوا وەك كەشتییێك وایە لە نێو دەریادا، ئەگەر كەشتی یە كە سەلامەت بوو ئەوا خەڵكی نێو كەشتی یەكەش سەلامەت دەبن بەڵام ئەگەر كەشتی یەكە نقووم بوو، بێگومان خەڵكی نێو كەشتی یەكەش هەموویان نقووم دەبن.

هەروەها دەفەرمووێ:

ڕۆڵەكەم..

ئەگەر چوویتە نێو قەومێك لە كۆڕو وەمەجلسیان دانیشتی ئەوا تیری ئیسلامیان تێبگرە – واتە سەرەتا سەلامیان لێ بكە – ئینجا لە شوێنێك یان لە سووچێك بۆ خۆت دانیشە، وەهیچ قسە مەكە تاكو ئەوان دەبینی كە دەست دەكەن بەقسە كردن.

ئەگەر دانیشتن وكۆڕیان زیكری خوابوو، خۆت بێ بەش مەكە لەو دانیشتنە و لەگەڵیان بەشدار بە لەو بەشەدا، بەڵام ئەگەر زیكری خوایان






ناکرد وسەرقاڵ بوون بەشتێکی تر، لەوێ بڕۆ بۆ لای کەسانێکی تر

هەوەها دەفەرمووێ:

ڕۆڵەکەم..

ئەگەر تووشی تاوان و گوناهێك بوویت ئەوا خێرو سەدەقەیەك بکە چونکە ئومێد وایە ئەو خێرو سەدەقە ببێتە سڕینەوەی تاوانەکان

هەروەها دەفەرموێ :

ئەگەر ویستت دۆستایەتی و هاوڕێتی کەسێك بکەیت سەرەتا توڕەی بکە، ئەگەر لە کاتی تووڕە بووندا لێبوردونی خۆی نیشاندا پێت نەك دوای سارد بوونەوەی – ئەوا هاوڕێی ئەو کەسە بکە بەڵام ئەگەر بەپێچەوانە لێبوردنی نەبوو خۆتی لێ بپارێزە.

هەروەها دەفەرموێ

ئەگەر خەڵکی خۆیان لەسەر یەکتر گەورە دەکرد بەقسەی جوان و فەسیح ئەوا تۆ خۆت لەسەریان گەورە بکە بەبێ دەنگ بوونی جوان.

هەروەها دەفەرموێ:

ئەگەر خوا ویستی خراپە ببەخشێ بە قەومێك ئەوا دەرگای ململانێ و ناکۆکی ودەمەقاڵیان لەسەر دەکاتەوە، هەروەها کەمی ئەنجامدانی کردەوەی چاك لەلایان شیرین دەبێ واتە: کردەوەیان کەم دەبێ[1].

---

( ۱) لقمان الحكيم – محمد عبدالرحيم، لاپەڕە (۲۳)






## ٤٤٥- زەواجی عورفی وبارودۆخێکی ترسناك

پیاوێك ئافرەتێکی مارە بڕی وخوای گەورە مندالّی پێ بەخشی لە کور و کچ ویستی بۆ جاری دووەم ئافرەتێکی تر مارە ببڕێ بەلاّم لە ترسی کۆمەلّگا و خانەوادە و خێزانەکەی نەیتوانی، ناچار هانای بردە بەر زەواجی بە نەهێنی وئافرەتێکی مارە بڕی کەسیش نەیزانیوە، چەند سالّ ومانگ و رۆژ بەسەریدا تێپەڕی، قەدەری خوا وابوو کوڕەکەی لە خێزانی یەکەم دەبێ بچێتە زانکۆ، بەلاّم ئەوەی لە خێزانی دووەم بەهەمان شێوە وەرگیرا لە زانکۆ، بەلاّم ئەوەی چاوەڕوان نەکرابوو ئەوە بوو کە ئەو کوڕەو ئەو کچە یەکتریان خۆش دەویست لەو ماوەیە کە لە زانکۆ بوون، بۆیە هەردوکیان بڕیاریان دا کە زەواج لەگەلّ یەکتری بکەن، زەواجی عورفی بەلاّم ئەوەی زۆر سەیر بوو ئەوە بوو ناوەکانیان زۆر پێك دەچوو، بۆیە کوڕەکە بە کچەی گوت: سەیری ئەو خۆشەویستیە ڕاستەقینە بکە گەیشتۆتە ئەو ڕادەیە کە ناومان وەك یەکتر وایە واتە: ناوی باوکیان و باپیریان یەکە، تەنها دایکیان جیایە — دەمێ پێکەوە ڕایان بوارد کاتێ کچە هەستی کرد کە دوو گیانە وسکی پڕە ناچار پەنای بردە بەرکوڕەکە و لێی پاڕایەوە و پێی گوت: دەبێ بێتە لای باوکم بەڕێگایەکی فەرمی بمخوازیت، وەبە زەواجێکی شەرعی ڕاست مارەم بکەیت باش !! کاتێکی دیاریکراو داندرا لەنێوانیان، بۆ ئەوەی باوك لە مالّ بێ تاکو کوڕەکە دەچێتە لای وخوازبینێ کچی دەکات، ئەوە دەرچوو کە چاوەڕوان نەدەکرا لەناکاو ئەوەی کە دەرگایەکە دەکاتەوە دەبێ کێ بێ، وەکێ چاوەڕوانی کەسێك دەکات بۆ خوازبینی کچەکە؟ بێگومان ئەوە باوکی ئەو






کچە بوو دەرگای لە کوڕەکەی کردەوە، ودەبێ چ شتێك ئەو کوڕەی بۆ ئێرە هێنابێت، ئایا کوڕەکە لەگەڵ کچەکەم یەکتریان ویستووە؟ نا.. نەخێر!

بەڵام کوڕەکە ڕاستی یەکەی زانی کە ئەمە باوکی یەتی ئەو کچەی کە دڵی پێوە بەند ببو وەیەکتریان خۆش ویستوە پاشان تووشی خراپە بوونە ئەو خۆشکی یەتی لە دایکێکی تر – یەکسەر لە نهۆمی سەرەوە خۆی فرێدایە خوارێ و خۆی کوشت، باوکیشی کەوتە سەر زەوی وپاشان توشی نەخۆشی دڵ بوو، کاتێ کچەکەش بەمەی زانی ئەویش هەموو شتێکی لە پێش چاوانی ون بوو وەئەوەی تێگەیشتن ولەبەرکردن وزانین بوو هەمووی لە دەست دا و بەتەواوی زمانی نەما و قسەی بۆ نەکرا ئەمەش سزای پەروەردگارە بۆ کەسێك کەلە سنووری خوا دەردەچێ وپەیڕەوی فەرمانەکانی ناکات[1].

## ٤٤٦- خوا پەرستی بەخێر و چاکە

ابو هريرە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی(ﷺ):

(پیاوێك لەسەرخۆی واجب کرد و گوتی: دەبێ ئەمشەو خێرێك بکەم، هاتە دەرەوە لە ماڵی خۆی بەخۆی وبەخێرەکەی، چوو خستیە دەستی کابرایەکی دز– بۆی هەیە نەیزانی بێت کە دزە – ئینجا خەڵکی بەیانی دەیانگوت: ئەمشەو خێریان بە دزێك کردووە.

ئەویش سوپاسی خوای کرد و گوتی: ئەی خوایە سوپاس بۆ تۆ لەسەر

---

(١) خطب الشيخ محمد حسان، بەدەسکاریەوە، لاپەڕە (٤٤٥) بەرگی (٤) چاپی یەکەم



ئەو دزە – کە خێرم پێ کرد – دەبێ ئەمشەویش خێرێك بکەم بۆیە لە ماڵ دەروچو بەخۆی و بەخێرەکەی یەکسەر خستیە ناو دەستی ئافرەتێکی داوێن پیس

بەیانی خەڵکی باسیان دەکرد ودەیانگوت: ئەمشەو خێریان بە ئافرەتێکی داوێن پی کردووە

ئەویش سوپاسی خوای کردو گوتی: ئەی خوایە سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەوەی کە خێرم بەو ئافرەتە کرد بڕیار بێ ئەمشەویش خێریك بکەم دەرچوو لە ماڵی خۆی، لەگەڵ خێرەکەی چوو خستیە دەستی پیاوێکی یەکجار دەوڵەمەند، خەڵکی بەیانی باسیان دەکرد ودەیانگوت سەیرە ئەمشەو خێریان بەکابرایەکی دەوڵەمەند کردووە، ئەویش سوپاسی خوای کرد لەسەر ئەو دەولەومەندە کە خێری پێ کردوە، گوتی: ئەی خوایە سوپاس بۆتۆ لەسەر خێر کردنم بە دزو داوێن پیس ودەوڵەمەند.

لە خەودا پێیان گوت: ئومێد وایە خێرکردنت بە دزەکە بێتە هۆکاری وازهێنانی لەو دزی کردنە، هەروەها ئافرەتەکەش خۆی بپارێزی لەو زیناو کارە خراپە و دەڵەمەندەکەش بە خۆی دا بچێتەوە – وازبینێ لە ڕەزیلی و قرچۆکی – ئەوەی خوا پێی داوە ببەخشێت بە هەژاران[1].

---

( ١) رواه البخاري ومسلم – قصص العابدين، د. حامد احمد الطاهر، لاپەڕە (٨٨)

## ٤٤٧- يارمەتی ستەم لێکراو بدە

دەگێڕنەوە کە جارێکیان پێغەمبەر (داود) علیه السلام قسە لەگەڵ خوا دەکات ودەفەرموێ:

ئەی خوایە ! خۆشەویسترین بەندە لەلای تۆکێیە؟

خوای گەورە فەرمووی :

ئەی داود خۆشەویسترین بەندە لەلای من کەسێکە کە خاوەن دڵێکی پاك و پڕ بێ لە ترسی من، هەروەها خاوەن دوو دەستی پاك بێ کە بەو دەستە خەیاڵی خراپەی نەکردبێ بۆ لای هیچ کەسێك وە دوو زمانیشی لە نێوان خەڵك نەکردبێ، کیوەکان لە شوێن خۆیان دەجولێن بەڵام ئەو ناجولێت، منی خۆش دەوێت وەخۆشەویستانی منیشی خۆش دەوێن، وەبەندەکانم وا لێدەکات کە منیان خۆش بووێت،

داود فەرمووی: ئەی خوایە! چۆن بەندەکان خۆشەویست دەکات بۆلای تۆ؟ فەرمووی: باسی نازو نیعمەتی منیان بۆ دەکات.

ئەی داود هەر بەندەیەك لەبەرندەکانم یارمەتی کەسێکی ستەملێکراو بدات، یان بڕوات لەگەڵی بۆ ئەوەی مافەکەی بۆ بگەڕێنیتەوە ئەوا لەو ڕۆژەی قیامەت کە قاچەکان لەسەر پردی صراط خلیسك دەبن وتووشی لەرزدەبن ئەو قاچی جێگیرو قایم دەبن لەسەر پردی صراط[1]

(١) مرشد الخطیب، لاپەڕە (٥٠٠)

## ٤٤٨- ئای کە تەمەنت چەند درێژە

اصمعی دەڵێ: پیاوێکی دەشتەکیم بینی کە تەمەنی گەیشتبووە سەد و بیست (١٢٠) ساڵ، منیش پێم گوت، ئای کە تەمەنت چەند درێژە، ئەویش گوتی: حەسوودی وئیرەییم بەکەس نەبردووە و وازم لێهێناوە بۆیە تەمەنم هەرماوە[1].

هەروەها پرسیاریان کرد لە شێخ حسن ی البصری.

ئەی ابو سعید ئایا پیاوی باوەڕ دار حەسوودی بەخەڵك دەبات؟ فەرمووی: ئایا منداڵەکانی پێغەمبەر (یعقوب)ت لەبیرچوون کاتێ حەسوودیان بە (یوسف)ی برایان برد، بەڵام ئەگەر حەسود ی لە دڵت خەفەتی دروست بوو ئەوا هیچ زیان و زەرەت پێ ناگەینێ بەمەرجێ بەزویان باس نەکەیت و بەدەستیش کاری بۆ ئەنجام نەدەیت.

## ٤٤٩- سەردانی نەخۆش دڵ ڕەقی لادەبات

دەڵێن پیاوێ: چووە لای — ام الدرداء — ڕەزای خوای لێ بێت.

گوتی: دڵم زۆر ڕەقە وهیچ وەرناگرێ و فرمێسك نایەتە خوار لە چاوانم فەرمووی: بەڕاستی ئەمە گەورەترین دەرد و نەخۆشی یە، بەڵام برۆ سەردانی

---

(١) مرشد الخطيب، لاپەڕە (٤٧٤)




نەخۆش بکە و بە دوای جەنازەدا برۆ، هەروەها برۆ بۆ سەر لێواری گۆرەکان تاکو دڵت نەرم دەبێ، ئینجا پیاوەکە وای کرد کە فەرمانی پێکرابوو، دەڵێ، گەڕایەوە لای پێی گوت: ئەی ام الدرداء – خوای گەورە پاداشتی بەخێرت بداتەوە[1].

## ٤٥٠- جاری یەکەم مەبەستت من بووم

دەگێرنەوە کەوا جارێك پێغەمبەر (موسی) علیه السلام ددانی زۆر ئازاری دەدا، بۆیە شەکوای بۆ لای خوای گەورە برد، خوای گەورە پێی فەرموو: برۆ لە فلان شوێنە ئەو جۆرە گیایە – یان پووشە – بێنە بیخەرە سەر ددانت، ئەویش وای کرد و دەست بە جێ ئێشی نەما، دوای ماوەیەك ئازارەکەی هاتەوە، وەکو جاران چوو گیایەکەی هێنایەوە لەسەری دانا بەڵام ئەو جارە بێ سوود بوو بەڵکو ئازاری زیاتر بوو، ناچار هانا و هاواری بردە لای خوا فەرمووی: خوایە ! تۆ پێت نەگوتم ئەو گیایە بە کاربێنە؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەی موسی منم شیفا بەخش منم خۆشی بەخش، منم زیان بەخش، منم سوود بەخش، جاری یەکەم مەبەستت من بووم و کە داوات لێ کردم منیش ئازارەکەم لابرد لەسەرت وەئەمجارە هانا و هاوارت بۆ من نەهێنا بەڵکو بۆ گیایەکەت برد[2].

---

(١) مرشد الخطیب، لاپەڕە (٤٥٠)

( ٢) مرشد الخطیب، لاپەڕە (٤٤١)






## ٤٥١- تەنهایەك چاكەی هەبوو

ڕۆژێكیان خواپەرستێك بەهاوڕێكەی گوت: بڕۆ نێو ئەو لادێ یە (گوندە) هەندێ كفنم بۆ بكڕە چونكە من ئەو كاتژمێرەی كە تێیدامە دەمرم وپەلە بكە! هاوڕێكەی چووە ناو لادێ یەكە بۆ ئەوەی كفنی بۆ بكڕێ دەبینی پاشای ئەو وڵاتە لەوێ مردووە وخەڵكیش سەرقاڵی ناشتنی ئەون بۆیە هەمو دوكانەكانیان داخستوون، هاوڕێكەش هیچی بۆ نەكرا تاكو خەڵكی گەڕانەوە لەسەر قەبران، پاشان هەندێ كفنی كری ولەگەڵ هەندێ بۆنی خۆش بۆ لاشەكەی، ئینجا گەڕایەوە لای خواپەرستەكە دەبینی كەوا وەفاتی كردووە ودوڕندەش ڕوخساریان هەموی خواردووە، زۆر پەرێشان بوو بۆی هەرهاواری دەكرد و دەیگوت: ئەو پاشایە ستەمكارە چەند بە پاكی بەپەلە نێژرا بەبێ ئەوەی گرفتێك دروست بێ بۆ خەڵكی لادێ یەكە، بەڵام دەبینی ئەو خواپەرستە، چەند لە خواترسە كەچی دوڕندە ڕوخساریان خواردووە،

لەو سەین و بەینە بوو یەكێك بانگی كرد و پێی گوت: ئەو ستەمكارەی كە بەو شێوە ڕێوڕەسمی ناشتنی بەڕێوە چوو ئەوا تەنها چاكەیەكی هەبوو بەس، خوای گەورە ویستی ئەو چاكەیەی بۆ دەربخات لە دنیادا وەلەدوا ڕۆژدا بێ بەش بێت.

بەڵام ئەو خواپەرستە ژیانی هەموی كردەوەی چاك وگوێ ڕایەڵی خوابووە تەنها یەك تاوانی كردووە، خوای گەورە ویستی ئەو گوناهەی بۆ دەربخات لە دنیادا كە چی ئەو لە دوا ڕۆژدا هیچ ئازاری پێوە نابینی وگوناهەكەی لەسەر لادەچێ بەو هۆیەوە[1].

---

(١) قصص العابدين، د. حامد احمد الطاهر، لاپەڕە (٩١)






## ٤٥٢- هەرگیز ئاوی ساردم نەدەخواردەوە

ابو محمد – کە یەکێك بوو لە خزمە نزیکەکانی ئیمامی شافعی دەڵێ
ڕۆژێکیان ئیمامی شافعی لە عوسمان ی کوڕی خۆی تووڕەبوو وەهەندێ قسەو ئامۆژگاری ئاراستەکردن، یەکێك لەوقسانە ئەوەبوو پێی گوت: ڕۆڵەکەم ! سوێند بە خوا ئەگەر بزانم خواردنەوەی ئاوی سارد لە دین و ئاییینم کەم دەکاتەوە – هەرگیز ئاوی ساردم نەدەخواردەوە تەنها ئاوی گەرم نەبا واتە زۆر پابەند بوو بە هۆکارەکانی مرۆئەت و پیاوەتی[1].

## ٤٥٣- ملکەچی ڕاستەقینە لەناو نوێژدا.

پرسیاریان لە خلف–ی کوڕی ایوب کرد ئایا ئەومێش وپێشولانە لەناو نوێژدا ئازارت نادەن واباشترنییە کە دەریان بکەیت؟ گوتی: چۆن خۆم بەشتێك سەرقاڵ دەکەم کە نوێژم تێك بدات پێیان گوت: چۆن ئارام دەگرێت؟

گوتی: هەواڵم پێ گەیشتووە کە پیاوە بێ دینەکان ئارام دەگرن لە ژێر لێدانی قامچی کار بە دەست بۆ ئەوەی بڵێن: فلان کەس زۆر خۆڕاگرە وەفەخرو شانازی بەوە دەکەن، منیش لەبەردەم دەستی خوای بالآدەست وگەورە ڕادەوەستم فەخرو شانازی بەوە ئەکەم ئایا بۆ یەك مێش وپێشوولە خۆم بجولێنم[2].؟!

---

(١) ١٠٠٠ قصة وقصص من حياة الائمة الاربعة، لاپەڕە (٢٠٤)

( ٢) صحيح وصايا الرسول، بەرگی (١) لاپەڕە (٦١٨)






## ٤٥٤- غەیبەت و دوو زمانی

خوای گەورە نیگای کرد بۆ پێغەمبەر (موسی) علیه السلام فەرمووی: ئەی موسی ئایا حەز دەکەیت یارمەتیت بدەم بۆ ئەوەی بەسەر دوژمنت زاڵ بیت؟ موسی فەرمووی: بەچی؟

خوا فەرموی: بەوەی باس کردنی خەڵك بۆیان بگەڕێنیتەوە، واتە داوای گەردن ئازادیان لێ بکە، هەرکەسێ بمرێ وتۆبەی کردبێ لە غەیبەت ودوو زمانی ئەوا لە دوای هەموو خەڵك دەچێتە بەهەشت بەڵام تۆبەی نەکرد ومرد لە پێش هەموو کەسێك دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخ[1].

پێغەمبەر (سلیمان) علیه السلام فەرمووی: ئەی خوایە گەورەترین وخۆشەویسترین کردەوەکان لەلای تۆ چییە؟

فەرمووی بەدە (١٠) شت بەند لەلانی من خۆشەویست وگەورە دەبێ ئەی سلیمان.

یەکەمیان: باسی هیچ بەندەیەك لە بەندەکانی من نەکەیت مەگەر بە چاکە نەبێ، وەغەیبەتی هیچ کەسێك نەکەیت، هەروەها جاسووسی ودوو زمانی لەسەر هیچ کەسێ: نەکەیت.

(سلیمان) فەرمووی: ئەی خوای ئەو سێ یە (٣) بەراستی بێ تاقەتی

---

( ١) احیاء علوم الدين ٢٢٣/٣ بحر الدموع ابن الجوزي



کردم حەوتەکەی ترم بۆ باس مەکە[1].

عطاء-ی سلمی دەڵێ:

عەزابی ومەینەتی ناوگۆڕ لەسێ، سێ یەکی دایە:

* یەك لەسەرسێ، لە خۆ پاك نەکردنەوە لە میزدایە.

* یەك لەسەر سێ: لە غەیبەتەدایە.

* هەروەها سێ یەکی تر، لە دووزمانی دایە.

- یەکێك لە پیاوانی (السلف الصالح) دەفەرمووێ:

کاتێ ڕۆژێ دوایی دادێت، ئەو خەڵکەی کە کۆڕو کۆبوونەوەیان لەسەر خواپەرستی ویادی خوا نەکردوە، کۆدەبنەوە ویارمەتی یەکتر دەدەن لەسەر گوناهو تاوان وخراپە، ئینجا لەسەر ئەژنۆ ڕادەکێشرێن یەکتر دەگەزن، وەهەروەها وەکو سەگ پەلاماری یەکتر دەدەن، بێگومان ئەوانە کەسانێکن کە لە ژیانی دنیادا دەروچون ومردن بەبێ تۆبەکردن لە گوناهەکانیان[2].

---

( ١) رواه ابن المبارك في الزهد (٤٧١) بحر الدموع ابن الجوزي

( ٢) بحر الدموع ابن الجوزى (١٨٥)

## ٤٥٥-.... گەورەكەتان چۆنە؟ چۆن دەبێ گەورەتان فەقیر بێ؟

مالك ی كوڕی دینار دەفەرموێ :

كاتێ ئیمامی عمر چووە (شام) لەناو شارەكان گەڕا تاكو لە شاری (حمص) دابەزی وگوتی: ناوی هەژارەكانم بۆ بنووسن، كاتێ نووسراوەكەیان پێدا وسەیری كرد بینی ناوی سعیدی كوڕی عامری خوزەیمی تێدا نوسراوە كە ئەمیرو گەورەی ئەو شارە بوو — ئیمامی عمر فەرمووی

سعیدی كوڕی عامر كێ یە؟

گوتیان: گەورەمانە

فەرمووی: گەورەتانە؟

گوتیان: بەڵێ: عمر سەرسام بەوە پاشان گوتی: چۆن دەبێ گەورەتان فەقیر بێ؟ كواماڵەكەی كوا خواردن و ڕۆزی یەكەی گوتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران، سعید هیچ بۆ خۆی هەڵناگرێ، دەڵێ عمر دەستی كردە گریان وهەزار دیناری هێنایە دەر ناردی بۆ سعید وگوتی: سەلامی منی پێ بگەینن وپێی بڵێن ئەمیری ئیمانداران ئەو پارەی بۆت ناردووە تاكو پێداویستی خۆت پێ جی بەجێ بكەیت.

كاتێ نێردراوەكە گەیشتە لای سعید وكیسەكەی كردەوە دەبینی دیناری تێدایە، سعید گوتی: انا لله وانا الیه راجعون

ئافرەتەكەی گوتی: چی بووە ئەی سعید ئایا ئەمیری ئیمانداران وەفاتی

کرد؟ سعید گوتی: لەوە گەورەتر

ئافرەتەکە گوتی: چی بووە چی بەسەر هات؟

گوتی: دنیا هاتە لام... ئاژاوە لێم نزیك بوەوە

خێزانەکەی گوتی: چی دەکەیت لیٚ وای لیٚ بکە

سعید گوتی: تۆ پێداویستیت هەیە؟ گوتی: بەڵیٚ

سعید هەستا هەموی خەرج کرد بۆ ئامادەکردنی لەشکری موسڵمانان بۆجیهاد

خیزانەکەی پێی گوت: ڕەحمەتی خوات لیٚ بیٚ بۆ چی هەندێکیت هەڵنەگرت بۆ پێداویستی خۆمان خەرجی بکەین، گوتی: من لە پێغەمبەرم بیستووە کە فەرموویەتی (ئەگەر یەك ئافرەتی ئەهلی بەهەشت بێتە سەر دنیا هەموو سەرزەوی پڕدەکات لە بۆنی میسك)[1].

وەباش بزانە سوێند بە خوا من بۆ ئەوەم نەکرد کە تۆ هەڵبژێرم لەسەریان – واتە: تۆ بە گەورەتر دانانێم لەسەر ئافرەتانی بەهەشت (الحور العین).

ئینجا ئافرەتەکە، کەئەمەی بیست بیٚ دەنگ بوو[2]

---

(١) رواة الشيخان، ورواة الامام احمد بهذا اللفظ

(٢) قصص العابدين، لاپەڕە (٢٨)




## ٤٥٦- پاشایەکی دادپەروەر

ئەو پاشەیە ناوی (محمود کوری سبکتکین) بووە، ولاتی هندی فەتح کردووە یەکێك بووە لەو دادپەروەرانەی کە لە دوای عمری کوڕی عبدالعزیز دارپەروەری لەسەر زەوی بەرپاکردووە.. محمود سبکتکین پاشایەك بو کە بەڕاستی بەدادپەروەری حوکمی دەکرد لە نێو خەڵکی، هەر کەسێ تاوانێکی بکردایە دەس بەجێ تۆڵەی لێ وەردەگرتەوە، هەرگیز مافی خەڵکی ون بکردایە وبەپەلە وەریدەگرتەوە، ئەگەر بەڵێنیکی بدایە بەکەسێك بەڵێنەکەی بەجێ دەگەیاند، ئەوەی کە زیاتر بەڵگەیە لەسەر چاکی و دارپەروەری و خۆپارێزی ئەو بریتی یە لەوەی کە جارێکیان لەسەردەمی فەرمان ڕەوایەتی ئەو کابرایەك هاتە لای شکایەتی لە کوڕی خوشکی پاشا کرد و گوتی: دێتە سەرمان بە هێرش و هەڕەشەکردن لە هەموو کاتێکدا، وە خۆی منداڵەکانی لە ماڵ دەردەکات و ئینجا لەگەڵ خێزانەکەی ڕادەبوێری، هەرکاتێ ئەو پیاوە لەلای هەرکەسێك لە دەسەلآتداران باسی بکردایە کەس نەیدەوێرا لەبەر پاشا دەستی بۆببات و ڕێگری لێ بکات، بەڵام کاتێ پاشا ڕۆژێکیان ئەو هەواڵەی بیست زۆر تووڕە بوو بە پیاوەکەی گوت: هاوار بۆ خۆت هەر کاتێ هاتە لات بۆلای من وەرە و بەکەسیش نەڵێی، ئەگەر لەشەو هات بەشەو وەرە لام وەپێم بڵێ وئاگادارم بکەرەوە، ئینجا پاشا چووە لای دەرگاوانەکان پێی گوتن: ئەو پیاوە (ستەملێکراوە) هەرکاتێك ویستی بێتە لام ڕێگری لێ نەکەن وبابێتە ژوورێ لەشەو بێ یان ڕۆژ پیاوەکە بەدڵخۆشی لەلای پاشا ڕۆیشت، یەك ڕۆژ و شەوی پێ چوو، وەکو جاران کوڕی خۆشکی پاشا هاتەوە سەریان و لە ماڵ بەدەری نان و چووە لای خێزانەکەی، پیاوەکەش بەگریانەوە ڕۆیشت بۆ لای پاشا، دەرگاوانەکان گوتیان، پاشا خەوتوە، گوتی



تازە هاتم پاشا بڕیاری داوە کە هەرکاتێك هاتیت ڕێگری لێ نەکرێ وبابێتە ژوورێ، پاشایان لە خەو بەخەبەر هێنا و لەگەڵ پیاوەکە چوو بۆماڵیان وهیچ کەسێکیشی لەگەڵ نەبوو تاکو گەیشتە بەردەم دەرگای ماڵیان، کە چووە ژوورێ بینی وا کوڕەکە (کوڕی خوشکی پاشا) لەگەڵ خێزانی پیاوەکە لە سەر یەك پێخەف پاڵی داوەتەوە وە چرایەکیش دادەگیرسا لەوێ چراکەی کوژاندەوە، دەست بەجێ پاشا سەری کوڕەکەی بڕی و لە لاشەی جیاکردەوە وبە پیاوەکەی گوت: هاوار بۆ خۆت بڕۆ هەندێ ئاوم بۆ بێنە با بیخۆمەوە، ئەویش بۆی هێنا وخواردیەوە، پاشان ڕۆیشت لە ماڵی پیاوەکە، پیاوەکە گوتی: جەنابی پاشا بۆ خاتری خوا پێم بڵێ: بۆ چی چراکەت کوژاندەوە وداوای ئاویشت کرد لێم؟

پاشا گوتی: بۆیە چراکەم کوژاندەوە چونکە ئەوە کوڕە خوشکی من بوو بۆیە پێم ناخۆش بوو لە کاتی سەربڕیندا سەیری بکەم، وەبەپەلە داوای ئاوم لێ کردیت چونکە من بڕیارم دا کاتی هاتیتە لام کە یارمەتیت بدەم وگوتم: تاکو ئەو ستەملێکراوە ڕزگار نەکەم نان و ئاوم لەسەر حەرام بێ، سوێند بە خوا ئەوە چەند ڕۆژە لەوەتەی ئەو هەواڵەم زانیوە تینوومە، ئینجا پیاوەکە دوعای خێری بۆ کرد، دواتر پاشا چووە ماڵی خۆی کە تووشی نەخۆشی دەماری مێشك و زگ ئێشە ببو، بۆ ماوەی دووساڵ بەو نەخۆشیە دەینالاند و ئازاری هەبوو نەیدەتوانی بخەوێت وپاڵیش بداتەوە لەبەر ئازارەکەی، بەو شێوە خۆی جیاکردەوە لە خەڵك لەبەر ئەو نەخۆشی یەکەی تاکو ماڵئاوایی کرد لە ژیانی دنیا[1].

---

(١) قصص الصالحين، د. مصطفى مراد، لاپەڕە (٨٨).




## ٤٥٧- شعیب ی کوڕی حرب و هارون الرشید

شعیب ی کوڕی حرب دەڵێ: لەیەکێك لە کۆڵانەکانی شاری مەککە دەڕۆیشتم لەناکاو هارون الرشیدم بینی، بەخۆم گوت: ئەی شعیب ئەمڕۆ کە ئەمر بە چاکەت لەسەر واجب کرا، نەفسم گوتی: نەخێر شتی وانەکەی، ئەو زاڵمە دواتر ئازارت دەدا و ئاویش ناخواتەوە، بەهەر حاڵ لێم نزیك کەوتەوە بانگم کرد گوتم: ئەی هارون بەڕاستی خەڵکت ئازارداوە، ئاژەڵانت ئازار داوە، هارون الرشید گوتی: بیگرن ئینجا منیان بردە بەر دەم دەرگای رشید بینیم لەسەر کورسیێك دانیشتووە دارێکیشی لەدەستدایە گەمەی پێ دەکات گوتی: ئەوە کوڕی کێیە؟ گوتی: کوڕی پیاوێکی عەوامە (واتە دەسەڵاتدار و ناودار نیە) رشید گوتی: بۆچی شتی وادەکەیت بەناوی خۆم بانگم دەکەیت؟

گوتم: من بەناوی خواش بانگی خوا دەکەم دەڵێم یا الله یا رحمن یا رحیم کەچی لێم تووڕەنابێ کە بەناوێ ئەو بانگی دەکەم، بێگومان دەبینم کە خوا ناوی خۆشەویستەکەی لە قورئان ناوە (محمد) بەڵام خرابترین کەسی بە کونیە(اب) ناوی هێناوەکە (ابو لهب)ە هارون الرشید گوتی: بەڕەڵلای بکەن[1].

---

(١) قصص الصالحين، د. مصطفى مراد، لاپەڕە (١٥٩).






# ٤٥٨- ئامۆژگاری یەکانی ئیمامی ابو حنیفە

ئیمامی ابو حنیفە دەفەرموێ:

-لەنێو خەڵکی عەوام زۆر پیمەکەنە، وە زۆر مەڕۆ بۆ بازار

-لەسەر ڕێگاو بانی خەڵك دامەنیشە، ئەگەر ناچار کرایت بۆ دانیشتنی بڕۆ لە مزگەوت دانیشە هەروەها لە دوکانەکان دامەنیشە، خواردن لە بازاڕو مزگەوت مەخۆ!

-لەسەر جێگای نووستنت زۆر قسە مەکە لەگەڵ خێزانت مەگەر زۆر پێویست نەبێ، چونکە ڕێزو قەدر بەمە کەم دەبێ لە نێوانتان – هەروەها زێدەڕۆیی مەکەلە دەست لێدان و یاری وگەمە وگاڵتە کردن لەگەڵی وەلێی نزیك مەکەرە و مەگەر بەزیکری خوا نەبێ – چونکە بەمە شەیتان ڕادەکات وەباس لە ئافرەتانی تر مەکە لەلای چونکە بۆی هەیە ئەویش باس لە پیاوی بێگانە بکات لەلات.

-زۆر لە خوا بترسە لە هەموو کاتێك، ئەمانەت بگەینە خاوەنەکەی ڕێزیان لێ بگرە.

-لە کاتی تەمەنی گەنجیت خۆت بەزانست وزانیاری سەرقاڵ بکە، نەکەی پێش شارەزا بوونت خۆت سەرقاڵ بکەیت بەژن هێنان چونکە هەموو کاتەکەت بەفیڕۆدەچێت.

-وریابە لەگەڵ خەڵکی نەزان ونەفام باس لە بنچینەکانی دین نەکەیت لە



(اسماء الصفات، وعلم الكلام.. الخ) چونکە ئەوانیش وەکو تۆ دەچن لیٚ دەکۆڵنەوە بە نەزانی دەرەنجام توشی گومڕایی دەبن،

-هەروەها سەبارەت بە ژیان و گوزەرانیدا، دەڵیٚ: ئەگەر بۆ ماوەی دەساڵاَن بەبیٚ کاسبی وقوت و خۆراك مایتەوە، ئەوا هەرگیز پشت لەوەدەست هیٚنانی زانست و زانیاری مەکە، چونکە تۆ ئەگەر وازت هیٚنا لە زانست و زانیاری بیٚکومان ژیان وگوزەرانیت تەسك وناخۆش دەبیٚ، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ﴾ طه: ١٢٤ واتە: کەسیٚك پشت لە ئاینی من بکات لە قورئان و زیکرو یادی خوا — ئەو لە دنیادا ژیانیٚکی تەسك وناخۆشی بۆ هەیە.

-لە خوا پەرستیدا زۆر هەوڵ بدە، بەکەمیٚك ڕازی مەبە مەگەر بە زیاتر لەو کەسانەی کە دەیکەن — واتە: تۆ لە هەموو کەسیٚك زیاتر بیکەوە پیٚشبڕکیٚیان لەگەڵ بکە، چونکە خەڵکی عەوام ونەزان ئەگەر تۆ نەبینن کە زیاتر لەوان خواپەرستی دەکەیت ئەوا بە پیاویٚکی خراپ ناوت دەبەن و دەڵیٚن: ئەگەر ئەو بەو شیٚوەیە ئەو هابیٚ دەبیٚ ئیٚمە چۆن بین؟

هەوەها واگومان دەبەن کە تۆ بەو عیلم وزانستە هیچ سوودیٚکت نەکردووە، تەنها ئەوە نەبیٚ کە بە پیاویٚکی نەزان ونەفام لەقەلەم نادریٚت.

-ئەگەر چوویتە شاریٚك کە پیاوانی زانای تیٚدابوون ئەو شارە مەکە هی خۆت بەڵکو کەسیٚك بە لەو شارە، بۆ ئەوەی بزانن کە تۆ خۆت بەگەورەی




ئەوان دانانێت ونیازت نییە ببیت بەگەورەیان، ئەگەر نا بە هەموویان بۆت هەڵدەستن و دەنگت لەسەر بەرز دەکنەوە تانە لە رێڕەوت دەدەن، ئەو کاتەش خەڵکی عەوام سەیرت دەکەن و لە پێش چاویان تانە لێدراودەبیت و هیچ سوودێکی نابێ.

-لەگەڵ خوادا، بۆ ئەوەی بتوانیت هەمیشە لەگەڵ خوا بیت وبێ ئاگا نەبیت لەکاتی تەنیایی و نەهێنی دا وەك ئاشکرایی لە پێش چاوی خەڵك چۆن دەبینرێت ئەوهاش بە لە کاتی تەنیای، بارودۆخی پیاوی زاناش هیچ کاتێ چاك نابێ تاکو دیارو پەنهانی وەك یەك نەبن.

-لە هەڵس و کەوت دا دەڵێ: وریا بە زۆر پێنەکەنیت چونکە دڵت دەمرێ، زۆر قسە لەگەڵ ئافرەتان مەکە و زۆریش لەگەڵیان دامەنیشە چونکە بەوەش دڵت دەمرێ و لێیان فێری ژیری نابیت، زۆر بە لەسەر خۆیی و بەخاوی مەڕۆ چونکە بۆی هەیە خەڵکی بڵێن پیاوێکی لە خۆبایی و خۆبەگەورەزانە، هەروەها لە کارەکانت پەلە مەکە، کەسێك لە دواوە بانگت بکات وەڵامی مەدەرەوە چونکە ئاژەڵان لەدواوە بانگی یەکتر دەکەن، ئەگەر قسەت کرد بە هات و هاوار قسەمەکە ودەنگت بەرزمەکەرەوە هەمیشە هێمن ولەسەر خۆیی بۆخۆت هەڵبژێرە، بۆ ئەوەی لەلای خەڵك گران وسەنگین بیت.

-لە نێو خەڵك زۆر زیکری خوا بکە تاکو لێت فێر ببن وسەیری تۆ بکەن، ئەندازەیەکی تایبەتی بۆ خۆت هەڵبژێرە لە زیکرو قورئان لە دوای نوێژەکانت، سوپاسگوزاربە لەوەی کە ئارامی پێ بەخشی، لە هەموو مانگێك






چەند ڕۆژێك بۆخۆت دەست نیشان بکە بۆ ئەوەی تێدا بە ڕۆژوبیت بۆ ئەوەی خەڵکیش لەوکارەدا شوێنت بکەون، بەو خواپەرستی یە ڕازی مەبەو زیاتر ئەنجامی بدە لەوەی کە خەڵکی عەوام پێ ڕازی دەبن.

-لە کاتی نوێژدا: هەرکاتێ بانکدەر بانگی دا پەلە بکە بۆ چونە مزگەوت بۆ ئەوەی خەڵکی عەوام بە پێشت نەکەون، خانووەکەت با لە تەنیشت ماڵی کاربەدەستان نەبێ، زۆر ڕێز لە پیاوە ماقوڵان بگرە وەزۆر ڕێز لە ئەهلی عیلم بگرە، هەروەها بە ڕێزو ویقار بە بەرامبەر بە پیاوانی پیرو بەساڵاچوو بەتوندوتیژی قسەیان لەگەڵ مەکە هەوڵ بدە نەرم و نیان بە لە گەڵیان، ئەو خراپەی لە دراوسێکەت دەبینی هەوڵ بدە داپۆشە ولەلای خەڵکی تر باسی مەکە، چونکە ئەو نهێنی یە ئەمانەتە لەلای تۆ، هەرکەسێ: پرس و ڕات لە شتێك پێ بکات تۆ ڕاوبۆچوونت بۆ باس بکە بەمەرجێ کە شارەزاییت لەوبوارە هەبێ وئینجا مەبەستت نزیك بوونەوە بێ لەخوا،

-بەچاوی سووك وبچوکەوە سەیری هیچ کەسێك مەکە، پیاوەتی خۆت بپارێزە لە هەموو ڕوویێك، وریابە نهێنی خۆت بۆ هیچ کەسێك باس مەکە تاکو تاقی دەکەیتەوە و لێ دڵنیا دەبیت، نەوەك زوو نهێنیەکەت بدرکێنێ.

-ئارام بگرە لەسەر ئازارەکانی خەڵك، ڕەوشتت جوان بکە لە گەڵیان، سینەت فراوان بکە لە کاتی هەڵس و کەوت لەگەڵیان، بەرگ و پۆشاکت نوێ بکەرەوە، ولاخێك بۆ خۆت هەڵبژێرە، زۆر خۆت بۆن خۆش بکە

-لە خواردنی خۆت ببەخشە بە هەژاران، چونکە بەڕاستی پیاوی قرچۆك






هەرگیز نابێتە گەورەی خەڵك، هاورێكت بۆ خۆت بدۆزەوە كە هەواڵی خەڵكت پێ بڵێ، هەركاتێ زانیت كە خەڵك تووشی خراپە هاتن هەوڵ بدە زوو چاكی بكەیتەوە لە ناوی بەرە، وەهەركاتێ چاكەت بینی زیاتر هانیان بدە بۆ چاكەكردن

## ٤٥٩- میسكی كۆتایی

ئیمامی – القشیری دەفەرمووێ:

هۆی تۆبە كردنی – بشر–ی حافی ئەوەبوو، ڕۆژێكیان لەڕێگادا پارچە كاغەزێكی دۆزیەوە وەكە لەسەری ناوی خوا نوسرابو، خەڵكی بەسەری دەكەوتن، ئەویش هەڵیگرتەوە بەڕێزەوە پاراستی، بەدرهەمێك بۆنێكی كری دای لە كاغەزەكەو بۆ نخۆشی كرد، پاشان خستیە نێو كونی دیوارێك ئینجا ئەوەی بینی كە لە خەودا دەبندرێت، پێیان گوت: ئەی – بشیر– تۆناوی ئێمەت پاك كردەوە ئێمەش ناوی تۆ لە دنیاو قیامەتدا پاك دەكەینەوە.






## ٤٦٠ - لە خزمەت زانایان ودانایان

-ابن الجوزي دەفەرمویَ:

هەرکەسێ لەبەرخاتری خوا زمانی خۆی بپارێزێ لە دنیادا، خوای گەورە زمانی دەکاتەوە بەشایەتومان هێنان لە کاتی مردندا، وەهەکەسێ زمانی بەرەڵلابکات لە باس کردنی نامووسی خەڵکی و شوێن ناموسیان بکەوێت ئەوا لە کاتی مردن وگەیشتن بەخوا زمانی کلیل دەدرێت وقسەی بۆ ناکرێت وەناتوانێ شایەتومان بێنێ.

-مالك ی کوڕی دینار دەفەرمویَ:

ئەگەر قەسوەت ودڵ ڕەقیت بینی لە خۆت، یان خۆشەویستی دنیا و نەویستنی مردن، یان بێ بەشی لە رزق و رۆژی ئەوا بزانە کە قسە لە شتێك دەکەیت کە پەیوەندی بە تۆوە نەبێت.

-یەکێك لە دانایان دەفەرمووێ: وازهێنان لە قسەی زیاد وپروپووچ بەرهەمەکەی قسەکردنە بە حیکمەت و دانایی، وە وازهێنان و خۆپاراستن لە سەیر کردنی ئافرەتی نامەحرەم ترسی خواو ملکەچی لە دڵ دروست دەکات، هەرکەسێ وازبێنێ لە زۆر خواردن ئەوا لەززەت و چێژی خواپەرستی وەردەگرێ، هەروەها وازهێنان لە زۆر پێکەنین سام و هەیبەت زیاد دەکات، بە خۆپاراستنت لەماڵی حەرام بەهەشت وەدەست دێنی، وازهێنان لە جاسووسی وگەڕان بەدوای عەیب وعاری خەڵك بەرهەمەکەی چاك بوونی عەیب وعاری خۆتە، وازهێنان لە بەدگومانی لەزاتی خوای گەورە



بەرهەمەکەی نەمانی گومان ودووڕوویيە

-لقمانی حەکیم بەکوڕەکەی دەڵێ:

هەرکەسێ بەزەیی بەخەڵك دا بێتەوە ئەوا خەڵکیش بەزەییان بە ئەودا دێتەوە، هەرکەسێ بێ دەنگ بێ سەلامەت دەبێ، هەرکەسێ کردەوەی چاك بکات دەیباتەوە هەرکەسێ کردەوەی خراپ بکات تاونباردەبێ، هەرکەسێکیش جەڵەوی زمانی خۆی لە ژێر دەستی دانەبێ و نەتوانێ بیگرێ ئەوا پەشیمان دەبێتەوە.

-هەروەها لە پەڕاوەکانی (صحف)ی ابراهیم دا هاتووە (علیه السلام) پێویستە لەسەر پیاوی ژیرو عاقل زۆر بینەربێ بەسەردەم و زەمانی خۆی، ڕوو بکاتە کاروباری خۆی بەچالاکی ڕایبپەڕێنی وەزمانی خۆی بپارێزێ

-هەروەها گوتراوە:

براکەم!! وریابە خەڵکی ناشیرین مەکە بەعەیب و عارێك کەڵییان دەبینی، چونکە لەوە دەترسم تۆش تووشی ئەوە ببیت وئەویش چاك بێتەوە[1].

(١) بحر الدموع، ا بن الجوزي، لاپەڕە (١٧٣).

## ٤٦١- هەڵوێستی ئیمامی (عمر)ی کوڕی عبدالعزیز لە کەنیسەی یوحنادا

وەلیدی کوڕی عبدالملك بەشێکی زۆر گەورەی ڕوخاند لە کەنسیەی یوحنا لە دیمەشق بۆ ئەوەی مزگەوتی (الاموی) زیاتر فراوان بکات وەئەو بەشەی کرد بە مزگەوت هیچ حاکم و گەورە و دەسەڵاتدار لەو جۆرە هەڵوێستانە نەیانتوانی کە لە جیاتی ئەمە قەرەبوویێکی تەواو بدەن بە پیاوانی کەنیسە، بەڵام ئیمامی عمری کوڕی عبدالعزیزی خۆی لەگەڵ ئەو دادپەروەری یە ڕەفتار دەکات وڕاستی نیشان بە هەموو جیهان ودەوروبەری ئەدات بەچەند هەڵس و کەوتێکی جیاواز لە ئێمە،

بەڕاستی هەڵوێستێکی گەورە وپیرۆزبوو..

هەستا بە ڕوخاندنی ئەو بەشە زۆری لە مزگەوتی (الاموی) گەڕانەوەی خاکە داگیرکراوەکەش بۆ کەنیسەی یوحنا !!

هەموو زانایان وپیاوە ماقوڵانی دیمەش لەڕێگای شاندی تایبەتی خۆیان ناردیان بۆلای امیر المؤمنین کە پەشیمان بێتەوە لەو بڕیارە و مزگەوتەکە نەڕۆخێنێ، بەڵام امیر المؤمنین هەر لەو ڕۆژەدا بەڵکو هەر لو کاتژمێرە دا کەوەفدیان بۆلای نارد، دەس بەجێ تەنیشتەکەی مزگەوتی ڕوخاندو گێرایەوە بۆ کەنیسە !!

زانایان هیچ ڕێگا چارەیان نەما بۆ پاراستنی مزگەوت و دانەڕماندنی جگە

لەوەی کە دانیشتنیان ئەنجامدا لەگەڵ پیاوانی کەنیسە کە دەبێ ئەو پارچە زەوی یە بدرێتەوە مزگەوت و وەڕازی بن بەوە، هەروەها لە مافی خۆیان ولەوبەشە وەرگیراوە بۆ مزگەوت داببەزن، پاشان وەفدی هەردوولا چوون ئەو هەواڵیان گەیاندە خەلیفە عمری کوڕی عبدالعززی کەپیاوانی کەنیسە لە مافی خۆیان خۆشبوون و دایان بە مزگەوت، ئینجا خەلیفە سوپاسی خوای کرد لەسەر ئەوە، وە بڕیاری لەسەردا و پیێ ڕازی بوو[1].

## ٤٦٢- بۆ (والی مصر)

ئیمامی عمری کوڕی عبدالعززی لەسەردەمی خەلافەتیدا نامەیەك بۆ والی مصر دەنێرێ کە تێیدا نووسرابوو: لەپاشان، هەواڵم پێ گەیشتووە کە خەڵکی حەماڵ لە مصر زیاد لە ئەندازەی خۆی باری گران بار دەکەن لەوشترەکانیان.. هەرکاتێ نامەی منت پێ گەیشت هەواڵ بگەینە ئەو خەڵکە وقەدەغە بکە، کە نابێ زیاتر لەشەش سەد(٦٠٠) ڕیتل بار بکرێت، ئەگەر نا زیاد لە ئەندازە بارەکردن ئەستەمە لەووڵاخەکانتان ئەمەش مایەی تووڕەبوونی خوا و تۆڵە وەرگتنەوەیەتی.

---

(١) خلفاء الرسول، خالد محمد خالد (٥٨٠)، دار الجيل.

# ٤٦٣- سوێند بە خوا من هەرگیز لەبیرم نەچووە

ایاس ی کوڕی سلمە لە باوکی دەگێڕێتەوە دەڵێ: عمری کوڕی خطاب بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت منیش لە بازاڕ بووم، بۆ پێدا ویستێکی خۆی تێبەری ودارێکی لەدەست بوو، گوتی: ئەی سلمە بەوداره ئەوها شت لە سەر ڕێگادا لادەبەم کە ئازاری خەڵکی دەدات، گوتی: پاشان دارێکی خشاند بەلاشەمدا تەنها جل وبەرگی منی گرت، واتە: ئازارم پێ نەگەیشت – منیش لەسەر ڕێگادا لامدا، ئەویش خۆی بێ دەنگ کرد ساڵێك تێپەڕی بەسەر ئەوە ئیمامی (عمر)م بینی لەبازاڕ وپێی گوتم: ئەی سلمە ئەمساڵ بەنیازی حەج کردنیت؟

گوتم: بەڵێ ئەی امیری ئیمانداران.

دەڵێ دەستی گرتم وبەری نەدام تاکو منی بردەوە ماڵی خۆی، کە چووینەوە ماڵی کیسەیەکی هێنایە دەر کە شەش سەد (٦٠٠) درهەمی تێدابوو گوتی: ئەی سلمە ئەوە بۆ خۆت بەرەبۆپێداویستی خۆت، وەبزانە کە ئەوە لە تۆڵەی ئەو دارلێدانەیە بوو لە ساڵی ڕابردوو، گوتم سوێند بەخوا ئەی امیری ئیمانداران تاکو تۆ باست نەکردوو بەبیرت نەهێنامەوە هەر لەبیرم نەبوو، عمر فەرمووی: سوێند بەخوا منیش تاکو ئێستا هەرگیز لەبیرم نەچووە[1].

---

(١) صحيح وصايا الرسول، المجموعة الثانية، سعد يوسف ابو عزيز (٢) (٣١٤).

## ٤٦٤- خواپەرست ( ربیع ی کوڕی خثیم )

-ڕۆژێکیان کچەکەی پێی دەڵێ:

ئەی باوکەئەوە بۆچی کەمێك ناخەویت..؟

باوکی پێی دەڵێ: ڕۆڵەکەم، باوکت لەوە دەترسی کە لە کاتی شەودا هێرشی بکرێتە سەر.

(سبحانك اللهم.. دەبێ لە هێرشی چ دوژمنێك بترسێ کێ هێرشی دەباتە سەر؟ کەسێك شەوەکەی بەخوا پەرستی زیندوو بکاتەوە تۆبلێی ترسی کەسی هەبێت؟

تەنها ترسی خوا و عەزابی خوا نەبێ...؟)!

یەکێك لە قوتابیەکانی ربیع دەڵێ:

لەوەتەی بیست ساڵە (ربیع)م نەبینیوە قسە بکات مەگەر قسەی ڕاست نەبێ

-یەکێکی تر لە هاورێیەکانی دەڵێ:

لەوەتەی بیست ساڵە هاورێتی (ربیع) دەکەم هەرگیز قسەیەکم لێ نەبیستوە کە خەڵکی پێ عەیبدارو ناشرین بکات و ئازاری لێ وەرگرن

-ابو حیان لە باوکی دەگێرێتەوە دەڵێ:

ربیع ی کوڕی خثیم سەردانی مزگەوتی دەکرد وکەسێك دەستی دەگرت

کە تووشی نەخۆشی (افلیج) شەلەل هاتبوو، پێیان گووت: بۆ چی لەماڵ نوێژ ناکەیت خۆ مۆڵەتت پێ دراوە کە لە ماڵ نوێژ بکەیت؟ لەوەڵامدا دەیگوت: بێگومان من گوێم لە (حي على الصلاة)ی بانگی نوێژە، ئەگەر ئێوەش دەتوانن، بڕۆن بۆ مزگەوت ئەگەر لەسەر ڕوخسارو سینگیش بێ[1].

## ٤٦٥- لەوکاتەدا ئەی ابو عبيد الله؟!

پیاوێك لە پێش ڕۆژهەڵاتندا هاتە لای ئیمامی شافعی بینی وا سەیری قورئان دەکات، پێی گوت: لەوکاتەدا سەیری قورئان دەکەیت ئەی ابو عبدالله؟!

(واتە: تاکو ئێستا هەرسەیری قورئان دەکەیت؟)

ئیمامی شافعی فەرمووی: بێگومان من لەوەتەی نوێژی خەوتنان (عشا)م کردووە هەر سەیری ئەحکامەکانی قورئان دەکەم![2].

---

(١) قصص العابدين، د. حامد احمد الطاهر، لاپەڕە (٥١).

(٢) ١٠٠٠ قصة وقصة من حياة الأئمة الأربعة، لاپەڕە (٢٥٠).




## ٤٦٦- داوام لەخەون لێکدەرەوەیەك کرد کە خەوەکەم بۆ لێکداتەوە

ربیع ی کوڕی سلیمان دەڵێ:

گوێم لە ئیمامی شافعی بوو دەیفەرموو:

لە خەودا بینیم پیاوێك هاتە لام وئەوەی کتێب و نووسین بوو لەلام هەمووی هەڵگرت وبەهەوای دادا وپەرت و بڵاوی کردن بەئاسمان، منیش داوام لە خەون لێکدەرەوەیەك (المعبر) کرد کە ئەو خەوەم بۆ لێك بداتەوە، ئەویش گوتی: ئەگەر ڕاست بکەیت لەو خەونەت ئەوا هیچ شارێك نامێنی لە شارەکانی ئیسلام ئیللا زانست و زانیارەکەت لێ بڵاو دەبێتەوە[1].

## ٤٦٧- ئازایەتی زانایان بەرامبەر بە کاربەدەستان

طاووسي کوڕی کیسان ی یمانی یەکێکە لە زانا هەرە بەڕێزو پایەدارانی ئیسلام زیاتر لە پەنجا (٥٠) هاوەڵی بینوە چەندین فەرموودەی لێ گێراونەتەوە، زیاتر فەرموودەی لە عبدالله ی کوڕی عباس (رضي الله عنه) گێراونەتەوە، بەرامبەر بە هەموو کەسێك حەق بێژو ڕاست گۆبووە لەترسی دەسەڵاتداران هەرگیز حەق ی نەشاردۆتەوە بەڕاشکاوی گووتویەتی، لەبەردەم دەرگای کار بە دەستان نەوەستاوە و پارەوو پوولی وەرنەگرتووە

(١) ١٠٠٠ قصة وقصة من حياة الأئمة الأربعة، لاپەڕە (٢٥١).






لێیان، وەهیچ کاتێ خۆی نەبردۆتە پێشیان تاکو بیناسن و بۆ ڕۆژی تەنگانە بەکەڵکی بێن، لێان بێ باك بووە،

کوڕەکەی بۆمان دەگێڕێتەوە ودەڵێ:

هەردەم بە باوکم دەگووت باوکە پێویستە بۆت کە بچیتە لای کاربەدەست لەلای دابنیشی، سەردەمێك دەچووین بەنیازی حەج کردن، لەڕێگادا لە گوندێکی دابەزین کە یەکێك لە کارکەرەکانی محمدی کوڕی یوسفی لێبوو (کە برای حجاج ی کوڕی یوسف بو) یان ایوب ی کوڕی یحیی بوو، کە پێیان دەگوت: ابن نجیح کە لە هەموو کارەکەرەکان پیس تربوو، ئێمەش نوێژی بەیانیمان لە مزگەوت کرد، لەناکاو ابن نجیح یان ئاگادار کردەوە کە (طاووس) لێرەیە، ابن نجیح هاتە لای ولەبەردەم گاووس دانیشت وسەلامی لێ کرت بەڵام طاووس هیچ گوێی پێ نەداو هەروەڵامیشی نەدایەوە، پاشان چووە لای تەنیشتی چەپەی هەر وەڵامی نەدایەوە خۆی بۆ ئالۆزنەکرد، دەڵێ: کاتێ منیش بینیم کە باوکم ئەوهایە لەگەڵ ابن نجیح هەستام چوومە لای ابن نجیح ودەستم گرت وپێم گوت: بەڕاستی باوکی عبدالرحمن (طاووس) تۆی نەناسی بۆیە وەڵامی نەدایەوە ابن نجیح گوتی: بەڵێ: ناسینی ئەو وای کردووە کە ئەوهای لە من کرد (واتە: لەبەر زۆر خواناسینی ئەوها منی فەرامۆش کرد و گرنگی پێنەدام) ئینجا ابن نجیح بەبێ دەنگی ڕۆیشت کاتێ هاتمەوە ماڵێ باوکم ڕووی لە من کردوو زۆر سەرزەنشتی کردم وپێ گوتم تۆ وا گومان دەبەیت کە بە شمشێرەکەت بچیتە لایان وئینجا






زمانی خۆت بۆ ناگیری وناتوانی هیچ قسەنەکەیت؟ [1].

(طاووس) وەڵامی سەلامی (ابن نجیح)ی دایەوە بەڵام بەدەنگی بەرز وەڵامی نەدایەوە تەنها بەبێ دەنگی بۆ ئەوەی واجبەکەی لەسەر نەمێنێ.

## ٤٦٨- خوای گەروە لە نێو دڵی پیاوی خۆپارێزو داوێن پاکە

وهب ی کوڕی منبە دەڵێ:

بنیٚ اسرائیل پرسیاران لە یەکێك لە پێغەرەکانیان کرد سەبارەت بە خوای گەورە و میهربان کەوا لە کوێ یە؟ وەلە چ ماڵێکە؟ ئایا ماڵێکی بۆ دروست بکەین و تێدا خوا پەرستی بکەین؟

خوای پەروەردگار بە پێغەمبەرەکانی گوتی: قەومەکەت پرسیاریان سەبارەت بە من لێ کردیت کەوا لە کوێم وماڵم لە کوێ یە بۆ ئەوەی من بپەرستن و چ ماڵ وخانووێك بەشی من دەکات؟ بەڵام بزانە کە ئاسمان و زەوی بەشی من ناکات و بۆ من فراوان نییە، هەرکاتێ ئەوان ویستیان کە من لەکوێ نیشتەجێمە ئەوا بێگومان من لە نێو دڵی پیاوی ئیمانداروخۆپارێزو داوێن پاکم [2].

---

( ١) حلية الاولياء ابو نعيم الاصفهاني بەرگی (٤) لاپەڕە (١٦)

( ٢) حلية الاولياء، ابو نعيم الاصفهاني، بەرگی (٤) لاپەڕە (٢٥)






## ٤٦٩- نەمویست شتێك بخوێن كە بێ ئاگابێ لە زیكری خوا

ابو العباسی كوڕی مسروق دەڵێ: سەردەمێك لەیەمەن بووم نێچیروانێكم بینی ماسی دەگرتن لە یەكێك لە كەنارەكانی دەریادا كچێكی بچوكی (تەمەن ٥-٧)ساڵانی لە تەنیشت خۆی دانابوو، هەركاتێ ماسی یەكی دەگرت و دەیخستە ناو زەنبیلەكە، كچەكەش یەكسەر فڕێی دەدایە ناو ئاوەكەوە، پیاوەكە ئاوڕی دایە و هیچ ماسی نەبینێ، بۆیە بە كچەكەی گوت: چیت لە ماسی یەكان كرد؟ كچەكە گوتی: باوكە ئایا نەتبیستووە لە پێغەمبەر (ﷺ) كە فەرموویەتی: (هیچ ماسی یەك بە تۆڕی ماسی گرەوە نابێ مەگەر لە زیكری خوا غافل بوو بێت) منیش نەمویست شتێك بخۆین كە لە زیكری خوا غافل و بێ ئاگا بێ.

كاتێ باوكەكە ئەمەی بیست لە كچەكەی، گریا و تۆڕەكەی فڕێ دایە ناو ئاوەكە [1].

## ٤٧٠- شەرم دەكەم داوای خواردن بكەم لە خوا

عبدالله ی كوڕی محمدی كوڕی وهب دەڵێ :

یحی ی كوڕی معاذ كچێكی زۆر بچوكی هەبوو، ڕۆژێكیان داوای شتێكی (خواردنی) كرد لە باوكی.

---

( ١) صفه الصفوه، ابن الجوزی، بەرگی (٤) لاپەڕە (٥٥٨)






باوکیشی پێی گوت: ڕۆڵەکەم ئەو شتە داوا لە خوا بکە ! کچەکەی ڕووی کردە باوکی وگوتی: باوکە ئایا جێگای شەرم نییە بۆ من کە داوای شتێك بکەم لە خوا کەوا بخورێت؟ [1].شەرم دەکەم داوای خواردن لە خوا بکەم.

## ٤٧١- سەرەمەرگ

کاتێ مردن هاتە سەر خوا پەرستی زاهید (عبدالله کوڕی ادریس) ناڕەحەتی وئازار بەسەری زۆر بوو، کاتێ دەستی کرد بە هاوارو ناڕەحەتی، کچەکەی گریا، گوتی: کچەکەم: نەگری.. بەڕاستی لەوماڵەدا چوارهەزار جارخەتمی قورئانم کردووە، هەموی بۆ ئەو ڕۆژەیە لە تێیدا بێ هۆش دەکەوم.. وململانێ لەگەڵ گیان کێشان دەکەم..

– عامری کوڕی عبدالله بن الزبیر – کاتێ هاتە سەر مردن، هەناسەکانی ژیانی خۆی ئەژماردەکرد، ماڵ وخێزانیشی لە دەوری دەگریان لەناکاو ململانێ و زۆرانبازی لەگەڵ مردن دەکرد، گوێ ی لەبانگ دەربوو بۆ نوێژی مەغریب بانگی دەدا، گیانیشی لەگەردەنی دا بوو، کە زۆر بە ئازار دەردەچوو، کاتێ بیستی کەبانگ درا گوتی: دەستم بگرن.. گوتیان: بۆ کوێ؟ گوتی: بۆ مزگەوت.. گوتیان دەچیتە مزگەوت کە چی لەسەر ئەو حاڵەی؟ گوتی: سبحان الله گوێم لە بانگ ی نوێژ بێ و وەڵامیش نەدەمەوە؟

---

(١) صفه الصفوه، ابن الجوزی، بەرگی (٤) لاپەڕە(٥٥٨)






دەستم بگرن..!!

دەستیان گرت و بردیان بۆ مزگەوت، یەك ڕەكعەت نوێژی لەگەڵ ئیمام كرد، پاشان لە سوجدەكەی دا مرد.. بەڵێ كە مرد لە سوجدە دابو.

– هەروەها عبدالرحمن الاسود لە سەر مردن بوو.. گریا، گوتیان بۆ چی دەگری.. تۆ... تۆ ئەو هابوویت لە خوا پەرستی وعیبادەت.. ملكەچی و زوهدو خۆپارێزی.. گوتی: سوێند بە خوا دەگریم داخی گەورەم لە دەست دانی نوێژو ویۆژوومە، پاشان هەر قورئانی دەخوێند تاكو گیانی دەرچو،

– یزیدی الرقاش.. كاتێ مردن بووە میوانی دەستی كرد بە گریان.. دەیگوت: كێ بۆت بەڕۆژوو دەبێ، كێ دوعات بۆ دەكات كاتێ مردیت ئینجا شایەتومانی هێنا وگیانی دەروچو[1].

## ٤٧٢- دڵسۆزی ڕاهیبێك

وهب ی كوڕی منبه دەڵی: پیاوێك گەیشتە ڕاهیبێك وپێی گوت: ئەی راهیب نوێژكردنی تۆ چۆنە؟

راهیب گوتی: گومان نابەم هەركەسێ باسی بەهەشت ودۆزەخی لەلا كرابێت ئینجا سعاتێكی بەسەردا تێپەڕی بێ كە نوێژی تێدا نەكردبێ، (واتە:

---

(١) جامع رسائل الشيخ محمد العريفي، د.محمود عبدالرحمن العريفي، بەرگی(١) لاپەڕەی(٣٦٥)






هەرکەسێ بە تواوی بزانێ کە بەهەشت ودۆزەخ هەیە ئەوا هەرگیز کاتەکانی بەسەرنابات مەگەر بە نوێژ کردن نەبێ).

پیاوەکە گوتی: ئەی راهیب چۆن یادی مردن دەکەیت؟

گوتی: هەرکاتێ قاچم دادەنێم یان بەرزی دەکەمەوە من وادەزانم کە مردووم (واتە ئەوها مردن لە خۆم نزیك دەکەمەوە) ڕاهیب بە پیاوەکەی گوت: ئەی پیاو ئەی نوێژی تۆ چۆنە؟

گوتی: من کە نوێژ دەکەم ودەگریم ئەوەندە فرمێسك دەبارێنم گیاو بۆر سەوز دەبێ لەبەر فرمێسکەکانم، ڕاهیب گوتی: بۆچی ئەگەر شەو تاکو بەیانی پێبکەنی وە دان بە تاوانیشت بنێی زۆر باشترە لەوەی کە تۆ بگریت و ڕیابازبی هیچ کردەوەیەکیش لێ بەرزنابێتەوە پیاوەکە بە ڕاهیبەکەی گوت: من وادەبینم کە تۆ پیاوێکی داناو حەکیم بیت ئامۆژگاریم بکە ڕاهیبەکە گوتی: خۆشەویستی دنیا لە دڵت دەربکە و بە تەواوی وازی لێ بێنە، ململانێ لەگەڵ ئەوکەسانە مەکە کە دنیا ویستن، لە دنیادا وەك مێشی هەنگ وایە شتی پاك دەخوات و پاکیش دادەنێنێ و دەیبەخشێ (هەنگوین) ئەگەریش لەسەردارێك بنیشێ ئەوا نایشلەقێنێ، چونکە قورسایی نییە – ئامۆژگاری خەڵك بکە بۆ خوا، وەك چۆن سەگ ئامۆژگاری خاوەنەکەی خۆی دەکات، برسی دەکەن ولێی دەدەن وبەدەری دەنێن بەڵام ئەو هەر ئامۆژگاری دەبەخشێ، ئینجا دەڵێ:

وهب ی کوڕی منبە: هەرکاتێ ئەو بەسەرهاتەی بەبیردێتەوە دەیگوت:






ای لەو عەیب و شوورەییە ئەی وهب سەگ لە تۆ زیاتر ئامۆژگاری خاوەنەکەی بکات بۆ خوا[1].

## ٤٧٣ - ئامۆژگاری وحیکمەتەکانی ئیمامی شافعی

پێشەوا شافعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێ:

– هەرکەسێك ببێتە قازی ودادوەر بەلام فەقیر و کەم دەرامەت نەبێ ئەوا ئەو کەسە دزە ومالی خەلکی دەدزێ.

– ئەگەر زۆر ئیش وکارت لەسەر شان کۆببوونەوە ونەتزانی کامیان بکەیت، ئەوا کامیان لە هەمووی گرنگترە لە ئەو دەست پێ بکە.

– کەسێك نەهێنی خۆی پاراست ئەوا چاکە لە ژێر دەستی یەتی.

– ئەمە لە مروئەت و پیاوەتی دانییە کە پیاو هەوالی تەمەنی خۆی بە خەلك ڕابگەیەنێ و بلێ تەمەنم ئەوەندەیە، چونکە ئەگەر بچووك بێ بەبێ ڕێزی سەیری دەکەن ئەگەر تەمەنی گەورە بێ دیسان دەلێن بێ هێزە، باشتر وایە کەس نەزانێ.

– لە هەمو کەسێك زیاتر بەڕێز ترو بەقەدرتر کەسێکە کە ڕێزو قەدری خۆی نابینێ – واتە: خۆی بەلاوە گەورە و ڕێزدارنییە وەلە هەموو کەسێك

---

( ١) حلیة الاولیاء، ابو نعیم الاصفهاني بەرگی (٤) لاپەڕە(٢٧)






گەورە و خاوەن شەرەف تر کەسێکە کە خۆی پێ گەورە وخاوەن شکۆ و شەرەف نەبێ.

– ئەگەر باسی پیاوێکیان کرد وناویان لێ بەرزوبڵاو کردەوە بە کارێك کە پیشەی ئەو نەبێ ئەوا بزانە کە ئەو پیاوە تووشی شکەستی کرا

– پیاوە گەورەکان لە ماندوبووندان.

– کەسێك توورە بکرێ وئەویش توورە نەبێ ئەوا ئەو کەسەکەرە، بەڵام کەسێك رازی بکرێ بەڵام ئەو هەر رازی نەبێ ئەوەش بەڕاستی شەیتانە.

– هەرکەسێ: لە هاورێتی براکەی ڕاست بکات، ئەوا لە ناخۆشیەکانی دەبوورێ، وەپێداویستی و ناتەواو یەکانی بۆ پڕدەکاتەوە ویارمەتی دەدات، وەلە هەڵەو خلیسکانی دەبوورێ.

– هەرکەسێك چاکەیەکت لەگەڵدا بکات ئەوا بزانە کە تۆی بەستاوەتەوە بەڵام هەرکەسێ خراپەیەکت لەگەڵدا بکات بزانە کەو تۆی ئازاد و بەرەڵلاکردیت.

– خوا تۆی بە ئازادی دروست کردوە، تۆش وابە وەك دروستی کردوویت، واتە: نەکەویتە ژێردەستی خەڵك و هەمیشە ئازادبە.

– کەسێ: بڵێ لە هەڵەم ببورە، کەچی هیچ هەڵەیەکی نەکردبێ ئەوا بەخۆی هەڵەی لەسەر خۆی بڕیارداوە

– هەرکەسێك بڵێ قورئان دروست کراوە (مخلوق) ی خوایە ئەوە کافرە






(بەڵکو قورئان کلام و وتەی نەفسی ئەزەلی ئەبەدی خوایە)

– هەرجارێك سەیری کتێبی (موطأ)ی ئیمامی مالکم کردبێ ئیللا شتێکی زیاتری لێی تێگەیشتووم

– گەورەترین کەس لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) ابو بکرە پاشان عمرە پاشان عثمان پاشان (علی)یە.

– ئیمان و باوەڕ قسەو کردارە، بەخوا پەرستی زیاد دەبێ، بەگوناهو تاوانیش کەم دەبێتەوە، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە (ویزداد الذین امنوا ایمانا) المدثر(۳۱).

– هەرکاتێ لە کتێبەکانی من شتێکتان بینی کە پێچەوانەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەربوو ئەوا بزانن کە من لێ پەشیمانم.

– چ ئاسمانێك سێبەرم لێ دەکات وە چ زەوییێك ڕامدەگرێت کاتێ فەرمودە یەکم لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەت کرد و ئینجا قسەم پێی نەکرد و بڵاوم نەکردوە؟

– هەرکاتێ فەرمودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) صحیح وڕاست بوو ئەوە مەزهەب وڕێرەوی ڕاستەقینەی منە.

– کەسێك حەسوودی وئیرەیی بە خەڵك ببات، لە ناو پەشیمانی وحەسرەت بەدرێژایی دەمێنێتەوە، وەدرێژە دەدرێ بە ئاهو حەسرەتی هەروەها پلەو پایەی گەورە و ناوداریش لەدەست دەدات.






– هەرکارێك لە پوختی ئەنجام بدرێت هەرگیز وشك وبێ بەر نابێ

– هەرکەسێك بەرگ و پۆشاکی خاوێن ڕاگرێ خەمی لەدڵ کەم دەبێ وهەرکەسێ بۆنی خۆی خۆش بکات عەقلی زیاد دەبێ.

– ابو محمد کوڕی کچی ئیمامی شافعی دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکم (ئیمامی شافعی) گوتم: ئەی باوکە داوای چ زانستێك بکەم؟

فەرموی: ڕۆڵەکەم: بزانە کە شیعر هۆنینەوە پیاوی بەرز نزم دەکات وەپیاوی نزمیش بەرزدەکات، وەزانستی (النحو) ئەگەر گەیشتیە ئامانج ئەوا دەبیتە پیاوێکی بەڕێزو خاوەن ئەدەب، وەزانستی میرات (الفرائض) هەرکاتێ خاوەنەکەی پێی گەیشتە ئامانج ئەوە بۆتە مامۆستای حیساب، وەزانستی فەرمودەش (علم الحدیث) یان فەرمودە گێڕانەوە و لەبەر کردن، ئەوا لەکاتی تەواو بوونی تەمەنی مرۆڤ بۆی دەبێتە بەرەکەت و دێتەلای، زانستی (فقە) شەرع بەراستی بۆ پیرو گەنج، گەورەی هەمو زانستەکانە.

– هەرگیز نەبەڕاست نەبە درۆ سوێندم نەخواردووە.

– هەرکەسێك کەسێکی بە نهێنی ئامۆژگاری کرد ئەوا بەڕاستی ئامۆژگاری کردووە و ڕازاندوویەتی یەوە، بەڵام کەسێك بە ئاشکرایی و لە ناوخەلك ئامۆژگاری کەسێك بکات ئەوا سەرزەنشت و خیانەتی لێ کردووە.

–لە هەمووکەسێك ستەمکار تر لە نەفسی خۆی، کەسێکە، کەوا باڵی ملکەچی و خۆبەکەم زانین دادەنێ بۆ کەسێك کە ڕێزی نەگرێ، وەزۆر حەز بە خۆشەویستی کەسێك بکات کە سوودی بۆی نەبێ، وەستایشی کەسێ






وەربگریٚ کە نایناسیٚ.

– سەخاوەت و بەخشین وڕێز هەمیشە عەیب و عاری دنیا و قیامەت دادەپۆشن بەمەرجێك شتێکی بیدعە و خوارفیاتی لەگەڵ تێکەڵ نەبیٚ

– هەرکەسێك حەز بکات کە خەڵکی بەچاك باسی بکەن، باگومانی خۆی چاك بکات بەرامبەر بە خەڵك.

– زیاد لە ئەندازەی خۆی ڕێزم لە هیچ کەسێك نەگرتووە.

– کەس رییاء ناناسیٚ مەگەر پیاوێکی دڵسوز نەبیٚ، الله اکبر.

– هەرکەسێك حەز بکات کە خوا دەرگای دڵی بکاتەوە و وەحیکمەتی پیٚ ببەخشیٚ، ئەوا باهەمیشە حەز لە تەنیایی وکەم قسە کردن و واز هێنان لە تێکەڵی پیاوانی کەم عەقل بکات، هەروەها ڕقی لەو زانایانە ببێتەوە کە ئینساف و یژدان وڕێزیان نییە.

– لە هەمو توێشووێك بە سوودتر تەقواو خۆپارێزی یە وەلە هەمووی بەزیان و زەرەتر ستەم و سنوور شکاندنە.

– سەردەمێك بەسەر خەڵکدا دێت ئەگەر لەشەودا زەوی هەموی ببێتە دینار وەکو ڕایەخ ڕاخرابێت، وەلە سەر هەموو دینارێك نووسرابیٚ (لا اله الا الله من اخذها دخل النار) واتە: هەرکەسێك هەڵیبگرێتەوە دەچێتە دۆزەخ، ئەوا بەیانی دەبینی کەیەك دیناریش لەسەر زەوی نەماوە هەمو هەڵگیراوە.. صدقت.. ! ! ڕاستت کرد ئەی پێشەوای دنیا و دین.






- چاکەی دنیاو قیامەت لە پێنج شت دایە.

دەوڵەمەندی لە ناخی دڵەوە، ئازارنەدانی خەڵك، پەیداکردنیماڵی حلال، پۆشاکی خۆپارێزی، متمانەبوون بەخوا لە هەمو کاتێك.

- ئەگەر زانایان لە ڕۆژی دوایی دا دۆست وەلی خوا نەبن ئەوا خوا هیچ دۆست و وەلێکی نییە.

- پرسیار کرا لە شافعی: کەی پیاو دەبێ بەزانا؟

فەرمووی، هەرکاتێ لە زانستەکەی ڕاستەڕێ بوو وەشارەزاییێکی تەواوی پەیدا کرد ئینجا کاری بەوزانستە کرد، هەروەها خۆی ئاریش کرد بۆ هەمو زانستەکان ئینجا بیری کردەوە لەو زانست و زانیاری یەی کە لێی فەوتاوە، ئەوا لەو کاتەدا دەبێ بە پیاوێکی زانا.

- وریا بە نەچیتە شارێك کە پیاوێکی زانای لێ نەبێ کە لە دینەکەت شارەزابکات، وەدکتورێك کە لە لاشەت ئاگادارت بکاتەوە!

- دووشت هەن خەڵکی لێ بێ ئاگان، پزیشکی وزمانی عرەبی یە.

- سێ شت هەن هیچ پزیشکێك چارەسەری بۆی نادۆزێتەوە بێ عەقلی و نەخۆشی تاعوون و پیری یە.

- زۆر دەترسم لەوکەسەی کە داوای زانست دەکات بەبێ نیەتی چاك کە زانستەکەی سوودی پێ نەگەیەنێ، چونکە هەموو کردەوەکان بەنیەتە.

- جوانی زانایان تەقوایە، خشڵیان ڕەوشتی جوانە، شۆخ وشەنگیان






دەرون پاکییە.

- داوا کردنی زانست گەورەترە لە نوێژی سونەت.

- هیچ شتێك لەدوای جێبەجێ کردنی قەرزەکان گەورەترنی یە لە داواکردنی زانست، گوتیان: تێکۆشانیش لە پێناوی خوا؟

فەرمووی تێکوشانیش لە پێناوی خوا

- کەسێك ژیانی دنیای بوێت با خۆی بە زانست سەرقاڵ بکات، وەکەسێك ژیانی دوا ڕۆژی بوێت با خۆی بە زانست سەرقاڵ بکات.

- خۆت شارەزا بکە لە شەرع پێش ئەوەی ببیتە گەورەی خەڵك هەرکاتێ بوویتە گەورە و سەرکردەی خەڵك هیچ ڕێگایەکت نییە بۆ ئەوەی شارەزابیت لە شەرع، واتە: لەسەر سەرقاڵیت ناتوانی خۆت شارەزا بکەیت

- زانست ئەوە نییە کە لە بەربکرێت، بەڵکو ئەوە کە سوود بەخش بێت

- هەژار بوونی زانایان هەژاربوونێکە بە ئیختیاری خۆیانە بەڵام هەژاربوونی نەزانان بە ناچاری یە.

- جیدال و موناقەشەی بێ کەڵك لە زانستدا دڵ ڕەق دەکات هەروەها ڕق وقینە لە دڵ دروست دەکات.

- زانست نەفامی لەلایەن نەفامان هەروەك چۆن نەفامی، نەفامی یە لەلایەن زانانایان.

- هیچ کەسێ: لە زانایان لە خوا ترس نییە.






- تێری (زگ پڕی) لاشە گران دەکات، دڵ ڕەق دەکات زیرەکی لادەبات ومێشك لاواز دەکات، نووستن زیاد دەکات خاوەنەکەی لە خوا پەرستیدا بێ هێزو لاواز دەکات.

- هەرکەسێ بڵێ خواو دنیام خۆش دەوێن ئەوا درۆ دەکات.

- ملکەچی خۆشەویستی پەیدا دەکات، قەناعەتیش ئیسراحەت پەیدا دەکات.

- ئەگەر هاوڕێ یەکت هەبوو بەهەردووك دەست بیگرە، چونکە گرتنی هاوڕێ و هەڵبژاردنی شتێکی زەحمەتە، بەڵام لێی جیابوونەوەی ئاسانە.

- ڕۆژێك پرسیارێکیان لێ کرد لە بارەی مەسەلەیەکی شەرعی ئەویش لێی بێ دەنگ بوو، گوتیان بۆ وەڵام نادەیتەوە؟ فەرمووی بیری لێ دەکەمەوە تاکو نەزانم ئایا خێر لە وەڵامدانەوەیە یان لە بێ دەنگ بوونمە[1].

## ٤٧٤- پەند وەرگرتن

ئەگەر دەتەوێ خۆشەویستێك بینی کە بەڕاستی بۆ خوا و پێغەمبەری خوابێ گوێ بگرە بۆ ئەو فەرمودەیە کەوا (ابن جریر) لە ابن زید دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ :

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا بانگی عبداللەی کوڕی عبدالله کوڕی ابی کوڕی

---

(١) دیوان وحکم الامام الشافعی لاپەڕە (٢١٠) (٢٤٧)



سلول کرد وپیێ گوت: ئایا دەزانی باوکت چی دەڵێ؟

عبدالله گوتی: بە دایك و باوکم بە قوربانت بم، باوکم چی دەڵێ؟ فەرمووی: باوکت دەڵێ: ئەگەر گەڕاینەوە (مدینە) دەسەلاتدارو پیاوە گەورەکانمان زەلیل وبێ هێزو بێ دەسەلاتەکان بەدەردەنێن لە شار!

عبدالله ی کوڕی گوتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ڕاست دەکات تۆ گەورە و عەزیز و پایەداری ئەویش زەلیل وزەبوون و بێ هێزە، بەلام کە من لە هەموویان زیاتر چاکەکارم لەگەڵ باوکم، ئەگەر خوا وپێغەمبەر ڕازی بن لەوەی کەسەری ببرم وبیهێنم، ئەوا دەچم سەری دەبڕم دەیهێنم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :نەخێر کاتێ موسلمانان هاتنەوە مەدینە لە غەزادا، عبدالله ی کوڕی عبدالله ی کوڕی ابی هەستایە سەر پێ بە شمشێرەکەی بەرامبەر بە باوکی وپاشان گوتی: تۆ گوتووتە: ئەگەر بگەڕێنینەوە بۆ مدینە دەسەلاتدارەکان بێ دەسەلاتەکان دەردەکەین؟!

سوێند بە خوا پێت نیشان دەدەم کە گەورەیی و دەسەلات هی تۆیە یان هی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

سوێند بە خوا سێبەری هیچ ماڵێکت بەرناکەوێ مەگەر ئیزنی خواو پێغەمبەری خوای لەسەر نەبێ.

ئەو باوکەی کە گەورەو سەری دوو ڕووەکان بوو کە نزیك بوو خەڵکی مەدینە بیکەن بە پاشایەکی گەورە پێش هاتنی پێغەمبەر وهاوەلان بۆ مەدینە، ڕوی کردە تیرەی (خەزرەج) گوتی: ئەی نەوەی خەزرەج دەبینن




کوڕم ناهێڵی بچمەوە ماڵی خۆم!

کوڕەکەی دووبارە پێی گوت: ئەرێ واللە بەبێ ئیزنی خوا و پێغەمبەر ناچیتەوە ماڵێ !

هەندێك لە پیاوان چوونە لای پێیان گوت سەبارەت بە باوکی بەڵام ئەو هەر دەیگوت: سوێند بەخوا بەبێ ئیزنی خوا و پێغەمبەر ناچیتەوە ماڵێ، (بەڕاستیش ماڵی لێ قەدەغە کردبوو.)

چونەلای پێغەمبەر (ﷺ) ئەو هەواڵەیان پێ گەیاند فەرمووی: بڕۆن بەعبداللە بڵێن: با باوکی خۆی بێنێتەوە ماڵی و ڕێگای لێ نەگرێ.

عبداللە گوتی: کەواتە ئێستا فەرمانی پێغەمبەر هات منیش دەڵێم بەڵی ئەوە ئیزنی پێغەمبەرە با بچیتە وە ماڵێ.

ئای کە چەندە گەورە و پیرۆزە ئەو خۆشەویستی یەو ولائوبەڕائە بۆ خواو پێغەمبەر (ﷺ) [1].

---

( ١) صرخة المنابر، ابراهيم النعمه لاپەڕە (١٠٦)






## ٤٧٥- هیچ هەژارێکم نەدۆزییەوە

یحیی ی کوڕی سعید کە عاملی عمری کوڕی عبدالعزیز بوو لەسەر ولاتانی ئەفریقیا دەڵێ

ئیمامی عمری کوڕی عبدالعزیز منی نارد بۆ ئەفریقیا بۆ ئەوەی زەکات بەسەر هەژاران لەوێ دابەش بکەم، کە چوومە ئەوێ گوتم: ئەوەی فەقیر و هەژارە بابێتە لام ماڵی زەکاتم بۆ هێناوە با بیدەمێ، دەڵێ: هیچ هەژارێکم دەست نەکەوت کە زەکاتی پێ بشێ، چونکە عمری کوڕی عبدالعزیز خەڵکی هەموو دەوڵەمەند کرد بوو، منیش هەستام بەو پارەیە چەند کۆیلەیەکم کڕین و پاشان ئازارم کردن[1].

## ٤٧٦- کەڕولاڵێکی ڕەوانبێژ

ئەمە یەکێکە لە بەسەرهاتە سەیرو سەمەرەکان، ئەگەر خاوەنەکەی بەدەستی خۆی نەینوسیبایەوە بۆم، گومانم دەبوو کە ڕووینەدا بێت

خاوەنی ئەو بەسەرهاتە خەڵکی شاری مەدینە یە، دەڵێت: من گەنجێکی تەمەن سویێندی سی وحەوت(٣٧)ساڵانم، خێزاندارم ومنداڵیشم هەیە، هەرشتێك حەڕام و قەدەغە بوایە دەمکرد، نوێژم نەدەکرد مەگەر لە بۆنەو ئاهەنگەکاندا نەبایە، ئەویش تەنها بۆ موجامەلەی کەسانێکی تر،

---

(١) صرخه المنابر ابراهيم النعمه لاپەڕە (١٦)



هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە من هاوڕێتی کەسانێکی خراپ و جادوو بازم دەکرد، شەیتان لە زۆربەی کاتەکانمدا دەست بەدارم نەدەبوو، کوڕێکم هەبوو لەتەمەنی حەوت ساڵان بوو ناوی مەڕوان بوو، کەڕولاڵ بوو، بەڵام لە ئامێزی دایکیدا پەروەردەکرابوو لەسەر ئیمان..

ڕۆژێکیان من و مەڕوان لە ماڵەوە بووین من پلانم دادەنا کە لەگەڵ هاوڕێکانمدا چی بکەین، بۆ کوێ بڕۆین، کات دوای نوێژی مەغریب بوو مەروان دەیویست بدوێت لەگەڵمدا ئاماژەی بۆ دەکردم باوکە بۆچی نوێژ ناکەیت؟!

پاشان دەستی بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمان وهەڕەشەی لێ دەکردم کە خوای گەورە دەمبینێت، ئەو کوڕەم هەندێ جار کە کاری خراپم دەکرد دەیبینیم...

سەرم سوڕما لە ئاماژەکانی، کوڕەکەم لەبەر چەممدا دەستی کردە گریان هەڵمگرت و هێنامە پاڵ خۆمەوە بەڵام ڕایکرد لەدەستم، پاشان ماوەیەکی کەم چووەلای مەغسەلەکەو دەستوێژی هەڵگرت کە پێشتر دەسنوێی نەدەزانی بەڵام فێر ببو لە دایکی یەوە، ئەو دایکەی کە هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم بەڵام بێ سوود بوو، قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەر بوو، پاشان منداڵە کە ڕو لەلا کەم هاتەوە بۆ لام ئاماژەی بۆ کردم کەوا کەمێك چاوەڕوان بم.

لەبەر دەممدا نوێژی کرد، پاشان هەستا قورئانە پیرۆزەکەی هێنا و لەبەر دەممدا داینا و ڕاستە و خۆ بەبێ ئەوەی لاپەڕەکانی هەڵبداتەوە




کردیەوە پەنجەی خستە سەر ئەو ئایەتە لە سورەتی (مریم-٤٥): ﴿ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَٰنِ وَلِيًّا ﴿٤٥﴾ ﴾ .. سبحان الله

واتە: ئەی باوکی بەڕێزم بەڕاستی من دەترسم لەلایەن خوای بەخشەندەوە سزایەك یە خەت بگرێ ئەوکاتە ئیتر دەبیتە هاوڕێ ویاوەری شەیتان.

پاشان دەستی کرد بە گریان منیش لەگەڵیدا گریام هەستایەوە فرمێسکەکانی چاوی سڕیمەوە، پاشان سەرودەستی ماچ کردم پاشان بە ئاماژەکەی کە لە نێوانمداندا هەبوو گوتی: باوکە گیان نوێژ بکە پێش ئەوەی ئەسپەردەی خاك بکرێیت وسزا چاوەڕوانت بێت.

منیش سوێند بەخوا لەسەر سوڕمان وترسێکی زۆر دابووم کە تەنها خوای گەورە دەیزانێ بەخێرایی هەستامەوە هەموو گلۆپەکانم داگیرساند کوڕەکەم زوو بە زوو دوام کەوتبوو بەسەر سوڕمانەوە تەماشای دەکردم، پێ گوتم: واز لە ڕووناکی بێنە با بڕۆین بۆ مزگەوتی گەورە (مەبەستی مزگەوتی پیرۆزی پێغەمبەر بوو لە مەدینە) پێم گوت: با بڕۆین بۆ مزگەوتی نزیك خۆمان، ڕازی نەبوو تەنها بۆ ئەوێ نەبێ، بۆیە چووین بۆ مزگەوتی (نبوی) من زۆر دەترسام چاوی لێم فەرامۆش نەدەکرد بەردەوام سرنجی دەدام، چوینە ڕەوزەی پیرۆزەوە، پریش بوو لە خەڵك هەستاینەوە بۆ نوێژی عیشا ئیمام ئەو ئایەتی لە نوێژدا دەخوێند ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ



خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴾ النور: ٢١.

واتە: ئەی ئەوانە کە باوەڕتان هێناوە شوێن هەنگاوەکانی شەیتان نەکەون هەرکەسێ شوێن پیلان وهەنگاوەکانی شەیتان بکەوێ بێگومان ئەوە فەرمان بە کردەوەی خراپ وتاوانباری دەکات، ئەگەر لەبەر فەزڵ ومیهری خوا نەبوایە هیچ کەسێکی لە ئێوە پاك ناکردەوە وەهەرگیز لە خراپە و تاونباری خاوێنی نەدەکردنەوە، دەمتوانی بەهۆی گریانەوە کۆنترۆڵی خۆم بکەم مەڕوانیش لە پاڵمدا دەگریا لە کاتی نوێژەکەمدا مەروان کلێنکسێکی دەرهێنا فرمێسکەکانی منی دەسڕیەوە، دوای نوێژیش هەر دەگریام وئەویش فرمێسکی دەسڕیمەوە هەتا نزیکەی یەك سعاتی تەواو لە حەرەمی پیرۆزدا دانیشتم تاکو مەروانی کوڕەم پێی گوتم: بەسە باوکە مەترسە!! بەهۆی زۆرگریانمەوە ترسا بوو.. گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە ئەوشەوە گەروەترین شەو بوو لەلام، خێزانم ومنداڵەکانم ئامادەبوون هەموویان دەستیان کرد بە گریان نەشیان دەزانی چی ڕویداوە.. مەڕوان بە زمانی ئاماژە پێی گوتن: باوکم لە حەرەمی پیرۆز نوێژی کرد... خێزانم زۆر دلشاد بوو بەوهەواڵە، بەراستی ئەوە بەرهەمی پەروەردگارە چاکەکەی ئەوبوو،

ئینجا بەسەر هاتی خۆم ومەڕوانم بۆی گێڕایەوە، پێم گوت: سوێندت دەدەم بەخوا ئایا تۆ فێرت کردبوو کە ئەو ئایەتە لەناو قورئان بکاتەوە؟ سێ

جار سوێندی خوارد کە ئەو فێری نەرکدووە..

بەو شێوەیە بەردەوام بووم لەسەر نوێژو خواپەرستی و وازم هێنا لە هەمو هاوڕێکی خراپ، وەبەختەوەرترین ژیان بەسەر دەبەم لەگەڵ منداڵ و خێزانم، بە تایبەتی مەروانی کەڕۆلاڵم کە زۆر خۆشم دەوێت.

چۆن نا.. لە کاتێکدا ڕینمایکردنم لەسەر دەستی ئەوبوو[1].

## ٤٧٧- ڕۆژوانێك ژیانی منی گۆڕی

پێش ئەوەی ئەو بەسەرهاتەی خۆمتان بۆ بنێرم دوو دڵ بووم بەڵام ویستم بە هەمو مرۆڤێك بڵێم کە دەیخوێنێتەوە، نزیکی مرۆڤ لە پەروەردگاری یەوە پێوەرێکی گەرمی هیە، ئەندازەی نزیکی و دوری لە خوای خۆیەوە دەزانێت.

کاتێك منداڵ بووم باوکم دایدەنام کە گوێ لە هەندێ سورەتی کورت بگرم بە دەنگی (شیخ عبدالباسط عبدالصمد) کاتێ گوێم لە دەنگی بوو دەگریام و نەمدەزانی بۆ، تا ئەو ڕادەیە کە بە دەنگی ئەو سورەتە کورتانەم لەبەر کردبوو، کاتێ قورئانم دەخوێند لەسەر ئاوازو دەنگی ئەو دەمخوێند، ژیان بەو شێوەیە تێپەڕی تاکو تەمەنم گەیشتە چواردە ساڵی، هەنگاو بە هەنگاو وردە وردە لە خوا دووردەکەوتمەوە، تا ئەو ڕۆژە هاتە پێشەوە کە ویستی خوا وابوو کە بیهێنێتەوە یادم ئەم گەردوونە خاوەنێکی هەیە توانای

---

( ١) چیرۆکەکانی ڕێنمایی، عمر وخالد لاپەڕە (٣٠) چ (٣) ٢٠١٢ ز

بەسەر هەموو شتەکاندا دەشکێت، توانای ژیان و مردنی زیندووەرانی هەیە،

من لە پۆلی سێیەمی ناوەندی بووم، لەگەڵ سەرەتای ساڵی خوێندندا هەواڵی وەفاتی برا گەورەکەمان پێگەیشت چونکە من و دایك و باوکم لە شارێکی تر بووین، ئەو هەواڵە بۆ من وەك هەورە گرمەیەك وابوو بەڵام زۆر نەدەگریام، دڵم وەکو بەردی لێ هاتبوو، لەوکاتەدا قورئانم نەدەخوێندو نوێژیشم نەدەکرد، وە زۆر دووربووم لە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، کاتێ گەڕاینەوە خاکی نیشتمان، براکەم گەشتی کردبوو بۆ ماڵی هەتا هەتایی ئەوە یەکەمین ڕۆژم بوو کە بۆ مصر بێم و باڵام پۆشی بێت، جاران کە دەهاتمەوە بۆ مصر یەکەم شت سەر پۆشەکەم فڕیدەدا، ڕۆیشتین بۆ گوڕستان بۆ زیارەتی تەنها لەوێ گریام و هەموو شتێکم هاتەوە یاد بیرم کردەوە کە پێویستە چی بکەم ئەگەر من لە جێ ئەو بم، چی بکەم ئەگەر بەسەر پردی (صراط) دا تێپەرم تەنها ئەوە بۆیەکەم جار بوو کە هەستم کرد کە (صراط) چی یە، وەهەر ئەوساتە بڕیارم دا کە باڵام بپۆشم وپابەندبم پێیەوە، بۆیە ئیتر لە کەناری تێچوونەوە ڕزگاریان کردم ودەستیان گرتم، بەرودیاریکردنی ئامانج لە ژیاندا، لێیانەوە مانای خۆشەویستی خوا فێر بووم، وەفێری مانای دڵسۆزی لە کارو کردەوە و گریان لەترسی خوا، وەئەوەی ڕێنمایی کردم دوای خوای گەورە ئەو برایەم بوو، دەخوازم لە خوایە کە بەفەزڵی ئەوەوە ڕێنمایی کرام بۆ ڕاستە شەقام کەوا ڕێنمای هەموان بکات پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە دابێت کە پەشیمان بوونەوە هیچ سوودێکی نییە[١].

---

(١) چیرۆکەکانی ڕێنمایی، عمرو خالد لاپەڕە (٦٧)




## ٤٧٨- هەموی بۆت بە خێرو سەدەقە دەژمێردرێت

ڕۆژێکیان خەلیفە هارون الرشيد داوای کرد لە چێشت لێنەرەکەی کەوا گۆشتی وشتری بۆ ئامادە بکات، بەڵام بۆی ئامادە نەکرد، لەبەر ئەوەی لەو ڕۆژەدا هیچ وشترێکیان سەرنەبڕیبوو، دوای سەردەمێکی زۆر داوای کرد کە گۆشتی وشتری بۆ ئامادە بکەن، ئەمجارە بۆیان ئامادەکرد ئینجا پێیان گووت: ئەی خەلیفە ئایا دەزانیت خەرجیەی ئەو چێشتە چەندە کە ئامادەمان کردووە بۆت؟

رشيد گوتی: چواردرهەم، گوتیان نەخێر چوارسەد هەزار درهەم، گوتی: بۆچی؟

پێیان گوت: پێشتر داوات کرد کە گۆشتی وشترت بۆ ئامادە بکرێت بەڵام ئامادە نەکرا، لەوەتەی ئەو ڕۆژەوە تاکو ئێستا ئێمە هەموو ڕۆژێکی وشترێك سەردەبڕین تۆش هیچ کات داوات نەکردووە مەگەر ئەمرۆ نەبێ، بۆیە خەرجی ئەو هەموو وشترە لەو ڕۆژەدا تاکو ئێستا گەیشتۆتە چوارسەد هەزار درهەم، هارون الرشيد کە ئەمەی بیست زۆر ناڕەحەت بوو یەکسەر هەستاو هیچی لە گۆشتەکە نەخوارد وە دەستی کرد بە گریان و هەموو دابەش کرد بەسەر هەژاران، وەلەو ڕۆژەدا تاکو ئێوارە هەردەگریا، ابو يوسف ی قازی هاتە لای گوتی: خێرە ئەی امیری ئیمانداران ئەوها دەگری؟ ئەویش باسی زێدەڕویی خۆی بۆ کرد کە چەندە ماڵی بەزایەدایە و لەبەر ئارەزوی خۆی کە تەنها یەك پاروی بەبەرکەوتووە، ابو يوسف گوتی: ئەو خەرجیەی کە کردتان



لەو خوادرنە ئایا خەڵکی خواردیان یان فڕی درا؟ گوتیان: نەخێر هیچی بەزایە نەچووە هەموومان بەخشی بە هەژاران، ابو یوسف گوتی: کەواتە ئەی امیری ئیمانداران موژدەت لێ بێ بە پاداشتی ئەو خێرو سەدەقەیە کە خوای گەورە پێ بەخشی لەو ماڵ و سامانەی کە خەرجی دەکەیت لە پێناوی خوا، وەهەروەها بەوەش کە خوا ئەوترس و گریانەی پێ داویت چونکە دەفەرموێ (ولمن خاف مقام ربە جنتان) واتە: بۆ ئەوە کەسە هەیە کە لە خوا دەترسێ دوو باخچەی بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت لەلای خوا.

ئینجا لەو کاتەدا خەلیفە هاتەوە سەرخۆی وەبەتەواوی هێور بووەوە، داوای خواردنی کرد، وە خواردنی ڕۆژی کردە خواردنی شەو، واتە نانی نەخوارد تاکو بوەشەو[1].

---

(١) سیرە وتاریخ هارون الرشید، مرزوق بن سالم الغامدی.




## ٤٧٩- داوای دوو شاهیدی داد پەروەری لی کرد

ابو بكری مروزی دەڵێ: ڕۆژێكیان لەگەڵ ئیمامی احمدی كوڕی حنبل دەرچووین بۆ مزگەوت، كاتێ چووە مزگەوت هەستایە سەرپێ بۆ ئەوەی نوێژ بكات، بینیم دەستی خۆی لە نێو لەچكەكەی هێنایە دەر بەدوو پەنجە ئاماژەیەكی كرد، كاتێ نوێژی تەواو كرد گوتم: ئەی ابو عبدالله بینیم تۆ بە دوو پەنجە ئاماژەیەكت كرد كە چی نوێژت دەكرد؟ فەرمووی: ئەوە شەیتان بوو هاتە لام و پێی گوتم: لەكاتی دەسنوێژ هەردووك قاچت نەشۆردن و ئەودە سنوێژەت ناتەواوە، منیش پێم گوت: بڕۆ دوو شاهیدی عەدل (دادپەروەر)م بۆ بێنە كە قاچم نەشۆردوونە ئینجا باوەڕت پێ دەكەم[1].

شەیتان لەگەڵ زانایان هەمیشە بەزیوە وقەت سەرناكەوێ لە فریودانیان.

## ٤٨٠-ئاوی گەرم

ابو بكری مروزی دەڵێ: بە ئیمامی احمدم گوت: من زۆر جار بانگ دەكرێم بۆ شۆردنی مردوو لە ڕۆژێكی زۆر سارد، وەئاوی گەرمیش دەمێنیتەوە لەبەر شۆردنی ئەو مردووە، ئایا بە كاری بێنم بۆ دەست نوێژ و غوسل؟

فەرمووی: نەخێر، ئەمە بە پارەو خەرجی ماڵ گەرم كراوە وەك بڵێی ئیمامی احمد ڕای وایە كە بگەڕێندرێتوە بۆ واریسەكان، ئەمەش بەڕاستی وەرع و خۆپارێزی یە[2].

---

(١) ١٠٠٠ قصة وقصة من حياة الائمة الاربعة، لاپەڕە (٢٧٣)

(٢) ١٠٠٠ قصة وقصة من حياة الائمة الاربعة، لاپەڕە (٢٧٢)



## ٤٨١- خەلیفە پەند وەردەگرێ

خەلیفە هاورن الرشید یەكێك بوو لە وانەی كە زۆر ئامۆژگاری وەردەگرت لە هەركەسێك بووایە، وە دەگریا لەوكاتەی كە گوێ لەوەعزو ئامۆژگاری دەگرت لەسەر دەمی خەلیفە پیاوێك هەبوو ناوی عبداللە ی كوڕی عبدالعزیز ی عومەری بوو، ڕۆژێك ئامۆژگاری خەلیفەی كرد ولە ئامۆژگاریەكەی درێژەی پێ دا.. بەخەلیفەی گوت كە لەسەركێوی (صفا) لە مەكەی پیرۆز ڕاوەستابوو، سەیر كە چەند خەڵك لە دەوری كەعبەی پیرۆزن؟

خەلیفە گوتی: زۆر

عبداللە گوتی: هەموویان لە ڕۆژی دوایی دا پرسیاریان سەبارەت بە خۆیان لێ دەكرێت، بەڵام تۆ پرسیاری هەموو ئەوانەت لێ دەكرێت دەڵێ: لەوكاتەی هارون الرشید زۆر گریا خەڵكی دەهاتن بەمەندیل و لەچكەكانیان فرمێسكیان بۆ دەسرییەوە،

پاشان عبداللە پێ گوت: ئەی هاورن پیاوی واهەیە زۆر زێدەڕۆیی لە خەرجی ماڵ دەكات ئینجا بەو هۆیەوە قەدەغەی ماڵ خەرج كردنی (الحجر)ی لەسەر دادەندرێت كەچی ماڵ و پارەی خۆیەتی، بەڵام چ دەڵێی سەبارەت بەوەی كە ماڵ و پارەی خەڵك خەرج دەكات وزێدەڕۆیی تێدا دەكات؟ ئینجا عبداللە ڕۆیشت و خەلیفەی بەجێ هێشت بە چاوی گریانەوە، لەبەر ئەوەی لێی قەدەغە كرد كە زێدەڕۆیی لە ماڵی موسڵمانان بكات، بەڵام خەلیفە ئەو ئامۆژگارییەی لێ وەرگرتن بەڕاشكاوێ لە پێش چاوی خەڵك وەستی بە




تاوان کرد و ئینجا دەگریا لەسەر ئەو تاوانەی، ڕەحمەتی خوای لێ بێ.

– هەروەها جارێکیان زانایەکی بە ناوی (ابن السماك) پێی گوت: ئەی امیر المؤمنین تۆ دەمریت بەتەنیا، وەبەتەنیا دەچیتە نێو گۆڕ، وەبەتەنیاش زیندوو دەبیتەوە، کەواتە ئاگات لەو ڕاوەستانە بێت کە لەبەر دەم دەستی بالآی خوای گەورە یە و ڕاوەستان لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ، کاتێ قاچەکان خلیسك دەبەن وەپەشیمانی دروست دەبێ، ئینجا کە خەلیفە ئەمەی بیست زۆر گریا و پەندی وەرگرت [١].

## ٤٨٢- ئەگەر تۆ بە حەزرو ویستی خۆت دەڕۆی مەڕۆ وڕاوەستە

دوای ئەوەی بەسەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص موسڵمان دەرگاکانی هەموو شارو قەڵاو دێهاتەکانی میسریان گرت دوای فەترەیەك ئاوی ڕووباری نیل بەرەوکەمی ڕۆیشت، خەڵکی میسریش چوونە لای عەمری کوڕی عاص تاوەکو مۆڵەتیان بدات کە خووە ساڵانەکەیان ئەنجام بدەن کە بریتی بوو لەوەی کچێکی جوانیان دەهێنا و بەپۆشاکێکی جوان وگرانبەها دەیانڕازاندەوە پاشان فڕێیان دەدایە نێو ڕوباری نیلەوە، بەڵام عەمر داواکەی لێ قەبوول نەکردن، بۆیە نامەیەکی بۆ خەلیفەی ڕاشید عمری کوڕی خطاب نارد لە هەواڵەکانی میسری ئاگاداکردەوە، لەبەرامبەریش دا، ئەمیری ئیمانداران نامەیەکی بۆ نارد کە تێیدا نووسیبووی: ڕاستت کرد و ئافەرین کە

---

( ١) سیره وتاریخ هارون الرشید، مرزوق بن سالم الغامدی



ڕێگەت پیێ نەدان و چاکت پێکا، چونکە ئاینی اسلام ڕۆخێنەری هەموو بیرە پوچەکانی پێش خۆیەتی، هەروەکو چۆن نامەیەکی تریشی بۆی ناردبوو، کە عەمەری کوڕی عاص کردیەوە تێیدا نووسرابوو، (لە بەندەی خوا عومەری ئەمیری ئیمانداران بۆ ڕووباری نیلی میسر لە پاشان ئەگەر تۆ بەحەزو ویستی خۆت وبەدەسەلات دەڕۆی مەڕۆ ڕاوەستە، بەڵام ئەگەر بە فەرمانی خوای تاك و بەدەسەڵات دەڕۆی وخوا دەتجوڵێنی ئەوا داوای لیێ دەکەین کە بتبات بەڕێوە و بتجوڵێنی و زیادت بکات (عەمری کوڕی عاص)یش نامەکەی فڕیێ دایە ناو ڕووباری نیلەوە بینیان بەویستی خوا ئاوەکە گەشەی کردووە و زیادبووەوە [1].

## ٤٨٣- ئازایەتی فێرخواز

ڕۆژێك هاوەڵان لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتبوون فەرموی: مسوڵمان وەك دارێك وایە کە گەڵاکانی ناوەڕێن ئایا کێ دەزانێ ئەودارە چییە؟

هاوەڵان — ئامادەبوان هیچیان نەیانزانی، عبدالله ی کوڕی عمر (رضي الله عنهما) لەوێ بوو، بەڵام شەرمی کرد وەڵام بداتەوە لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەوە دارخورمایە، بۆیە لە ڕوی نەهات باسی بکات چونکە لە هەموویان بچوکتر بووە.

خەڵکی گوتیان: ئەی پێغەمبەری پێمان بڵێ ! فەرمووی: دارخورمایە..

---

(١) چیرۆکی ئادابە ئیسلامیەکان (٢٠-٢١) چاپی یەکەم




پاشان عبدالله کوڕی عمر بە باوکی گوت: من دەمزانی بەڵام لە ڕووم نەهات باسی بکەم، عمر فەرموی: ئەگەر باست بکردایە زۆرم پێ خۆش بوو[1].لە کۆنەوە گوتوویانە: هەموو باوکێك حەز دەکەن کوڕەکەیان لە خۆیان بەڕیز و گەورەتر بێ.

## ٤٨٤- وەڵامدانەوەی خوا

لە یەکێك لە کوڕی زیکردا، یەکێك لە ئامادەبووان گوتی: من دەزانم کەی خوای گەورە یادم دەکات !! کاتێ ئەوەی گوت لەسەر هاوەڵانی وەك بریسکەیەك وابوو، چۆن دەبێ خواپەرستێك بانگەشەی شتی وا بکات بۆ خۆی؟ بۆیە زۆر بە سەرسووڕمانەوە لێیان پرسی؟ گوتی: هەرکاتێ من یادی خوام کرد ئەویش یادم دەکات پاشان فەرموی: (فاذكروني اذكركم) واتە: ئێوە یادم بکەن منیش یادتان دەکەم، سەرسوڕمانەکەیان نەما کە زانیان ئەو ڕاست دەکات، پاشان خواپەرستەکە قسەیەکی نوێ کرد ودیسان قسەی پێ بڕین، گوتی: من دەزانم کەی خوای گەورە وەڵامم دەداتەوە ! گوتیان دەزانی کەی خوای گەورە وەڵامت دەداتەوە؟ گوتی: بەڵێ، گوتیان: چۆن دەزانی؟ گوتی: کاتێك دڵە خورپەم بێت، دڵم بترسێت، پێستم گرژبێت و چاو فرمێسك بڕێژێ ودەست بکەم بە دوعای وپاڕانەوە دەرگای دوعام بۆ بکرێتەوە پاشان دەزانم کە خوای گەورە وەڵامم دەداتەوە، هاوەڵان زانیان ئەو جارەش ڕاست دەکات[2].

---

( ١) رواه البخاري

(٢) چیرۆکی ئادابە ئیسلامیەکان لاپەڕە (٣٣٠-٣٣١)






## ٤٨٥- نوستن لەم رچاوی خەڵك

یەکێك لە ئەمیرەکان کچی پاشایەکی خواست، کە زۆر جوان و درەوشت بەرز بوو، ڕۆژێك ئەمیر لەگەڵ هاوسەرەکەی دانیشتبوو گاڵتە و یاری لەگەڵ دەکرد تاکو خەو تینی بۆ هێنا ونووست، هاوسەرەکەش بە خەوتووی جێی هێشت ورۆیشت بۆ دەرەوە بەڵام زۆر بەلەسەرخۆیی نەوەك ئەمیر بەخەبەر بێت لەو خەوە، ئەمیرەکە بەخەبەر هات دەبینی هاوسەرەکەی لەلای نەماوە، زۆر بەتوندی تووڕەبوو بانگی کرد و ئەویش هات، پرسیاری لێ کرد بۆچی بەخەوتووی منت بەجێ هێشت و ڕۆیشتیت؟

پێی گوت: ئەوەی باوکم فێری کردووم ئەوەیە، کە لەگەڵ نووستوودا دانەنیشم وەلە شوێنێکدا نەخەوم کە خەڵك دانیشتوون، ئای لەو ئامۆژگاری یە زێڕینە کە بەڕاستی لەگەڵ دەقی وەسیەتی پێغەمبەرە (ﷺ) کە جابر دەفەرموی: پێغەمبەر نەهی کردووە کە مرۆڤ لەسەر بانێك بخەوێت کە پەرژین وشورەی نەبێ[١].

(١) البخاری ریوایەتی کردووە — چیرۆکی ئادابەئیسلامیەکان لاپەرە(٥٤١)



## ٤٨٦- منداڵێکی ڕەوان بێژ

لەسەردەمی خەلافەتی پێشەوا عمری کوڕی عبدالعزیز شاند(وفد)ی هەموو شارێك دەهاتن بۆ لای خەلیفە، جارێکیان شاندی دانیشتوانی وڵاتی حیجازهاتن منداڵێکیان ئامادە وپێشکەش کرد بۆ قسەکردن لەبەرامبەر خەلیفە، ئیمامی عمر فەرمووی: ئەی منداڵ باڵە تۆ بە تەمەنتر و گەورەتر قسە بکات، منداڵەکە گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران مرۆڤ بە دوو شتە بچوکەکەیەوە دەناسرێت واتە: بە دڵی و بەزمانی، کاتێ خوا زمانی پاراوو دڵێکی پارێزراوی پێدا کە شتی لە بیر نەچووە وە، بەراستی ئەوە شایەنی قسە کردنە، ئەگەر کاروبارەکان بە پێی تەمەن دابەش بکرانایە ئەوا لە تۆ بەتەمەن ترو گەورەتر هەبوو کە لە تۆ شایان ترە بۆ پۆستی خەلافەت، عمر فەرموی: ڕاست دەکەیت خوا ڕەحمت پێ بکات، منداڵەکە گوتی ئەی امیری ئیمانداران ئێمە نوێنەرین هاتووین بەمەبەستی پیرۆزبایی نەك بۆ ئێش و کاری تایبەتیمان، هەرکەس لە ئێمە بە ئارەزووی خۆی هاتووە، نەك بە زۆری ولە ترسان !! چونکە لەوەتەی ئێمە بووین و لە ڕۆژگاری تۆدا نەترساوین، ئەوەی داوامان کرد بێ بەدەستمان گەیشتووە، عمر زۆر سەری سوڕما لە قسەی ئەو منداڵە پرسیاری کرد تەمەنی ئەو منداڵە چەندە؟ گوتیان: ١٠ ساڵانە، عمر فەرموی ئەو منداڵە لە سەرەوەی پلەی خۆی داینێن وپلەی بەرزتر بکەن چونکە بەندە ئەگەر کەسێکی ئاسایی بێت بێگومان ئەوها پلەی بەرز دەبێتەوە وە بە هۆی جوانی و ڕێکی قسەکانی یەوە[١].

---

( ١) چیرۆکی ئادابە ئیسلامیەکان لاپەڕە (٤٢٧)



## ٤٨٧- زەردەخەنە

هاوەڵی ڕێزدار (ابو الدرداء) ڕەزای خوای لێ بێت، هەرکاتێ قسەی بۆ خەڵك دەکرد ویان قسەی لەگەڵ دەکردن بە پێکەنین و زەردەخەنەیەوە قسەی دەکرد ڕۆژێکیان دایکی پێی گوت: ڕۆڵەکەم خۆت والێمەکە کە خەڵك بڵێن پیاوێکی گەوژەو نەزانە بەهۆی زەردەخەنەتەوە لە قسەکردن بە دایکی گوت (هیچ کاتێ: پێغەمبەری خوام نەبینیوە کە قسە بکات بۆ خەلك ئیللا بە پێکەنین و زەردەخەنەیی نەبێ) رواه الامام احمد.

بەوشێوە زەردەخەنەی دەکرد لەقسەکردنیدا چونکە شوێن سونەتی پێغەمبەر دەکەوت، خۆی دەڕازاندەوە بە ئاکارە جوانەکانی، زەردەخەنە خستنە ناو دەم و چاوی کەسانی تر خێرو چاکەیە، با موسڵمان قسە لەگەڵ کەسی تر نەکات بە ڕووێکی گرژو داخراوەوە، بەڵکو بە ڕووێکی کراوەو پڕبێ لە زەردەخەنە کە موژدە و ئومێد دەکات بە بەریدا، زەردەخەنە لەقسەکردندا بواری پەیوەندی دەڕەخسێنێ وسەردەکەوێت بەسەر هەموو تووڕەبوونێکدا هەروەها لە خۆبەگەورە زانین ڕزگاری دەکات[1].

---

( ١) بەدەستکاریەوە لە چیرۆکی ئادابە ئیسلامیەکان لاپەڕە (٤٢٤)



## ٤٨٨- خواتۆبەت لێ وەرگرێ

ابو سعيد دەڵێ: یەکێ لە پیاوەچاکان گێڕاویەتیەوە دەڵێ: ابو الحارث ی ئەولاسی پێی گوتم: دەزانی سەرەتای تۆبەکردنم چۆن بوو؟ گوتم: نەخێر، گوتی: من لاوێکی جوان و ڕێك وپێك بووم، لەو کاتەی کە بێ ئاگابووم لە خوا پیاوێکی نەخۆشم بینی لەسەر ڕێگایەك کەوتبوو، لێی نزیك بوومەوە وپێم گوت: حەزت لە چییە؟ گوتی: هەنار، چووم هەنارم بۆی هێنا، کاتێ هەنارەکەم لە پێشی دانا سەری بەرزکردەوە بۆلام، گوتی: خوا تۆبەت لێ وەرگرێ، دەڵێ نەبووە ئێوارە یەکسەر دڵم گۆڕا لە هەموو ئەوشتانەی کە لەسەری بووم لە گوناهو تاوان و ڕابواردن، وەزۆریش ترسی مردن هاتە دڵم و پێ پابەند بووم، وازم هێنا لە هەمو شتێ:، ویستم بڕۆم بۆ حەج دەستم کرد بە ڕۆیشتن لەشەودا، لە ڕۆژیش لە ترسی فیتنە و ئاژاوە خۆم دەشاردەوە لە خەڵك، لە ڕێگا دەڕۆیشتم لە ناکاو بەلای کەسانێك تێپەڕیم کە عەرەقیان دەخواردەوە، کاتێ منیان بینی تەریق بوونەوە منیان لەلای خۆیان دانیشاند و خواردن و خواردنەوەیان بۆ هێنام گوتم: پێویستم بە قەزای حاجەتە، منداڵێکیان نارد لەگەڵم تاکو شوێنم پێ نیشان بدات، کاتێ لێیان بەدوور کەوتمەوە بە منداڵەکەم گوت: تۆ بڕۆ بۆ لای ئەوان من شەرم دەکەم لە تۆ، ئەویش ڕۆیشت لەوکاتەدا کەوتمە ناو دارستانێك دەبینم دڕندەیەکی لێیە، گوتم: ئەی خوایە خۆت دەزانی من وازم لە چی هێناوە و بۆچ دەڕۆم، شەڕو خراپەی ئەو دڕەندەیەم لەسەر لابدە، دەڵێ: یەکسەر دوڕندەکە ڕۆیشت منیش گەڕامەوە لەلای ئەوان ڕۆیشتم و ڕێگای (مەکە)م گرتە بەر بەو کەسانە گەیشتم کە سوودیان لێ وەربگرم لە زانایان پیاو ساڵحان[1].

---

( ١) الف قصة وقصة، هاني الحاج بەرگی (١) لاپەڕە(٥١٤)

## ٤٨٩- جوانی بێ دەنگی

پیاوێکی داناو حەکیم هەبوو کاتی ویستبای قسە بکات لە کۆڕێك ئیزنی وەردەگرت – هەمیشە سەر بە خۆ دەستی بە قسە کردن نەدەکرد و زیاتر گوێ دەگرت لە خەڵك، دەیگوت: ئەگەر لەگەڵ پیاوی نەزان ونەفام دانیشتیت بێ دەنگ بە، وەئەگەر لە گەڵ پیاوی زاناو شارەزا دانیشتیت هەر بێ دەنگ بە وگوێیان بۆ بگرە، چونکە بێ دەنگیت لە کۆڕی نەزانان نەرم ونیانیت زیاد دەکات، وەبێ دەنگیت لە کۆڕی زانایان زانست و زانیاریت زیاد دەکات[1].

## ٤٩٠- لە خزمەت (ابو الدرداء)دا

راشدی کوڕی سعد دەڵێ: ابو الدرداء دەیگوت: هیچ دیاریەکم پێ نەبەخشراوە خۆشەویستر بێ لەوەی کە سەلام لە خەڵکی بکەم یان سەلامم لێ بکرێت، وەهیچ هەواڵێکم پێ نەدراوە سەرسام تربێ لە هەواڵی مردن.

– هەروەها دەفەرمووێ: گومان ودوودڵی لە کوفرەوەیە، گریە و زاری کردن لەسەر موسیبەت و نەهامەتی کرداری نەفامی یە، هۆنینەوەی شیعریش مۆسیقاو ئاوازی شەیتانە، غەل و غەش پشکوێ گەرمی ئاگری دۆزەخە، عەرەق تەواوی هەموو تاوانەکان، گەنجی بەشێکە لە شێتی، ئافرەتیش چەکی شەیتانە، خۆبەگەورە زانین خراپترە لە شەڕوخراپە، خرابترین خواردنەکان خواردنی ماڵی هەتیوە، خرابترین کاروکاسبی پەیداکردنی ماڵە

(١) الف قصة وقصة هاني الحاج بەرگی (١) لاپەڕە (٣٤٨)




به مامەڵەی ڕیبا، خۆشبەخت و بەختەوەر کەسێکە کە ئامۆژگاری لە غەیری خۆی دەگرێ، لاییدە و خراپەکاریش کەسێکە کە لە ناو زگی دایکیدا پیاوێکی خراپ و لاییدەبێ

– ڕۆژێك ابو الدرداو بە ئافرەتێکی زمان پاراوو زۆر بڵێی گوت: ئەگەر لاڵ و بێ زمان بوایت بۆ تۆ باشتربوو[1].

## ٤٩١- گەورەیی قورئان خوێندن

ئیمامی یافعی دەفەرمووێ: ئیمامی احمدی کوڕی حنبل فەرمویەتی: خوای گەورەم لە خەودا بینی، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە، دەڵێ: نەوەد و نۆ جاران خوای گەورەم لە خەودابینوە بۆ جاری سەدەم پرسیارم لێ کرد گوتم: ئەی خوایە بە چی نزیکەکان لێت نزیك دەبنەوە؟ فەرمووی: بە خوێندنەوەی کەلامی من – قورئان – گوتم لەماناکەی تێبگات یان تێ نەگات؟

فەرموی: بەتێگەیشتن و بەبێ تێنەگەیشتن[2].

(١) الزهد، الامام احمد بن حنبل الشيباني لاپەڕە (١٧٠)

(٢) ارشاد العباد الى السبيل الرشاد لاپەڕە (٦٧)






## ٤٩٢- وشترە ونبووەکە

پیاوێکی دەشتەکی وشترێکی سووری کرێبوو ڕێژێکیان لێی ون دەبێ، هەتا تاریکایی شەودا دێت و بەدرێژایی شەویش بەدوایدا دەگەڕێ بەڵام هەرنایدۆزێتەوە.

لە کاتی نوێژی بەیانیدا پیاوەکە دەچێتە مزگەوت، دوای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی بەیانی بە موسڵمان دەکات و پیاوەکەش هەڵدەستێ وپرسیار لە خەڵکی دەکات سەبارەت بە وشترەکەی، بەدەنگێکی بەرز هاوار دەکات ودەڵێ: هەرکەسێ وشترێکی سووری لەوشێوەیە دۆزیەوە کە لێم ون بووە با ئاگادارم بکاتەوە:

پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ ئەمەی بیست زۆر تووڕە بوو پێی گوت: (لا وجدت انما بنيت المساجد لما بنيت له)[1].

واتە: دەك نەیدۆزیەوە، مزگەوت بۆ ئەوە دروست کراوە کە بۆی دروست کراوە، واتە بۆ خواپەرستی نەك بۆ نانگەوازی کردنی بۆ شتی ون بوو.

پاشان پێغەمبەر (ﷺ)بۆ هاوەڵانی ڕوون کردەوە لە بارەی پرسیارکردن و بانگەوازی کردن بۆ شتی ون بوو لەناو مزگەوتدا فەرموی: (من سمع رجلا ينشد (يسأل عن) ضالته في المسجد فليقل: لا ردها الله عليك فان المساجد لم

---

( ١) رواه مسلم






تبن لهذا )[1].

واتە: هەرکەسێك گوێ لێ بوو کە پیاوێك بانگەوازی بۆ شتی ون بوو دەکات، بلێت خوا بۆت نەگێڕێتەوە چونکە مزگەوتەکان بۆ ئەوە دروست نەکراون

– هەروەها کڕین و فرۆشتنیش بەهەمان شێوە، دروست نییە ئەنجام بدرێن لە مزگەوتدا.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:

(اذا رايتم من يبيع او يبتاع (يشتري) في المسجد فقولوا: لا اربح الله تجارتك)[2].

واتە: ئەگەر کەسێکتان بینی لە ناو مزگەوتدا کڕین و فرۆشتنی دەکرد ئەوا پێی بلێن: یاخوا ئەو کڕین و فرۆشتنەت هیچ خێرو قازانج نەکات.

## ٤٩٣- کۆمەڵێك بەرەو بەهەشت وکۆمەڵێکیش بەرەو دۆزەخ

ئیمامی عمری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کاتی بیری مردنی دەکردەوە وەك چۆن باڵندە ڕایدەکرد و باڵەکانی لێك جیا دەبوەوە ئەویش ئەوها ترسی لە دڵدا زیاد دەبو ڕادەپەڕی و دەگریا تاکو

---

( ١) رواه مسلم

( ٢) رواه الترمذي



فرمێسکەکانی ڕیشی تەڕدەکردن، شەوێکیان زۆر گریا و دانیشتوانی ماڵەکەی هەموی بەگریان خستن، کاتێ خانەوادەکەی پەندو ئامۆژگارییان وەرگرت لەو گریانە (فاطمة)ی خێزانی پرسی ئەی امیر المؤمنین بە باوکم بە قوربانت بم بۆ چی دەگری؟ فەرموی: بیری ئەوەم کردەوە کاتێ خەڵکی لێك جیادەبنەوە بەرامبەر بە خوای گەورە دەبن بە دوو کۆمەڵ، کۆمەڵێك بەرەو بەهەشت کۆمەڵێکیش بەرەو دۆزەخ ئینجا کە ئەوەی بە خێزانەکەی گوت هاوارێکی کردو لە هۆش خۆی چوو[1].

## ٤٩٤- بۆ چی نەگریم..؟

سفیان الثوري (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێ:

ڕۆژێکیاتن کوڕی زیکرو ئامۆژگاریم بەستابوو، سعیدی کوڕی سائیب ی طائفی لەوێ بوو، زۆر دەگریا تاکو بەزەییم پێی هاتەوە، گوتم: ئەی سعید بۆ چی ئەوەندە دەگری؟ کە چی گوێت لە منە باسی پیاوانی چاك و ئەهلی خێر دەکەم بۆتان؟!

گوتی: ئەی سفیان چۆن نەگریم و بۆچی گریانم لێ قەدەغە دەکەیت کاتێ باسی پیاوانی چاك وپلەکانیان دەکەیت کە چی من لە ئەوان دابڕاوم ودوورم لەوان! سفیان گوتی: بەڕاستی حەقی خۆیەتی کەوا بگری[2].

---

(١) تعال نبك لنطفئ بحارا من نار، عبدالرحمن السنجري، لاپەڕە(٢٧)

( ٢) تعال نبك لنطفئ بحارا من نار، عبدالرحمن السنجري، لاپەڕە (٤٠)




## ٤٩٥- بیرکردنەوە لە مردن دڵەکان ڕووناك دەکاتەوە

دەگێڕنەوە کە جارێکیان ئەسکەندەی (ذو القرنین) بەلای گوندێك تێپەڕی کە دانیشتووانی هیچ شتێکیان نەبوو لە پێداویستیەکانییاندا، وەگوڕی مردوەکانیان لەبەردەم ماڵەکانیان هەڵدەکەندبوون، هەموو ڕۆژێك دەچوونە لای گوڕەکان پاکیان دەکردنەوە، وەخواپەرستیان ئەنجام دەدا کە هیچ خواردنێکیشیان لەلانەبوو جگە لە پووش و بەڵاش و گیای سەرزەوی نەبێ، ذوالقرنین ناردی بە شوێن پیاوێکیان ئەویش بانگی پاشایەکەیان کرد بەڵام پاشا وەڵامی ذوالقرنین ی نەدایەوە وگوتی: من و ئەو لێك دوورین، ذو القرنین چووە لایان وپێانی گوتی: حاڵتان چۆنە؟ من دەبینم کە هیچ شتێکتان نییە نەپارە.. نەزێڕ.. نە زیو وەهیچ خۆشی و نیعمەتی دنیاتان لەلانییە.

پاشا گوتی: نازو نیعمەتی دنیا کەس تێری لێ نەخواردووە ژو القرنین گوتی: ئەی بۆ گوڕتان لەبەردەم ماڵەکانتان هەڵکەندوون؟ پاشا گوتی: بۆ ئەوەی لە پێش چاوانمان بێت، کە سەیری دەکەین بیری مردن لەدڵمان نوێ بکرێتەوە و خۆشەویستی دنیاش لە دڵەکانمان سارد بێتەوە ئەو کاتە سەرقاڵمان ناکات لە خواپەرستی ذو القرنین گوتی: بۆچی خواردنتان بەس پووش وگیایە؟ پاشا گوتی: لەبەرئەوەی پێمان ناخۆشە زگمان بێتە گۆڕی ئاژەڵان، چونکە چێژی خواردن لە گەردەن تێناپەڕێ ئینجا پاشا دەستی درێژ کرد بۆدەلاقەیەك و کەللەسەرێکی مرۆڤی هێنایە دەر لەبەردەم ذو القرنین ی دانا، پێ گوت: دەزانی ئەمە سەرکی کێیە؟

ئەمە سەرکی پاشایە کە، لە پاشاکانی دنیا، کەستەمی کردووە لە






خەڵکەکەی دەوروبەری وەکاتی خۆی هەموی لە کۆکردنەوەی دنیادا خەرج کردووە لەناکاو خوا گیانی لیّ وەرگرتۆتەوە و ئاگری دۆزەخی کردووە بە شوێنی ئەو، ئەمەش سەرکی ئەوە.

پاشان دەستی درێژ کرد بۆ دەلاقەیکی تر کەللەسەرێکی تری هێنایە دەرو لەبەردەم ذوالقرنین ی دانا وگوتی: دەزانی خاوەنی ئەو سەرەکێیە؟

خاوەنی ئەو سەرە یەکێکە لە پاشا دادپەروەرو بەڕەحم و بەزەییەکان بەرامبەر بە خەڵکەکەی، زۆر خۆشەویست بوو لەوڵاتەکەی لەناکاو خوا گیانی لیّ وەرگرتەوە و بەرەو بەهەشتی برد وپلەی بەرزکردەوە.

لە پاشان دەستی خستە سەر سەری ذو القرنین وگوتی: بینیت ئەو دوو سەرە چۆن بوون ئەو سەرەش هەروا دەبیّ، واتە: دادپەروەر دەبیّ یان ستەمکار دەبیّ – ذوالقرنین کە ئەمەی بینی دەستی کردە گریان زۆر بە توندی گریا دەستی لە ملی پاشا کرد و لە سینگی خۆیەوە ناو گوتی: ئەگەر ئارەزووت هەیە لە هاورێتی من ئەو گەورێتی و وەزارەتی خۆمت پیّ دەدەم و هەموو دەسەلاتەکەمت لەگەڵ دەکەمەنیوە، پاشا گوتی: زۆر دووووورە.. حەزم لەوەنییە، ذو القرنین گوتی: بۆچی؟

پاشا گوتی: لەبەر ئەوە خەڵکی هەمووی ڕقیان لێتە بەهۆی ماڵ و دەسەڵاتت، بەڵام هەموویان دۆستی منن بەهۆی قەناعەت و فەقیری و هەژاری[1].

---

(١) تعال نبك لنطفئ بحارا من نار، عبدالرحمن السنجري، لاپەڕە(٦٨)






## ٤٩٦- دەرمانی تاوان

یەکێك لە پیاوچاکەکان دەڵێ: کاتێ پرسیاری لێ کرا سەبارەت بە تۆبەکردنی لە گوناهو تاوان، ئەویش گوتی: ڕۆژێکیان بیرم لە تاوانەکانم کردەوە، وەبیرم لە کەمترغەمی و دوا ڕۆژی خۆم کردەوە، بینیم واتەمەنم بەرەو کەمی دەڕوات وتاوانیشم هەر زیاد دەبن و دواڕۆژیش لێم نزیك دەبێـەوە، وەهەرگیز نەفسم تۆبە وەرناگرێ، بۆیە دەبینم تووشی بەڵایەك هاتووم کە شاخەکانیش بۆیان هەڵناگیرێ، لەماڵ دەروچوم بیرم لە حاڵە خراپەکەم دەکردەوە، بەلای دکتۆرێك تێپەریم کە خەڵکێکی زۆر دەوریان دابوو لێی، هەریەکە باسی نەخۆشی و داوای دەرمانی نەخۆشیەکانی خۆی دەکرد، منیش پێم گوت: گەورەم، دەرمانی گوناهوتاوانیش لەلات دەست دەکەوێ؟ کەمێك سەری داخست وبێ دەنگ بوو، پاشان گوتی: ئەگەر تاونبار بیزانیبایە تاوان وبێ فەرمانی کێ دەکات دەبوایە پێش تاوانەکەی بتوابایەوە. الله أكبر ما أجمل هذا الكلام....؟

منیش یەکسەر گەڕامەوەماڵەوە کە بەڕاستی قسەی ئەو دکتۆرە یەکجار زۆر کاری تێکردم، بۆیە پابەندی دەرگای خوابووم تاکو ئێستا[1].

---

(١) الف قصة وقصة، هاني الحاج بەرگی (١) لاپەڕە (٢٨٦)






## ٤٩٧- کەم وتن

یەکێك لە زانایان کەم خۆربوو جل وبەرگی زبری لەبەردەکرد دنیانەویست بوو، گرنگی بە دنیا نەدەدا تەنها بە دوای زانست و بەختەوەی دەگەڕا بۆ خەڵکی پیاوێك نوسراوێکی بۆی نوسی: تۆ دەڵێی بەزەیی واجبە بەهەموو خاوەن گیانێك، دەی تۆش خاوەن گیان و ڕۆحی بۆ چی بەزەییت نایەتەوە بە گیانی خۆت بەکەم خواردن وجل بەرگی زبر؟! زاناکەش وەڵامی دایەوە وگوتی: سەرزەنشتم دەکەیت لەسەر پۆشینی جل و بەرگی زبرو کەم خواردنم؟ من دەمەوێت بخۆم بۆ ئەوەی بژیم نەك بژیم تاکو هەر بخۆم و خۆم بەخواردن سەرقاڵ بکەم.

پیاوەکەی بۆی نوسی وگوتی: زانیم هۆی کەم خواردنت چی بوو، بەڵام هۆی کەم قسەکردنت چییە؟ ئەی بۆ ڕەزیلی دەکەی بەرامبەر بە خەڵکی بەکەم قسەکردن؟ زاناکە بۆی نوسی گوتی: خوای گەورە دوو گوێ و زمانێکی بۆت دروست کردووە بۆ ئەوەی بیستنەکەت دوو قاتی قسەکردنەکەت بێ نەك بەپێچەوانە قسەکردنت زیاتر بێ لە گوێ گرتنت[1].

(١) چیرۆکی ئادابە ئیسلامیەکان، لاپەڕە (٤٣)






## ٤٩٨- بەزەیی پێغەمبەر (ﷺ) بەهاوەڵەکەی

یەکێك لە موسڵمانان زۆر بە سەختی نەخۆش کەوت لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) نەخۆشیەکەی واتینی بۆ هێنا بوو یەکجار لاواز بێ هێزببو وەکو بێچوێکی بچوکی لێ هاتبو لەبەر نەخۆشیەکەی، کاتێ پێغەمبەر بەمەی زانی خۆی وچەند هاوەلێك (رضي الله عنهم) سەردانیان کرد کاتێ پێغەمبەر چاوی پێ کەوت دڵی بۆی سووتاو بەزەیی پێ هاتەوە پێ گوت: ئایا هیچ دوعایەکت نەکردووە بۆخۆت وداوات نەکردووە گوتی: بەڵێ ئەو دوعایەم کرد گوتم: ئەی خوایە سزای قیامەتم بۆ پێش بخە لە دنیادا تۆڵەم لێ وەرگرەوە، پێغەمبەر (ﷺ)زۆر پێی ناخۆش بوو کە بەو جۆرە دوعای کرد فەرمووی: سبحان الله ئەوە لە توانای تۆدا نییە، واتە: کەس لە ئێوە داوا نەکات کە خوای گەورە سزای بۆ پێش بخات ولە دنیادا تۆڵەی لێ وەرگرێتەوە، چونکە هەرگیز بەرگەی ناگرن ئەگەر سزا بێت.

ئەی بۆ چی ئەو دوعایەت نەکرد وبڵێ: (اللهم اتنا في الدنيا حسنة وفي الاخرة حسنة وقنا عذاب النار)[1].

واتە: ئەی خوایە خێروچاکە و پاداشتی دنیا و قیامەتمان پێ ببەخسە و لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارمان بکە.

پاشان پێغەمبەر (ﷺ)ڕەحمەت و سۆزی جۆڵاو لە خوا پارایەوە کە شیفای بدات، خوای گەورەش شیفای بۆ هێنا و لەو نەخۆشیە چاك بوەوە.

---

(١) رواه المسلم






## ٤٩٩- دیاری

ڕۆژێك دووپیاو لە شامەوە هاتن بۆ مدینە پرسیاریان دەربارەی هاوەڵی ڕێزدار (سلمان الفارسی) دەکرد، کاتێ پێی گەیشتن گوتیان: لەلای براکەتەوە لە شامەوە هاتووین بۆ لات، فەرموی: ئەی کوا ئەو دیاری کە بە ئێوەی داوە بۆ من؟ گوتیان: دیاری بە ئیمە نەناردووە.

سلمان گوتی: لەخوا بترسن ئەمانەت بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکەی گوتیان: هیچی بە ئێمە نەناردووە، تەنها ئەوە نەبێ کەپێی گوتین پیاوێك لە نێوتان دایە، ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ)بە تەنیا بوایە لەگەڵیدا هەواڵی کەسی تری داوا نەدەکرد، ئەگەر چوونە لای سەلامی منی پێبگەیەنن، سلمان بەدوو پیاوەکەی گوت: ئەوە دیاری یەکەیەتی چ دیارییێك لەوە گەورەترە؟ سلاوێکی پیرۆزو بەرەکەت و پاك لەلایەن خوای گەورە[1]. تحية مباركة طيبة من عند الله.

## ٥٠٠- لە ترسی وەستان بەرامبەر بەخوا مرد

یزیدی الرقاشی دەڵێ :

چوومە لای خواپەرستێك لە شاری البصره – بینیم خانەوادەکەی هەمووی بە دەوری دا کۆبوونەتەوە، ئەویش لەسەرگیان دەروچون بوو خریك بوو دەمرد، باوکی سەیری دەکردو دەگریا، بە باوکی دەگوت: ئەی باوکە

---

(١) رواه الطبراني






پیرەکەم بۆ چی دەگری؟

باوکی دەیگوت: بۆ لە دەست دانی تۆ و ماندووبوونت

دەڵێ: دایکیشی لەولاوە دەگریا، گوتی: دایکی بەزەیی و خۆشەویستم بۆ چی دەگری؟

دایکی گوتی: ڕۆڵەکەم! بۆ دابڕان لە تۆ دەگریم، وەبۆ تەنهایی بەبێ تۆ دەگریم.

ئینجا خێزان ومنداڵەکانیشی دەگریان، سەیری کردن وپێی گوتن: ئەی ئەوانەی کە دوای کەمێکی تر هەتیو دەبن بۆ چی دەگرین؟ گوتیان ئەی باوکە ! لەبەر دابڕانمان لە تۆ و بەپەلە هەتیوبونمان دەگرین.

گوتی: هەڵمستێننەوە با دانیشم، ئاگاداربن ئایا دەزانن ئێوە هەموتان بۆ دنیا وژیانی دنیام دەگرین، کێ هەیە لە ئێوە بۆ قیامەتم بگری؟

کێ هەیە بۆ ئەوە بگری کاتێ خۆڵ لەگەڵ دەم چاوو ڕوخسارم تێکەڵ دەبێ؟ کێ هەیە لە ئێوە بۆ پرسیاری فریشتەی گۆڕ (نکیرومنکر)م بگری؟

کێ هەیە لە ئێوە بۆ ڕاوەستانم لەبەرامبەر بەخوا بگری؟

پاشان کە ئەو قسەو گفتوگۆیەی تەواو کرد هاوارێکی کرد و گیانی دەرچوو (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)[1].

---

(١) مسك الختام، محمود المصري، لاپەڕە (٢٩٩)






# ٥٠١-جگە لە ئەمڕۆ چیتر خزمەتم ناکەن

یەکێك لە پیاوە ساڵح و خواناسەکان علی کوڕی اسماعیل ی (عثمانی) کە لە نەوەکانی پێشەوا (عثمان)ی کوڕی عفانە (رضي الله عنهم) کاتێ مانگی شەعبانی ساڵی (٥٥٩) کۆچی هات، بە قوتابیەکانی خۆی گوت: من لەو ڕەمەزانە پیرۆزەی داهاتوو بە ڕۆژوو نابم لەگەڵ خەڵکی، کە چی هیچ نەخۆشی وئازاری لاشەی نەبوو لەو ڕۆژەدا کەئەو های گوت، تەنها سێ دانە ڕۆژیش مابوو لە مانگی شەعباندا، بۆیە لە ئاخیری ڕۆژی مانگی شەعبان کۆچی دوایی کرد.

ئینجا دەڵێن: لەو ڕۆژەی کە تێدا وەفاتی کرد، هەستا خۆی پاك و پۆخت شورد و دەسنوێژێکی پاکی هەڵگرت وبۆنێکی خۆشی لە خۆیدا، وەبەخزمەتکارەکانی خۆی گوت: جگە لە ئەمڕۆ چیتر خزمەتم ناکەن، پاشان چووە ژوورەکەی دوو ڕەکعات نوێژی کردو لەسەر جێگاکەی نوست، کاتێ بانگی نوێژی نیوەڕۆ نزیك بوو بانگیان کرد بۆ نوێژ، دەبینن کەوا کۆچی دوایی کردووە، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) [1].

ئەگەر دەتەوێ لەسەر خواپەرستی بمریت ئەوا هەمیشە لەسەر خواپەرستی ژیان بەسەر ببە، چونکە کەسێ لەسەر خواپەرستی بژیت لەسەریشی دەمرێ و هەروەها زیندو دەبێتەوە.....

---

(١) مسك الختام، محمود المصري، لاپەڕە(٣٠٠)






## ٥٠٢- لێپرسینەوە

حسن ی البصری ڕەحمەتی خوای لێ بێت، دەفەرموێ :

پیاوی بروادار بە هێزو بەدەسەڵاتە لەسەر خۆی، لێپرسینەوە لەگەڵ خۆی دەکات بۆ خوای گەورە، بێگومان ئەو لێپرسینەوەیە لە ڕۆژی دوایی دا ئاسان دەبێ لەسەر کەسیانێك کە لە ژیانی دنیادا لێپرسینەوە یان لەگەڵ نەفسیان کردووە، بەڵام بە ئازارو نارەحەتەو مرۆڤ لەناوەبات وماندووی دەکات بۆ کەسانێك کە لە ژیانی دنیادا هیچ لێپرسینەوەیەکیان لەگەڵ خۆیان نەکردووە[1].

## ٥٠٣- ناخەوێ وناهێلێ کەسیش بخەوێ

دەڵێن پیاوێك کۆیلەیەکی لاوی ڕەشی کڕی بە چوار دینار، بەڵام شەو نەدەخەوت و نەیدەهێلا گەورەکەشی بخەوێ، ڕۆژێکیان گەورەکەی پێی گوت: کاتێ دەبێتە شەو بۆچی ناخەویت و ناشهێڵی ئێمە بخەوین؟ گوتی: گەورەم کاتێ شەو دادێت بیری تاریکی و ناخۆشی گۆڕ دەکەم، وەبیری تاریکی وگەرمی ئاگری دۆزەخ دەکەم بۆیە بەتەواوی خەوم وەك باڵندە دەفڕێ.

هەرکاتێ بیری ڕاوەستان لەبەر دەستی خوا دەکەم لە ڕۆژی قیامەت

---

( ١) تعال نبك لنطفئ بحارا من نار، عبدالرحمن السنجری، لاپەڕە (٤٨)






غەمباری دڵم زۆر گەورە و زیاد دەبیّ، وەهەرکاتیّ بیری بەهەشت و خۆشیەکانی دەکەم تامەزرۆی بەهەشتم زیاد دەبیّ لە ئەندازەی خۆی، گەورەم چۆن بخەوم حاڵم ئەوهابیّ؟!

کاتیّ گەورەکەی ئەمەی لیّ بیست دەست بە جیّ لە هۆش خۆی چوو، کاتیّ بە خۆی هاتەوە ڕوی کردە کۆیلەکەی وپیّ گوت: ئەی لاو کەسێکی وەك من بۆی نییە کەسێکی وەك تۆ بکات بە موڵکی خۆی تۆ لە بەرخاتری خوا ئازادیت[1].

## ٥٠٤- لێبوردن وگەڕاندنەوەی مافی پەشیمان بوو

دەگێڕنەوە لە یەکێك لە بازرگانە چاکەکان: ڕۆژێکیان هەندیّ هەنگوینی بەسی هەزار (٣٠٠٠٠) درهەم کڕی،بۆ بەیانی نرخەکەی زۆر هەستاو گرانتر بوو بە دووقاتی خۆی، فرۆشتیار پەشیمان بوەوە کە ئەوەی بیست، وەزۆر بۆ هەنگوینەکەی دڵ تەنگ بوو، هەندیّ لە هاوەڵانی پێیان گوت: بڕۆین بچین هەنگوینەکەت بۆ بگێڕینەوە تاکو ئەو قازانجەت لەدەست نەچیّ؟ گوتی: ئەریّ والله دەمەوێتەوە، پێی گوت: بەیانی زوو هەستەو بڕۆ نوێژی بەیانی بکە لەگەڵ ئیمام کاتیّ سەلامی نوێژی دایەوە بڕۆ لای سەلامی لیّ بکەو پێی بڵیّ من لە فرۆشتنی هەنگوینەکەی دوێنی پەشیمان بوومەوە کە بە تۆم

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٤٩)






فرۆشت هیچی تری پێ مەڵێ، گوتی: بەڵی پاشان چوو نوێژی کرد ئەویشی لە مزگەوت بینی وپێی گوت: من لە مامەلەکەی دوێنی پەشیمان بوویمەوە کە هەنگوینم پێ فرۆشتی، پیاوە بازرگانەکە لەبەر ئەوەی ڕاستگۆوو پیاوێکی چاك بوو بە خزمەتکارەکەی خۆی گوت: هەستە بڕۆ هەنگوێنەکەی بۆبەرەوە، هەندێ لەوانە کە لەوێ بوون گوتیان: چۆن شتی وا دەبێ ئێستا نرخەکەی بۆتە دووقات ئایا بۆی دەگەڕێنیتەوە؟ گوتی: بەڵێ برۆ لەلام، من لە پێغەمبەرم بیستووە کە فەرموویەتی: هەرکەسێ فرۆشراوەکە بگەڕێنیتەوە بۆ فرۆشیارکە پەشیمان بۆتەوە لەو مامەلەیە خوای گەورە ناخۆشی وخلیسکانی ڕۆی دوایی لەسەر لادەبات، ئایا ئەو لابردن و ناخۆشیەم بۆ ڕۆژی دوایی نەکڕم بەسی هەزار (٣٠٠٠٠) درهەم؟

ئینجا پارەکەی خۆی وەرگرتەوە و هەنگوینەکەشی بۆی ڕەت کردەوە[1].

## ٥٠٥- بەڵێ بەندە بەندە

دەگێڕنەوە کە (بشیر)ی حافی لەسەردەمی خۆی کە سەرقاڵی ڕابواردن وگوناهوتاوان بوو، هەندێ لە هاوەڕێ و دۆستانی لەلابوون عەڕەقیان دەخواردەوە و خۆیان بۆ نخۆش دەکرد، یەکێ لە پیاو وساڵحان لەلایان تێپەری ولە دەرگای ماڵیان دا، ئافرەتێك هات دەرگای کردەوە، پیاوە چاکەکە گوتی: خاوەنی ئەو ماڵە ئازادە یان بەندەیە؟ ئافرەتەکە گوتی:

---

(١) ارشاد العباد الی السبیل الرشاد، لاپەڕە (٦٩)






نەخێر ئازادە، گوتی: ڕاست دەکەیت ئەگەر کوێلە بایە (بەندە) ڕێزی کۆیلایەتی بەرامبەر بەخوا بەکاردەهێنا و وازی لەو ڕابواردن و گۆرانی و خواردنەوە دەهێنا، بشری حافی ئەمەی بیست لە پیاوەکە و ئافرەتە خزمەتکارەکەی بۆیە بە پەلە هاتەدەرەوە دەبینی پیاوە چاکەکە لەوێ نەماوە، بە ئافرەتەکەی گوت: هەواڵی قسەکانی پێ ڕاگەیاند، بشر گوتی: بۆ کوێ چوو؟ گوتی: بۆ ئەو ناوە ڕۆشت – ئاماژەی بۆ شوێنیك کرد – بشر بەدوای کەوت وتاکو دۆزیەوە و پێ گوت: گەورەم تۆ بوویت لە بەردەم دەرگا قسەت لەگەڵ ئەو ئافرەتە کرد؟ گوتی: بەڵێ بشر گوتی: دەمەوێ قسەکان دووبارە بکەیتەوە! ئەویش بۆی دووبارە کردەوە، بشر ڕوومەتی خۆی دانایە سەر زەوی و بۆی بە زەویدا کێشا و گوتی: بەڵێ: بەندە، بەندە، پاشان بەبێ پێڵاوی و لەسەر ڕوخساری ڕۆیشت تاکو ناسرا بە پێخواس، پێیان گوت: بۆچی نەعلێك ناکەیتە پات؟ گوتی: لەبەر ئەوەی لەو کاتەی گەورەم منی پاککردەوە پێخواس بووم، کەواتە دەمەوێ تاکو مردن لەو حاڵەم لانەدەم وهەمیشە شوێنەواری ئەو گۆڕانکاریەم پێوە دیار بێ[1].

---

( ١) الف قصة وقصة هاني الحاج، بەرگی (١) لاپەرە (٥١٥)






## ٥٠٦- تەنها خوا شیفا بەخشە

ڕۆژێك عبدالله ی کوڕی مسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) چووە ماڵەوە بۆ لای خێزانەکەیەوە بینی کەخێزانەکەی دەزوداوێکی هەڵواسیوە بەگەردنیەوە، عبدالله لێی پرسی ئەمە چییە؟

گوتی: ئەوە پەتێکی شیفادەرو پارێزەرە لە خراپەی خەڵکی، عبدالله لە ملی ڕایکێشا و پچراندی !! پاشان گوتی ئەی بەندەی خوا و ئالی عبدالله ئێوە زۆر بێ پێویستن لەوەی کە هاوەڵ بۆ خودا بڕیاربدەن گوێم لە پێغەمبەر بووە دەیفەرموو: (تەمائیم وتەوەلە) (کە دووجۆرن لە سیحر) بەکارهێنانی هاوەڵ دانانە بۆ خوا، خێزانیشی گوتی: بەڵام جوولەکەکان کاتێ دەیکەن چاوی پڕ لە فرمێسکیان ئۆقرە دەگرێ، عبدالله فەرمووی: بەڵام بێ گومان ئەمە کاری جنۆکە و شەیتانە کە دەستیان بۆ پێدا دەهێنێت، بەڵام کاتێ داوای نزای لێ دەکەن وازدەهێنێ، بەڵکو ئەوەندەت بەسە کەوەك پێغەمبەر بڵێ (اللهم رب الناس اذهب البأس واشف انت الشافي، لا شفاء الا شفاءك، شفاء لا يغادر سقما)[1].

واتە: ئەی خوایە، ئەی پەروەردگاری ئادەمیزاد ئەو ئێش و ئازارە لابەرە شیفای بدەرە خۆشت چاکی بکەرەوە، شیفادەری بەڕاستی هەر بە خۆتی، چاکبوونەوە هەر بەدەستی تۆیە، بێجگە لە تۆ شیفایەکی تەواوی وا کە هیچ دەردێك نەهێڵێ.

---

(١) رواه ابن ماجه والحاكم






## ٥٠٧- ترسام کە تووشی درۆ کردن بم

ڕۆژێکیان زانای گەورە وناودار (طاووس)ی یمانی چووە لای خەلیفە هیشام وگوتی: ئەی هیشام حاڵت چۆنە، خەلیفە تووڕەبوو لەو قسەیە گوتی: بۆچی بە امیر المؤنین قسەم لەگەڵ ناکەیت؟ (طاووس) فەرمووی: بۆیە چونکە هەموو موسلمانەکان یەکدەنگ نین وڕازی نین بە پۆستی خەلیفایەتی تۆ، منیش لەوە ترسام کەبەو قسەیە تووشی درۆ کردن بێم [1].

## ٥٠٨- ئیمامی احمد وشەیتان

(عبد)ی کوڕی ئیمامی احمد دەڵێ :

لەوکاتەی باوکم لەسەر نەخۆشی مردن بوو، لەلای دانیشتم وپارچە قوماشێکم لەلابوو تاکو شەویلاکەی بۆ ببەستمەوە پێی، هەندێ جار لە هۆش خۆی دەچوو هەندێ جاریش بەخۆی داتەوە و دەتگوت: (نەخێر تاکو مردن) سێ جاران، وەپەنجەی خۆی لەگەڵ بەرزدەکردەوە، لە جاری سێ یەم گوتم باوکە ئەوە چیی بوو لەوکاتە دەتگوت: گوتی: کوڕم نەتزانی؟ گوتم: نەخێر، فەرمووێ: ئەوە شەیتان بوو هاتە لام وەستابوو پەنجەکانی لەناودەمی دانابوون و دەیگەزین ودەیگوت: ئەی احمد چۆن تووشی فیتنەو بەڵات کردم، منیش دەمگوت: نەخێر هەرگیز کۆڵ نادەم تاکو مردن [2].

---

( ١) احیاء علوم الدین (الامام الغزالي)بەرگی (٢) کتاب اداب العزله

( ٢) ١٠٠٠ قصه وقصه من حیاه الائمه الاربعه، لاپەڕە(٣٥٤)






## ٥٠٩- عمری کوڕی عبدالعزیز و پۆستی خەلافەت

دەگێڕنەوە لە عمری کوڕی عبدالعزیز (رضي الله عنه) لەوکاتەی کە خەلافەت هاتەی لای و بوو بە خەلیفەی موسلمانان، خەڵکی گوی بیستی دەنگی گریانێکی بەرزبوون لە ماڵی عمر، کاتێ پرسیاری ئەو گریانەیان کرد، لەوەڵامدا گوتیان: ئیمامی عمری کوڕی عبدالعزیز خزمەتکارەکانی خۆی سەرپشك کردوون لەوەی کە بمێننەوەیان ئازاد بکرێن وەپێانی گوت: بەڕاستی فەرمانرەوایەتی خەڵکم تووش هاتووە، بۆی هەیە سەرقاڵ بم لە ئێوە ئاگام لێتان نەمێنێ لەبەر کاروباری خەڵك ئینجا هەرکەسێك لە ئێوە حەزدەکات ئازادی بکەم ئەوا ئازادی دەکەم، وەهەرکەسێك دەمێنێتەوە ئەوا دەیهێڵمەوە وەبەڵام من هیچ پەیوەندێکم پێوە نییە، بۆیە ئەوانیش لەخەم و پەژارەی ئەوە زۆر گریان کەوا حەزیان نەدەکرد لە عمر جیاببنەوە

- هەروەها مالك کوڕی دینار دەفەرموێ :

کاتێ عمری کوڕی عبدالعزی خەلافەتی گرتە ئەستۆی، لەسەر لوتکەی کێوەکان شوانی بزن ومەڕەکان دەیانگوت: دەبێ کێ بوو بێت بە خەلیفەی موسلمانان وکار بە دەستی خەلك؟ یەکێك پێانی گوت: چۆن زانیتان؟ گوتیان: لەبەر ئەوەی هەرکاتێ پیاوێکی چاك وباش ببێتە گەورەی موسلمانان گورگ وشێر مەڕو بزنی ئێمە ناخوات و دەپارێزرێن لێیان[1].

(١) صفه الصفوه، ابن الجوزی، بەرگی (١) لاپەڕە (٣٩٢)






## ٥١٠- خوا و پێغەمبەری خوای هەڵبژارد لەسەر ماڵی دنیا

ئەم کەڵەپیاوە کە دنیاو ماڵی دنیای لەلا هیچ بەهایەکی نییە تاکو خوا لێ ڕازیی نەبێ و نەگاتە پێغەمبەر و هاوەڵان لەمەدینەی پیرۆز لە کاتێکدا خۆی گەنجینەکانی خۆی نیشان بە دوژمنانی ئیسلام دەدات و دەستی لێ هەڵدەگرێ بۆ ئەوان بەمەرجێ ڕێگەی پێ بدەن کە بگاتە کاروانی خۆی.. ئەویش (صهیب ی کوڕی سنان ی کوڕی مالك) کە بە (صهیب)ی ڕۆمی مەشهوور بوو.

- سعیدی کوڕی المسیب دەفەمووێ، کاتێ صهیب ویستی کۆچ بکات بۆ لای پێغەمبەر (لە مدینە) چەند کەسێك لە قورەیش بە دوای کەوتن، ئەویش لەسەر وڵاخەکەی خۆی هاتە خواری و تیردانەکەی پێ نیشان دان و کە چی تێدایە ئینجا گوتی: ئەی هۆزی قوڕەیش بەراستی ئێوە دەزانن کەمن لە هەمووتان تیرهاوێژتربوومە سوێند بە خوا ئێوە ناگەن بە من تاکو هەموو ئەو تیرانەتان تێ نەگرم کە لەناو تیردانەکەم دایە پاشان ئەگەر هیچم لەلا نەما ئەوا بە شمشێر شەڕدەکەم، ئێوەش هەرچی دەیکەن بیکەن ئەگەر حەزدەکەن ماڵ و سامان و پارەو پۆڵی خۆمتان پێ نیشان دەدەم لەمەکە بەڵام وازم لێ بێنن وبڕۆم بۆ مەدینە، گوتیان: بەڵێ (صهیب) ڕۆیشت و ماڵ و گەنجینە و پارەو جل و بەرگی بوو بە هی قورەیش، کاتێ ڕووی کردە پێغەمبەر لە مدینە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: (باوکی یحی لەو مامەلەیە



قازانجی کرد، باوکی یحیی لەو مامەڵەیە قازانجی کرد ) ئینجا ئایەتی ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴾ البقرة: ٢٠٧ دابەزی بۆ پێغەمبەر (ﷺ).

ئینجا (صهیب) خۆی دەڵێ: لە هەرشوێنێك پێغەمبەر مەوجوود بایە ئەوا منیش لەوێ بووم، وەبەیعەتی بدایە هەرکەسێ منیش بەشداریم کردوە، هەرکاتێ سریەیەکی ناردبایە بۆ شوێنێك ئیللا من بەشداریم کردووە، وەهەرکاتێ غەزایەکی بکردایە لەسەرەتایی ئیسلام وکۆتایی یەکەی ژیانی دا من لەلای بوویمە، یان لەلای ڕاستی بوویمە یان لە لای چەپی، هەرکاتێ پێغەمبەر و هاوەڵان ترسیان لە پێشەوە هەیایە لە دوژمن ئەوا من دەچوومە پێشەوە وەهەرکاتێ لە دواوە ترسیان هەبایە من لە دواوە دەوەستام وبەرگریم دەکرد لێیان تاکو پێغەمبەر وەفاتی کرد هەرگیز نەمهێشتووە بکەوێتە نێوان من و دوژمن[1].

## ٥١١- مونیبە لە خوا پەرستی تێر نابێ

ابو عیاش دەڵێ

ئافرەتێکی خواپەرست هەبوو لە بصرە ناوی مونیبە بوو، کچێکی هەبوو لە ئەو زیاتر خوا پەرستی دەکرد، هەرکاتێ شێخ حسن ی بصری چاوی پێدەکەوت سەرسام دەبوو پێ لەگەڵ ئەو تەمەنە بچوکە و ئەو خوا پەرستی

(١) صفه الصفوه، ابن الجوزی بەرگی (١) لاپەڕە (١٧٣)




یه زۆرەی.

ڕۆژێك شێخ حسن دانیشتبوو لەناكاو كەسێك هات و گوتی: ئایا نەتزانیوە كە ئەو ئافرەتە خواپەرستە لەسەر نەخۆشی مردنە؟ دەست بە جێ شێخ حسن چووە لای ئافرەتەكە سەیری كرد گریا، شێخ حسن پێی گوت: بۆ چی دەگری؟

گوتی: ئەی ابو سعید خۆڵ دەكەنە سەر گەنجی ولاشەم كەچی هێشتا لە خواپەرستی تێر نەبوویمە، ئەی ابو سعید سەیری دایكم بكە بە باوكم دەڵێ: بڕۆ گۆڕێكی فراوانی بۆ هەڵبكەنە و بەكفنێكی جوانیش كفنی بكە، سوێند بەخوا ئەگەر خۆم ئامادە بكردایە بۆ مەكەی پیرۆز گریانەكەم زیاتر دەبوو، چۆن من ئێستا خۆم ئامادە بكەم بۆ نێو تاریكی وبێ كەسی گۆڕ، كە بەڕاستی ماڵی تاریكی وماڵی حەشەڕات و كرم و دوپشك ومارە [1]

## ٥١٢- خوا پەرستی – ام الدرداء

میموونی كوڕی مهران دەڵێ :

هیچ نەچوویمە لای ام الدرداء لە هەر كاتژمێرێك ئیللا لەناو نوێژبووە

هزان دەڵێ: ام الدرداء پێی گوتم: ئایا دەزانیت كاتێ كە مردوو داندرا لەسەر نەختی شۆردنی چ دەڵێت؟

گوتم: نەخێر

ام الدرداء گوتی: هاواردەكات و دەڵێ: هاوار ئەی خانەوادەكەم هاوار

---

( ١) قصص العابدين، د.حامد احمد الطاهر، لاپەڕە (١٠٢)






ئەی دراوسێیەکانم، هاوار ئەی هەڵگرانی جەنازەکەم وریابن دنیا فریوتان نەدا وهەڵتان نەخەڵەتێنی وەك منی فریوداو هەڵی خەڵەتاندم وبەدنیا لە خۆبایی بووم، وریابن دنیا گەمەو یاریتان پێ نەکات وەك بە منی کرد، چونکە بەڕاستی خزم و کەس و کارم گوناهی من هەڵناگرن، ئەگەر بەڵگەم بۆ بێننەوە لەلای خوای باڵا دەست وزاڵ بەڕاستی هیچم پێ نامێنی بەڵگەیان بەسەر من دەکەوێ.

پاشان – ام الدرداء گوتی: دنیا زیاتر کاری سیحری دەکاتە سەر خواپەرستان لە هاروت و ماروتیش، هەر بەندەیەك دنیای لەلای خۆشەویسترنەبێ لە دوا ڕۆژدا وەزیانی دوا ڕۆژی هەڵبژێری ئەوا ملی خۆی کەچ دەکات [1]

## ٥١٣- هەرگیز لێی تێنەگەیشتون

ابو خليد – دەڵێ :

لەلای ئیمامی مالك ی کوڕی انس بووم، کتێبی الموطأ –م خوێندەوە لە ماوەی چوار ڕۆژدا، ئینجا ئیمامی مالك فەرمووی، پیاوێك هەمووی خوێندەوە و لێی تێگەیشت لەماوەی شەست (٦٠) دانە ساڵ دا، ئێوەش لە چوار ڕۆژدا وەری دەگرن و دەیخوێننەوە نەخێر هەرگیز لێی تێنەگەیشتون[2].

---

( ١) قصص العابدين لاپەرە (١٠٥)

(٢) ١٠٠٠ قصة وقصة من حياة الائمة الاربعة، لاپەڕە (١٣٨)






## ٥١٤- دووره پەرێزی کردن لە کاتی خراپ بوونی خەڵك

ئیمامی الغزالی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبی (احیاء علوم الدین)دا دەفەرمووی :

- پرسیاریان کرد لە یەکی لە خواپەرستان، چۆن ئارام دەگریت بەوەی کە هەمیشە بەتەنیایی؟

لەوەڵامدا گوتی: من هەر گیز بەتەنیا نیم بەڵکو کۆڕو دانیشتنم لەگەڵ زاتی خوایە هەرکاتێ ویستم موناجاتی لەگەڵ دا بکەم ئەوا نوێژ دەکەم وەهەرکاتێ ویستم کە ئەو لەگەڵ مندا قسەو گفتوگۆ بکات ئەوا دەست دەکەم بە خوێندنی قورئان.

ذا النون ی میسری دەفەرمووێ: خۆشی وشادی پیاوی ئیماندار ئەوەیە کە چێژ لە خۆبە دوور گرتن لە خەڵك وەردەگرێ، بەموناجاتی لەگەڵ خواکەی

- عبداللە ی کوڕی زید دەفەرمووێ:

خۆشی بۆ ئەوکەسەی کە ژیانی دنیا و دوا ڕۆژی هەیە گوتیان: چۆن؟

فەرمووی: لە ژیانی دنیادا وخۆبە دوورگرتن لە خەڵك موناجات لەگەڵ خوا دەکات، وەلە دوا ڕۆژیش دەبێ بە دراوسێی خوا.

- لەسەردەمی شێخ حسن البصری پیاوێك هەبوو زۆر دەچوو مزگەوت و خۆی لەخەڵك بە دوور دەگرت ڕۆژێك ئەو هەواڵەیان بە شیخ حسن ڕاگەیاند: فەرمووی: ئەگەر ئەو جارە هاتەوە مزگەوت پێم بڵێن دەچیمەلای.






کە هاتەوە پێیان گوت: حسن ی بصری چووە لای وپێی گوت: ئەی بەندەی خوا دەتبینم کە دوورەپەرێزی (العزلە) دەکەیت لە خەڵك وەئەوەشت لەلا شتێکی خۆشەویستە، چ شتێك قەدەغەت لێ دەکات لە نەچیتە کۆڕ و مەجلیسی خەڵك، وەپێ گوت: چ شتێکە ناهێڵێ بچیتە کۆڕ و دانیشتنی ئەو پیاوە کە پێی دەڵێن (حسن) مەبەست حسن ی بصری بوو.

پیاوەکە وەڵامی دایەوە گوتی: چەند ئیش وکارێك سەرقاڵی کردووم شێخ حسن فەرموی: ئەم سەرقاڵی چییە ڕەحمەتت لێ بێ؟

گوتی: من بەیانی وئێوارە دەکەمەوە لە نێوان نیعمەتێك وتاوانێکم خۆم بە سوپاسگوزاری لەسەر ئەو نیعمەتە سەرقاڵ دەکەم وەلەسەر تاوانەکەش هەمیشە تۆبە دەکەم بۆیە کاتم نییە.

شێخ حسن پێی گوت: ئەی بەندەی خوا تۆلە شێخ (حسن)یش بەلای منەوە شەرع زانتری کەواتە پابەندبە بەوەی کە لەسەری.

– هەندێ لە زانایان دەفەرموون:

خوای گەورە هەر بەندەیەکی خۆی خۆش ویست ئیللا وای لێ دەکات کە حەز بە ناوداوی ومەدح وستایشی خەڵك نەکات وەهەروەها وای پێ خۆشە کە خەڵك نەیناسی[1].

---

(١) احیاء علوم الدین، الامام ابو حامد الغزالي، بەرگی (٢) باب فوائد العزلە






## ٥١٥- یەك كراسی هەبوو

ئیمامی (القشیری) لە یەكێك لە هاوەڵانی دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە خەومدا بینیم قیامەت ڕابوو ودەیانگوت: مالك ی كوڕی دینار و محەمدی كوڕی واسع ببەن بۆ بەهەشت، منیش سەیرم كرد گوتم: بزانم كامیان بە پێش ئەویتر دەكەوێ، بینیم محمدی كوڕی واسع بە پێش مالك ی كوڕی دینار كەوت.

پرسیارم لەوە كرد كە بۆچی ئەو بە پێش كەوت؟

گوتیان: لەبەرئەوە محمدی كوڕی واسع یەك كراسی هەبوو بەڵام مالك ی كوڕی دینار دوو كراسی هەبووە[1].

## ٥١٦- سوێندێكی نابەجێ

پیاوێك قەرزی لای پیاوێكی تر بوو هات بۆ داواكردنەوەی قەرزەكەی پیاوی قەرزدار داوای لە خاوەن قەرز كرد كە لەگەڵی نەرم و نیان بێت وهەندێ لە قەرزەكەی خۆش بێت، چونكە ناتوانێ هەموو قەرزەكە بداتەوە، خاوەن قەرزەكە ڕازی نەبوو، ئێتر دەنگیان بەسەر یەكتردا بەرزكردەوە، خاوەن قەرز سوێندی خوارد بەخوا واناكەم واتە: لێ خۆش نابم!

پێغەمبە(ﷺ)گوێ لێ بوو، فەرمووی: ئەوە كێ یە زێدەڕەوی دەكات لە سوێنددا؟ سوێند بەخوا دەخوات كە كاری چاك نەكات، كابراكە گوت: من

(١) ارشاد العباد زین الدین الملیباري لاپەڕە (٥٢)



بووم ئەی پێغەمبەری خوا، وەهەستیشی بەهەڵەی خۆی کرد، ئومێدەوار بوو کە پێغەمبەر لێی توورەنەبێ، ڕوی کردەوە پیاوەکە گوتی: کامیانت پێ خۆشە هەڵبژێرە یان چەندە ناتوانی قەرزەکە بدەیتەوە مەیدەرەوە، یان بەویستی خۆت ئەندازەیەك لە قەرزەکە ببڕە، بۆیە ئەو کارەی کرد تاکو خاوەن قەرزەکە ملکەچی حەق بێ و دڵی براکەی ڕازی بکات وگوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بکات(١).

## ٥١٧- زانست و پارێزگای

ئیمامی شافعی (ڕەزای خوای لێ بێت) زۆر بە خێرایی زانست فێردەبوو، وە هەرگیز لە بیری نەدەچووە، ئەگەر پەرتوکێکی بخوێندایەوە دەستی دەخستە سەر لاپەڕەکەی تر بۆ ئەوەی ئەویش لەبەر نەکات ولەگەڵ هی پێشتر تێکەڵ بێت، ڕۆژێکیان چووە خزمەت (وکیع) ی مامۆستای پێی گوت: وەکو پێویست شتم بۆ لەبەر ناکرێ وبیر تیژیم نەماوە، ئەویش گوتی: پێدەچێ هۆکارەکە ئەوە بێ کە تووشی گوناهو تاوانێك بوو بیت، سەرئەنجام لاواز بووە، بۆیە پێشەوا شافعی فەرمووی:

شكوت الى وكيع سوء حفظي

فارشدني الى ترك المعاصي

---

(١) متفق عليه




واخبرني بان العلم نور

ونور الله لا يهدى لعاصي

واتە:

سکالأی خۆم بردە لای مامۆستا (وکیع) لە خراپی بیرم

ڕێنمووی کردم بۆ وازهێنان لە گوناهو تاوان

پێی گووتم کە زانست ڕووناکیە

وەڕووناکی خودایی بۆ کەسێکی تاوانبارنابێ

دەگێرنەوە کە ئیمامی شافعی لەوکاتەدا چاوی بە پاژنە پێی ئافرەتێك کەوتبوو بەس، بۆیە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك دەرگاری لە بەرکردنی لەسەر داخسترابوو (فكيف بمن يغرق في المعاصى)؟

ئەگەر شافعی حاڵی ئەوەابێ کە تەنها بەیەك تێروانین وای بەسەر هات دەبێ ئەوکەسەی کە لە نێو دەریای تاوان دەخنکێ حاڵی چۆن بێ؟[1].

(١) ديوان الامام الشافعي






## ٥١٨- ئافرەتێك كە بە باوەڕەكەی گەورەدەبێ

دەگێرنەوە كەوا پیاوێك بە ئافرەتەكەی گوت: سوێندبێ دەبێ لاییدەت بكەم وبەختەوەریت لێ بسەنمەوە.

ئافرەتەكە كاتێ هەڕەشەو گوڕەشەی پیاوەكەی بیست، بەهێمنی ی و لەسەر خۆیی گوتی: ناتوانی لە ڕێگام لابدەیت وتووشی شەقاوەتیم بكەیت وەك چۆن ناتوانی بەختەوەرم بكەیت پیاوەكە بە تووڕەییەوە گوتی: چۆن ناتوانم؟

ئافرەتەكە بە دڵێكی پاك و پڕ لە باوەڕ و متمانە گوتی: ئەگەر بەختەوەری لە موچەی مانگانە بوایە، ئەوا یەكسەر دەتبڕی لێم و بێ بەشت دەكردم، وەئەگەر لە جوانی بەرگ و پۆشاك وخشڵ و زێڕ بوایە ئەو كاتە دەتتوانی لێم قەدەغە بكەیت، بەڵام دڵنیابە بەختەوەری لە شتێكە كەوا تۆو و هەموو خەڵك ناتوانن بەدەستی بێنن ولێم قەدەغە بكەن.

پیاوەكە ئەمجارە بەسەرسامیەوە گوتی: لە چی دایە؟

ئافرەت گوتی: لە (یقین) وباوەڕدایە، من بەختەوەریم لە باوەڕم دۆزیتەوە وە باوەڕیشم لە دڵم دۆزیتەوە، بێگومان دڵیشم جگە لەخوا كەس دەسەڵاتی نییە بەسەری[1].

---

(١) هذا هو الطريق الى الجنة، عبدالرحمن السنجري، لاپەڕە(٦١)



## ٥١٩ - فەتواكانی شیخ عبدالقادری گەیلانی

شێخ عبدالقادر گەیلانی، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لەسەرمەزهەب و ڕێڕەوی ئیمامی احمد و ئیمامی شافعی فەتوای داوە، هەركاتێ زانستی و فەتواكانی نیشان بەزانایانی عێراق بدرابایە زۆر پێ سەرسام دەبوون دەیانگوت سبحان من انعم علیه – پاكی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی كە نازی خۆی بەسەرداباراندوە.

–ڕۆژێكیان پیاوێك پرسیارێكی دەباتە لای دەڵێ: سێ بەسێ تەڵاقم خواردووە كە دەبێ بەتەنیا خواپەرستنێك بكەم كەس لە خەڵكی شتی وای نەكردبێ، ئایا چارە لەوەدا چی یە ودەبێ چ خواپەرستنێك بكەم؟

دەست بەجێ وەڵام دەداتەوە دەفەرمووێ :

دەبێ ئەو كەسە بچێتە (مكە) شوێنی تەواف بۆ چۆڵ بكرێ – دەوری كەعبە – ئەویش یەك هەفتە بەتەنیا تەواف دەكات ئەو كاتە سوێندی تەڵاقی لێ ناكەوێ و ڕزگار دەبێ لێی زانایان سەرسام بوون بەمە، كە نەیانتوانی وەڵام بدەنەوە، هەتا بڵێی پابەندبووە بە شەرعی خواو ڕەوشتی پێغەمبەر و هاوەڵان كەس نەیتوانی یە زیانی پێ بگەیەنێ لە بەر زانستی پڕ لە (یقین) و متمانە و باوەڕی بەخوا.

دەڵێن: پیاوێك بانگەشەی بۆ خۆی دەكرد كە گوایە بە چاوی سەری خوای گەورەی بینوە – نەك لە خەودا – هاتە لای زانای گەورە شەرع زان عبدالقادر گەیلانی پرسیاری لێ كردو گوت ی: ئایا ئەوەی خەڵكی باس




دەكات سەبارەت بە تۆ و دیتبنی خوا شتێكی ڕاستە؟

كابرا گوتی: بەڵێ ڕاستە خوام بینی بەچاوی سەرم دەڵێ شێخ عبدالقادر كە ئەمەی بیست سەرزەنشتی كردو لە مەجلیسی خۆی دەركرد وەپێی گوت: جارێكی تر ئەو جۆرە قسانە بڵاونەكەیتەوە – چونكە ئەوە پێچەوانەی شەرعی خواو سونەتی پێغەمبەرە (ﷺ).

عمران ی البزار دەڵێ: پرسیار دەهاتنە لای عبدالقادر گەیلانی لەوڵاتانی عیراق ومیسر و یەمەن و شام نەمانبینی پرسیارەكان لەلای خۆی ڕابگیردرێ تاكو بیری لێ بكاتەوە بەڵكو یەكسەر لە ژێر پرسیارەكە لە دوای خوێندنەوە وەلامی دەنووسیەوە[1].

## ٥٢٠- ژیری بەگەورەیی نییە

شێخی سعدی شیرازی لە كتێبە ناودارەكەی (گوڵستان) لە باسی ڕەوشتی پاشا و حوكمداراندا دەفەمووێ :

كوڕە پاشایەك هەبوو زۆر بچوك وردبوو، وە زۆر فەقیرو بەئەدەب بو، براكانیشی جوان وباڵا بەرزبوون، جارێكیان باوكی بە چاوی بێ حوڕمەتی تەماشای كرد، ئەویش گوتی: ئەی بابی من بچوكی عاقل باشترە لە باڵابەرزی بێ عەقڵ، وانییە كە هەرچی لاشەی گەورەتر بێ بە قیمەت زیاتر بێ، نابینی مەڕ پاكە و فیل پیسە؟

---

(١) مناقب الشیخ عبدالقادر الكیلانی الشیخ یونس السامرائی

لە گشت شاخانی دنیا گچکەتر توورە.

لەلای خوا زۆرتریش ماقووڵ و پڕ نوورە.

باوکی پێکەنی و دائیرەی مەجلیس پەسەندیان کردو براکانیشی بە ڕۆح لێی عاجز بوون.

دەڵێ: بیستم لەوکاتە دا پاشا دوژمنێکی بەهێز ڕووی تێکرد، کە هەردوو لەشکر بەرامبەر بوون، یەکەم کەس لە مەیدان ئەسپی تاودا ئەو کوڕەبودەیگوت:

من وەهانیم ڕۆژێ شەڕ پشتم ببینێ دوژمنم

من لەوانەم سەر لە ناو خوێناوی خۆمدا دەنێم

ئەوکەسێکی شەڕ کەرە گاڵتە بە خوێنی خۆی دەکا

هەرکەسێ ڕابکا لە مەیدان خوێنی لەشکر بابدا

هەر کە ئەوەی گوت و خۆی لە لەشکر دا، چەند کەسێکی لە پیاوانی ئازاو نەبەز و ڕەشید کوشت، کە هاتەوە لای باوکی خاکی قەومی ماچ کردو گوتی:

ئەی کەسی کە ئەمنت دانابوو بە هیچ

خۆت دەزانی گەورەکانت بوونە هیچ

ئەسپی قەد باریکە قوربان ڕۆژی مەیدان بێتە کار




**نەك ئەوانەی میسكی گاجوت زگ زلّ و نابەكار**

وادەگێڕنەوە كە دوژمن زۆر بوو ئەواینشت كەم بوون، هەندێك تەمای ڕاكردنیان هەبوو، كوڕەكە هاواری كرد و پێی گوتن: تێبكۆشن نەك كراسی ژنان بپۆشن، ئەوانیش بەو قسەیە چاویان قایم بوو، هێرشیان برد لەو ڕۆژەدا بەسەركەوتن و دوژمنیان شكاند، پاشای باوكی سەروچاوی ماچ كردو و لە باوەشی گرت، ڕۆژ بە ڕۆژ خۆشی دەویست وكردی بە جێنیشینی خۆی، براكانی حەسوودیان پێ بردو ژەهریان بۆ لە تەعام كرد خوشكێكی خۆی هەبوو چاوی لێبوو، لە پەنجەرەوە دەروازەكانی لێكدا، كوڕەكەش بە عەقڵ تێگەیشت ودەستی نەدایە خوادرن وگوتی: زۆر دوورە هونەرمەند بمرن و بێ هونەر جێیان بگرن.

كەسێ دەچێتە ژێری سایەی كوندەبوو

گەرچە پێرۆزەش لە دنیا هەر نەبوو

ئەو قسەیان بۆ باوكی گێڕایەوە براكانی بانگ كردن و هەر یەكە و زللەیەكی لێدان وزەجری كردن لە دواییدا لە دەوری شاری دانان و معاشی بۆ بڕینەوە تاكو فیتنە بكوژێتەوە.

گوتویانە: دە (١٠) دەروێش بەیەك بەڕ دەنوون بەڵام دوو پاشا لە ئاقارێك ناگونجێن[1].

---

(١) گوڵستانی سعدی، وەرگێڕانی لە فارسیەوە بۆ كوردی ملا مصطفی ی (عاصی) چاپی یەكەم نوسینگەی تەفسیر لاپەڕە (٦٥)






## ٥٢١- تۆلەسەر كۆچ وكۆچبارى

حسن ى البصرى نامەيەكى نارد بۆ خەليفە عمرى كوڕى عبدالعزيز تێيدا بە درێژى باسى لە ژيانى دنيا و كەمى دنيادەكرد، ئەمەش نامەكە.

لە پاشان.. بەڕاستى ئەو دنيايە خانووى كۆچ و كۆچبارە نەك ماڵى مانەوە و نيشتەجێ بوون، كە ئادەم هاتە سەر دنيا بەهۆى تاوانێك بوو، وريابە لێى ئەى اميرى ئيمانداران، چونكە توێشوو لەو دنيايەدا واز هێنانەلێى دەوڵەمەنديش هەژارى يە لە ژيانى دنيادا، كەسێ خۆى بە زلێ بزانى زەليل دەبێ، كەسێ ماڵ كۆبكاتەوە فەقير دەبێ، وەك ژەهر وايە ئەوەى دەيخوات نازانى كەچى لە ناوى دەبات، وريابە خۆت بە دوور بگرە لەو ماڵە چۆڵە و فێڵبازە، دڵخۆشتر بە لەوەى كە تێيداى، خۆت بە دووربگرە لەوەى كە ببيت بە پياوى دنيا، دڵخۆشيەكانى پڕن لە ناخۆشى وخەم و پەژارە جوانى وپاڵێوتنى وپاككردنەوەى داپۆشراوە بەلێلى وتاريكى، ئەگەر خوا هيچ هەواڵێكى سەبارەت بە دنيا نەدابايە، وەهيچ نموونەيەكى پێ نەهێنابايەوە، ئەوا بەراستى دەبوايە نووستوى بێدار بكردايەوە، وەبێ ئاگاى بەخەبەر بهێنابايەوە، چى دەكەى كە چى هاتووە لەلاى خوا كە زەجرو سەرزەنشتى كردووە، وتێيدا ئاموژگارى بەخش هەيە، ئەوكاتە لاى خوا هيچ گرانى وڕێزو سەنگينى يەكى نابێ، لەو كاتەى دروستى كردووە سەيرى نەكردووە، بێگومان گەنجينە وكليلەكانى نيشان بە پێغەمبەر (ﷺ)دران كە هيچى لێ كەم نەدەبوونەوە بە ئەندازەى باڵى پێشوولەيەك بەلاَم ئەو نەيويست، وەپێى ناخۆش بوو شتێكى خۆش بوێت كە خوا رقى لێيەتى، يان شتێ لەودنيايەدا



بەرز بکاتەوە کە خاوەنەکەی نزمی کردووە، بۆ پیاو چاکانی سەرپشك کردووە وپێی نیشان داون وبۆی کۆکردوونەتەوە، بەڵام بۆ دوژمنانی ڕاخستوە کە پێی لە خۆبایی بن، ئایا پیاوی لە خۆبایی واگومان دەبات کە ئەمە ڕێزی لێ دەگیرێ بەهۆی ئەو دنیاو ماڵە؟ لە بیری کردووە کە خوا چی بە (محمد) (ﷺ)کرد کاتێ بەردی لەسەر زگی دادەناو لەبرسان، سوێند بەخوا هەرکەسێك دنیای هەبێ ومالی دنیای بۆ کۆکرابێتەوە ئینجا لەوەنەترسیت کە ئەودنیایە دەیخەڵەتێنێ ئەوە بەڕاستی عەقلی کەم کردووە بەو جۆرە بیرو هۆشەوە، وە بێ تاقەت بووە لە ڕاو بۆچوون بەرامبەر بە شتە چاکەکان، وەسوێند بەخوا ئەو دنیایە لە هەرکەسێك قەدەغە کرابێ ئینجا وا گومان نەبات کە لێ سەرپشك کراوە ئەوە بەڕاستی عەقلی لەدەست داوە وڕاوبۆچوونی بێ هێز بووە[1].

## ٥٢٢- ترسی پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) لەخوای گەورە

- وەهب کوڕی منبە دەڵێ: حەزرەتی ادم لەسەر بەهەشت سێ سەد (٣٠٠) ساڵ گریا وسەری خۆی بەرزنەکردەوە بۆ ئاسمان لەدوای ئەوەی کە تووشی گوناهەکەی بوو.

- وەهیب ی کوڕی ورد دەڵێ: لەوکاتەی خوا لە حەزرەتی نوح عاجز بوولەسەر کوڕەکەی (کە دەیگوت خوایە بیپارێزە چونکە لە ئەهلی منە)

---

(١) مختصر منهاج القاصدين الامام ابن قدامه المقدسی لاپەڕە (١٩١)




وەخوای گەورە پێی گوت: ئامۆژگاریت دەکەم لەوەی کە نەچیتە ڕێگای نەزانەکان سێ سەد ساڵ گریا تاکو ژێر چاوەکانی وەك نەخشەیەك هێڵاوی ببون لەبەر گریانی.

– ابو الدرداء دەفەرموێ: لە دوورەوە دەنگێك لە سینگی پێغەمبەر ابراهیم دەبیسترا کاتێ هەڵدەستا بۆ نوێژ کردن لە ترسی خوای گەورە

– زانای گەورە و شارەزا لە لێکدانەوەی ماناکانی قورئان (مجاهد) دەفەموێ کاتێ پێغەمبەر داود توشی گوناهەکەی هات، چل دانە شەو سەری لە سوجدەی هەڵنەگرت بۆخوا، پاشان هاناو هاواری بردە بەرقاپی خوا فەرمووی: خوایە گیان.. ناوچاوان برینداربو، چاوەکان ووشك بون فرمێسك نەما و داودیش نەگەڕاوەتەوە سەر تاوانەکەی هەرگیز، بانگی کرا، ئایا برسیتە خواردنت پێ بدرێت؟ ئایا نەخۆشیت چاك ببیتەوە وشیفات بۆ بێت؟ ئایا ستەملێکراویت یارمەتیت بدرێت و سەربخسترێت؟ گریانێکی زۆرمان خۆش دەوێ کە بەسەر هەر شتێ بڕوات سەوزی بکات (واتە: وەك ئاو بەسەر زەوی کە گیاو بۆر سەودەکات) لەوکاتەدا خوای گەورە لێی خۆش بوو.

گوتویانە: سەردانی پێغەمبەر (داود) یان دەکرد وایان دەزانی کەوا نەخۆشە، بەڵام هیچ نەخۆشیێکی نەبوو جگە لە دابڕان لە خوا نەبێ.

– هەرکاتی پێغەمبەر (عیسی) باسی مردنی دەکرد یان بەبیری دەهاتەوە، لە پێستی خوێن دەتکا.

– یحی ی کوڕی زکریا (علیهما السلام) ئەوەندە دەگریا تاکو ددانەکانی



دواوەی بەدەردەکەوتن، بۆیە دایکی پارچە لبادێکی بۆ دروست کردبوو بەڕوومەتی یەوە دەلکاند

– ترسی پێغەمبەری سەروەرمان لە خوای گەورە، خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) دەفەمووێ (هیچ کاتێك نەمبینیوە پێغەمبەری خوا (ﷺ)زۆر پێبکەنی تاکو پارچە گۆشتی سەر گەوری ببینم لەگەڵ پێکەنینەکەی ودەم کردنەوەی بەڵکو تەنها زەردەخەنەی هەبووە، وەهەر کاتێ هەوری دەبینی یان با هەڵکردن، شوێنەواری دەناسرا لە ڕوخساری، دەیگوت ئەی پێغەمبەری خوا خەڵکی کاتێ هەور دەبینن دڵیان خۆش دەبێ ئومێدیان وایە بارانی لەگەڵ بێت، بەڵام تۆ دەبینم پێت ناخۆشە و شوێنەواری دیارە لە ڕوخسارت؟

فەرموی: ئەی عائیشە دڵنیانیم کە ئەو هەورە هەوری عەزاب و بەڵاو نەهامەتی نەبێ؟ بێگومان گەلی واهەبوو بە (با) لەناوچوون، هی واش هەبوو عەزابی خوای بینوە گوتویانە: (واتە: هەورێ یان بینیوە) ئەوە هەورە بارانی پی یە بۆمان دەبارێنی کە چی عەزابیش بووە بۆیان[1].

---

(١) مختصر منهاج القاصدين ابن قدامە المقدسی لاپەڕە (٣١٢)




## ٥٢٣- ماناى زوهد

پرسياريان كرد لە ئيمامى احمدى كوڕى حنبل سەبارەت بە كەسێك كە هەزار دينارى هەبێ ئايا ئەو كەسە زاهيدە؟

فەرمووێ: بەڵێ: بەمەرجێك ئەگەر پارەكەى زيادى كرد پێى دڵخۆش نەبێ، وەدڵتەنگ نەبێ ئەگەر لێى كەم بكات،

ابن القيم دەڵێ: زوهد ماناى ئەوەيە كە واز لە شتێك بێنى كە سوودت پێ نەگەيەنێ، هەروەها خۆپارێزى و وەرعيش بريتى يە وازهێنان لە شتێك كە زيانت پێ بگەيەنێ.

- ئيمامى احمد لە طاووسى يمانى دەگێڕێتەوە كە دەفەمووێ: پێغەمبەرى خوا فەرمويەتى (ان الزهد في الدنيا يريح القلب والبدن، وان الرغبة في الدنيا تطيل الهم والحزن)[1]. واتە: بەڕاستى وازهێنان وزوهد لە دنيادا دڵ ئارام دەكات و حەسانەوەى پێ دەبەخشێ، بەڵام خۆشەويستى وتامەزرۆبوون بۆ دنيا وپەژارە زياد دەكات و درێژى پێ دەدات.

---

(١) الزهد للامام احمد بن حنبل (١٠)






## ٥٢٤- خەونەكەی ئیمامی شافعی

(ربیع) دەڵێ: ئیمامی شافعی ڕۆیشت بۆ (مصر) منیش لەگەڵ چووم، پێی گوتم: ئەی ربیع ئەو كتێبەم لێ وەربگرە (نامەیەك بوو) وەبیدەبە ابو عبدالله احمدی كوڕی حنبل، دواتر وەڵامەكەم بۆ بێنەوە، ربیع گوتی: چوومە بغداد ونووسراوەكەشم پێبوو لە كاتی نوێژی بەیانی گەیشتم بە ئیمامی احمدی كوڕی حنبل، كاتێ نوێژمان كردو ئەویش لە میحرابەكەی دەرچوو سەلامم لێی كردو نووسراوەكەم پێدا وپێم گوت: ئەمەش نووسراوی ئیمامی شافعی براتە لەوڵاتی (مصر) ئیمامی احمد فەرمووی: سەیرت كردووە؟ گوتم: نەخێر

مۆرەكەی نوسراوەكەی شكاندو نامەكەی خوێندەوە و چاوی پڕبوون لە فرمێسك گوتم وای ئەوە چیە خێرە ئەی ابو عبدالله، فەرموی: لەو نوسراوە دا دەڵێ: پێغەمبەرم لە خەومدا بینوە وپێی گوتومە نوسراوێك: بۆ ابو عبدالله احمدی كوڕی حنبل بنووسە و سەلامی منی پێ بگەیەنە و پێی بڵێ (انك ستمتحن وتدعى الى خلق القران فلا تجبهم فسيرفع الله لك علما الى يوم القيامه) واتە: بەڕاستی تۆ لە مەودوا تاقی دەكرێتەوە وتووشی بەڵا دەبی وەبانگت دەكرێ (لەلایەن خەلیفەی بغدا) بۆ ئەوەی فەتوای بۆ بدەیت كە قورئان مەخلووقە، بەڵام تۆ وەڵامی نەدەیتەوە بەو جۆرە، خوا زانستی تۆ تاكو ڕۆژی دوایی بەرز دەكاتەوە.

ربیع دەڵێ: منیش پێم گوت: كەواتە ئەمە موژدەیە؟






ئەویش هەستا یەکێ: لە کراسەکانی خۆی لەبەر کردەوە و دای بە من، منیش لێم وەرگرت و دەرچووم بۆ (مصر) وەڵامەکەم بۆ ئیمامی شافعی بردەوە، شافعی پێی گوتم: چی پێ دایت؟

گوتم: کراس، ئەوکراسەی کە بەخۆی لەبەرخۆی کردبوو [1].

## ٥٢٥- موژدە وئامۆژگاری پێغەمبەر(ﷺ)لەخەودا

سلیمان کوڕی سحیم دەڵێ:: لە خەومدا پێغەمبەرم (ﷺ)بینی پرسیارم لێ کرد و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوانەی دێنە لای تۆو زیارەتی گۆڕەکەت دەکەن وسەلامت لێ دەکەن، ئایا لەسەلامی ئەوان تێدەگەیت و دەنگیان دەبیسیت؟

(قال: نعم وارد علیهم) واتە: فەرموی: بەڵێ وەلامی سەلامەکەشیان دەدەمەوە.

– لەو ساڵەی کە خەلیفەی عباسی هارون الرشید دانیشت لەسەرپۆستی خەلافەت دەرچوو لەگەڵ لەشکرەکەی تاکو غەزای هەموو شوێنەکانی ڕۆمی کرد و وەلەمانگی شعبان ڕۆیشت و لە کۆتایی ساڵدا حەجی بەخەڵکێکی زۆر کرد و لە هەردوو حەرەمی مەکە و مەدینەدا ماڵ وسامانێکی یەکجار زۆری بەخشی، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری لە خەودا بینیوە پێی گوت: (ان هذا الامر

---

(١) لمن اراد رؤيه النبى فى المنام، ابو عمرو محمد عبدالملك الزغبى، لاپەڕە (٩١)



صائر اليك في هذا الشهر فاغز وحج ووسع على اهل الحرمين)

واتە: بەڕاستی ئەو کارەت هاتۆتەلا، (خەلافەت) لەومانگەدا، کەواتە: غەزابکە (غەزای ڕۆم) وەحەجی ماڵی خواش بە موسڵمانان بکە، هەروەها ماڵ و سامان وپارەش بەسەر خەڵکی مەکە و مەدینەدا دابەش بکە (ئەمەش وەسیەت و ئامۆژگاری پێغەمبەرە بۆ هاورن الرشید کە بەخۆی لە خەوی دا پێی ڕاگەیاند) ئەویش ئامۆژگاری یەکەی جێ بەجێ کرد[1].

## ٥٢٦- پێی گوت: بەخەڵکی بڵێ بادەربچن داوای باران بکەن

لەسەردەمی خەلیفەی عباسی لەبەغدا (المتقی بالله) بانگکەرێك بانگی کرد لە بازاڕو کۆڵانەکانی بغدا گوتی: امیری ئیمانداران فەرمان بە خەڵکەکەی دەکات وهەواڵیان پێ ڕادەگەیەنێت کە ئافرەتێك چاك وپاك پێغەمبەری لە خەودا بینوە، وەپێی گوتوە: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمساڵ بێ بارانی ونەهاتە، پێغەمبەر (ﷺ)بە ئافرەتەکەی گوت: بڕۆ بە خەڵکی شار بڵێ با لە سێ شەممەی داهاتوو لە شار دەربچن و داوای باران لە خوا بکەن وبە ملکەچی دوعا بکەن، بێگومان هەر لەو ڕۆژەدا بارانیان بۆ دەبارێ، ئینجا امیری ئیماندارن فەرمان دەکات بە خەڵکی چۆن پێغەمبەر (ﷺ)فەرمانی کرد کە لە ڕۆژی سێ شەممەدا دەربچن ودوعای باران بکەن، ابو محمدی کاتب دەڵێ: خەڵکێکی زۆر ئەوهەواڵەی پێ ڕاگەیاندم کاتێ ئەو جاڕ دانەیان

(١) لمن اراد رؤیە النبی فی المنام، ابو عمرو محمد الزغبی، لاپەڕە(١٨٢)

بیست لەناوشاردا، دەڵێ لەوکاتە دا بازاڕەکان پڕ بوون لە گریان و دوعا، ئەمەش بەڕاستی زۆر لەسەرم گران بوو، دەمگوت: لە خەوی ئافرەتێك ئەو شتەکرا کە نازانێ ماناکەشی چییە، دەبێ ئەوە ڕاست بێ یان نا، خەلیفە لە شاری (السلام) بانگی خەڵکی کرد بەوخەوەی ئافرەتەکە، ئینجا دەمگوت چۆن پاساو بینینەوە، خۆزگە خەلیفە فەرمانی بەخەڵك دەکرد بەڵام باسی خەونەکەی ئەو ئافرەتەی نەدەکرد بۆ خەڵکی، هەردەم لە دڵەڕاوکێ دا بووم تاکو سێ شەممەی هات، لەناکاو خەڵکی گوتیان: ئەوا هەموو خەڵك دەروچون لەگەڵ ابو الحسن احمدی کوڕی فضیل ی کوڕی عبالملك کە ئیمامی مزگەوت بوو، وە زۆربەی پیاوانی خەلیفە وزاناکان وپیاوە ماقوڵانی لەگەڵ دەروچون، کە نوێژی باران و دوعا کردن ئەنجامدرا کەمێك پێش نوێژی نیوەڕۆ پارچە هەورێك لە ئاسمان بەرزبوەوە پاشان هەموو ئاسمانی داگرت، ئینجا باران باری وەخەڵکی چۆن بەبێ نەعل وپێڵاو هاتبون ئەوها لەناو قوڕدابەبێ پێڵاوو نەعل گەڕانەوە ناوشار[1].

ئەو بەسەرهاتە لە ساڵی ٣٢٩ کۆچی ڕوویداوە.

---

(١) لمن اراد رؤيه النبى فى المنام، ابو عمرو محمد الزغبى (١٩٠)




## ٥٢٧- ئامۆژگاری کارو خەلیفە

ڕۆژێکیان پیاوێ: چووە لای خەلیفەی عباسی (مەئموون) کاتێ ڕێگایان پێداو چووە ژوورێ گوتی: بۆ ئەوە هاتووم تاکو ئامۆژگاریت بکەم وعەیبەکانت پێ بناسێنم، کەوتە ئامۆژگاری بە شێوەیەکی توندو ڕەق قسەی دەکرد، مەئموون زۆر بەلایەوە سەیر بوو کە ئەو پیاوە هیچ نەرم و نیانی وحیکمەتی بەکار نەهێنا لە ئامۆژگاری کردنەکەیدا، بۆیە مەئمون گوتی: ئەی پیاو نەرم و نیان بە ! خوای گەورە لە تۆ باشتری ڕەوانە کردووە بۆ لای کەسێکی لە من خراپتر، وەفەرمانی پێداوە کە نەرم و نیان بێ، پیاوەکە بەلای سەیربوو، لێی پرسی ئەو ئامۆژگاری کارەکێ بوو کە خوا ناردی بۆ ئەوکەسە خراپ و ستەمکارە ؟

کاتێ مەئموون نیشانەی سەرسوڕمانی لە ڕووخساری پیاوەکە بینی گوتی: خوای گەورە پێغەمبەر (موسى) و (هارون) ی نارد بۆ لای فیرعەون لەولاتی (مصر) پێی دەفەرموون: هەردووکتان بەنەرمی وجوانی گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن بۆ ئەوەی ئامۆژگاری وەربگرێ یان ترسی سزای ئێمە لە دەروونیدا جێ بگرێت[1].

---

(١) چیرۆکی ئادابە ئیسلامیەکان، لاپەڕە (٢٠٤)






# ٥٢٨- هەوڵێکی خاوێن

لەبەیانیەکیان هاوەڵان لە خزمەت پێغەمبەردا، دانیشتبوون پیاوێکی بەهێزو بەشان و شەوکەتیان بینی زۆر بەخێرایی دەڕۆیشت بۆ سەر کارەکەی هاوەڵان سەرسام بوون بە هێزو توانا و چالاکی ئەو پیاوە، بۆیە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر ئەو هێزو توانا و ئازایەتیەی لە پێناو خوادا بوایە باشتر نەبوو؟ واتە: ئەو هێزو توانایەی بۆ جەنگ وتێکوشان لە پێناوی خواسەرف بکات چاکتر نییە)

پێغەمبەری خوا (ﷺ)بۆی ڕون کردنەوە کە کاری باش و چاك زۆرە وەکو ئەوە: ئەگەر پیاوێك لە ماڵی خۆی دەرچێ بە مەبەستی پەیدا کردنی رزقی حەڵاڵ بۆ منداڵە وردەکانی ئەوە ئەوکەسە لە ڕێگای خوادا کۆششی کردووە، وەئەگەر بۆ ئەوە دەربچێ کە نان پەیدا بکات بۆ دایك و باوکە پیرەکەی ئەوە بەڕاستی کاری لە ڕێگای خوادا کردوە، هەروەها ئەگەر بۆ ئەوە دەرچێ لە ماڵ وکاروکاسبیێ بکات عیزەتی نەفسی ڕابگرێ و سواڵ نەکا ئەوەش لە ڕێگای خوادا کۆششی کردووە، بەڵام ئەگەر کار بۆ ڕوپامایی وڕیابازی و خۆبەزل زانی بکا ئەوە بەڕاستی لە ڕێگای شەیتاندا کۆششی کردووە و هەوڵی داوە[1].

---

(١) رواة الطبراني، چیرۆکی ئادابە ئیسلامیەکان، لاپەرە(١٧٦)






## ٥٢٩- پیاوێکی عاقڵ

ڕۆژێکیان (ابن طولون) کابرایەکی حەمباڵی بینی سندوقێکی لەسەر پشتی بارکردبوو، بەڵام زۆر ئازاری پێوە دەدیت و لەرزی گرتبوو لە ژێر ابن طولون گوتی: ئەگەر ئەو ماندووبوونەو لەرزە لەرزەی لەبەر هەڵگیراوەکە بێ ئێستا ملی دەشکێ لەبەر قورسایی سندوقەکە، چونکە من دەبینم ملی ڕاست و بێ ماندووبوونە، ئەمە تەنها لەبەرترسی ئەوشتەیە لە هەڵیگرتووە لە ژێر سندووقەکە، بۆیە لێی نزیك کەوتەوە و پێی گوت: دەبێ ئەو سندوقە دابەزێنی لەسەر پشتت و بۆم بکەیتەوە، ئەویش دایبەزاندو کردیەوە، بینی لاشەی ئافرەتێکی تێدایە کە کوژراوە و پارچەش کراوە، ابن طولون پێی گوت: بەڕاستی پێم بڵێ حاڵی ئەو ئافرەتە چی بوو بۆچی وای لێ هاتووە؟

پیاوە حەمباڵەکە گوتی: چوارنەفەر لە ماڵی (فلان..) ئەوەندە پارەیان پێدام و فەرمانیشیان پێ کردم کە بۆیان هەڵگرم

ابن طولون.. دووسەد داری لە حەمباڵە کە داو چوار نەفەرەکانیشی کوشتن لە خوێنی ئەو ئافرەتە [1].

---

(١) هل فات الاوان لتبدأ من جيد، باسل شيخو، لاپەڕە (٩٦)



## ٥٣٠- لە خەودا پێغەمبەر (ﷺ) پێ گوت: ئەی شەرع زان

زانای گەورەو پایەدار ابو الطيب (طاهر)ي كوڕی عبدالله كوڕی طاهری طبری، لە ئامل لە دایك بووە لە ساڵی ٣٤٨ كۆچی، بۆ وەدەست هێنانی زانست و زانیاری گەشتی جۆراوجۆری ئەنجامداوە لە كۆڕومەجلیسی ابو احمدی الغطريفي و الدارقطني و چەندین زانای تر ئامادە بووە و زانستی لێ وەرگرتوون، هەروەها شارەزایی پەیدا كردووە لە سەردەستی ابو الحسن ی ماسر جسی، وەدەستێكی باڵای هەبوە لە بواری شەرعدا، هەروەها تەقوا و لەخوا ترسانی كۆكردۆتەوە لەو زانستە دا ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) لە خەودا دەبینی وپێی دەڵێ: (يافقيه)واتە: ئەی شەرع زان: ئەویش بەو وشەیە زۆر دڵخۆش دەبێ و دەڵی پێغەمبەر (ﷺ)ناوی ناوە لێم شەرع زان[1].

## ٥٣١- قورئان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەخوێنی لەخەودا

(صالح)ی مری یەكێكە لەپیاوچاكان، دەڵێ:

شەوێكیان قورئانم دەخوێند بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەخەودا پێی گوتم (ئەی صالح ئەمە قورئان خوێندنەكەت بەڵام كوا گریانەكەت؟!!!)[2].

---

( ١) لمن اراد رؤية النبي في لامنام، ابو عمرو محمد الزغبى، لاپەڕە(١١٩)

(٢)لمن اراد رؤية النبي في المنام، ابو عمرو محمد الزغبى، لاپەڕە(١١٩)






## ٥٣٢- خوای گەورە شانازی دەکات بە بەندەکانی

ڕۆژێکیان (معاویه)ی کوڕی ابو سفیان (رضي الله عنهما) چووە مزگەوت بینیٚ وا کۆمەڵی خەڵك دانیشتوون بەشێوەی بازنەیی، پرسیاری لیٚ کردن بۆچی ئەوها دانیشتوون؟ گوتیان دانیشتووین یادی خوا دەکەین، معاویه فەرمووی سوێندتان دەدەم ك تەنها بۆ ئەوە دانیشتوون؟ گوتیان سوێندبەخوا تەنها بۆ ئەوە دانیشتووین، معاویە فەرمووی: کەواتە من سوێندتان نادەم وەنەبیٚ تۆمەت بخەمە پاڵتان، چونکە پێغەمبەر (ﷺ)ڕۆژێك کۆمەڵێك لە یارانی بینی، فەرمووی: بۆچی دانیشتوون؟ گوتیان دانیشتووین یادی خوا دەکەین، وسوپاسی خوا دەکەین لەسەر ئەوەی کە هیدایەتی داوین بۆ ئیسلام بەهۆی ئەوەوە منەتی کردوە بەسەرماندا.

فەرموی: سوێندتان دەدەم تەنها بۆ ئەوە دانیشتوون؟ گوتیان: سوێند بە خوا بەڵام جوبرەئیل هاتە لام و هەواڵی پێدام کە: (بەڕاستی خوای گەورە شانازی دەکات بە ئیوە لەلای فریشتەکان)[1].

خوای گەورە شانازی دەکات بەبەندە موسڵمانەکانی لەلای فریشتەکان، ئەو بەندانەی لە مزگەوتەکاندا، دەمێننەوە و سەرگەرمی یادی خودان و خۆیان شارەزادەکەن لە ئایینەکەیان[2].

---

(١) روا المسلم

( ٢) چیرۆکی ئادابە ئیسلامیەکان






## ٥٣٣- لەسەر دەستی دایکی تۆبەی کرد

دەگێڕنەوە کەوا پیاوێك هەبوو بە (دیناری عیار) مەشهوور بووە دایکێکی هەبوو زۆر ئامۆژگاری دەکرد بەڵام ئەو هەر ئامۆژگاری وەرنەدەگرت ڕۆژێکیان بەلای گۆرستانێك تێپەڕی کە هەموو ئێسكو پروسکی مردوانی لێ بەدەرکەوتبوون،ئەویش پارچە ئێسکێکی هەڵگرت لەناو دەستی هەڵوەرا بیری لەخۆ کردەوە،بۆیە بەخۆی گوت، هاوار بۆ خۆت بەیانی تۆش وەك ئەوانە دەبیتە ئێسك و تێکەڵ دەبی لەگەڵ خاك و خۆڵ، ئەمرۆکەش وا هەوڵ دەدەم لەسەر گوناهو تاوان، بۆیە بەم تێڕوانین و بیرکردنەوە بڕیاری دا پەشیمان بێتەوە و تۆبە بکات کەوا جارێکی تر تاوان نەکات، سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان وگوتی: خوایە گیان بە هەموو کردەوەکانم هاتمە لات وەرمبگرە و ڕەحم پێ بکە، پاشان بەرەولای دایکی بەڕەنگێکی جیاوازو گۆڕا و کەوتەڕێ، بەدڵێکی شکاو دڵێکی پڕ لە پەشیمانی بەدایکی گوت: دایکە گیان ئەگەر کۆیلەیەك لە دەست گەورەکەی ڕایکردبێ پاشان گەورەکەی دۆزیەوە ئایا چی لێ دەکات؟ دایکی داناو دڵسۆز پێی گوت ڕۆڵەکەم!! بەرگ وپۆشاکی ملکەچی لەبەردەکات و خواردنی ملکەچی دەداتێ، دەست وقاچی دەبەستێتەوە، گوتی: دایکە کەواتە فەروایەکی (صوف) خوریم بۆ بێنە ولەگەڵ پارچە نانێکی جۆ، وام لێ بکە کەچی لەو کۆیلەیە دەکرێت، (واتە: دەست وقاچیشم ببەستوە) بەڵکو خوا بەو زەلیلی و غەریبیەم ڕەحمم پێ بکات، ئەویش فەرمانی کوڕەکەی بۆجی بەجێ کرد، ئینجا کاتێ دەبوەشەو دەستی دەکرد بە گریان و ناڵە ناڵ، هەر بە خۆی






دەگوت: هاوار بۆخۆت: ئایا هێزت هەیە لەسەر ئاگری دۆزەخ، چۆن خۆت بۆ ڕادەگیرێ لەبەردەم خوای بەهێزو بەدەسەلات؟ بەوشێوە تاکو بەیانی ئەمە حالی بوو، شەوێکیان دایکی پێی گوت: ڕۆڵەکەم! کەمێ بەزەییت بە خۆت بێتەوە، دەیگوت: دایە گیان: وازم لێ بێنە با کەمێك ماندوو بم بۆ ئەوەی زۆر پشوویدەم لە ماڵەکەی ئەو دیو، ئەی دایکە ڕاوەستاینێکی دووروو درێژمان لە پێشە بەرامبەر بە خوا، نازانم بەرەو سێبەری خوا فەرمانم پێ دەکرێ یان بەرەو خراپترین شوێن؟ من لە گرفتێك دەترسم کە خۆشی بەدواوە نێت، سەرزەنشتێك کە لێبوردنی بەدواوە نێت، دایکی بەسۆزی پێی گوت: ڕۆڵەکەم: ئیسراحەت بکە و کەمێك پشوو بدە، دەیگوت: دایە گیان منیش داوای پشوو دان دەکەم (لە ماڵەکەی ئەودیو) ئایا گرەنتی ڕزگار بوونم دەدەیتێ؟ گوتی: ڕۆڵەکەم ! ئەی کێ گرەنتی بداتە من کە ڕزگار دەبم؟ گوتی: کەواتە دەی وازم لێ بێنە لەوەی کە لەسەری دەبم، ئەی دایە گیان: وەك ئەوەی بەیانی خەڵکی ڕابکێشن بەرەو بەهەشت ومنیش بەرەو دۆزەخ، ئینجا دایکی لەشەوێك دا بەلای تێپەڕی ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە کە خوای گەورە دەفەرمووێ (فوربك لنسئلنهم اجميعن عما كانوا يعملون)[1]. واتە: سوێند بەخواکەی تۆ هەموویان پرسیاریان لێ دەکرێت بەتێکڕایی لەوەی کە کردوویانە لە ژیانی دنیادا.

ئینجا بیری لەو ئایەتە کردەوە گریا، وەکو مار خۆی دەجولاند تاکو لە

---

( ١) سوره الحجر ٩٢-٩٣






هۆش خۆی چوو، دایکی هات و بانگی کرد، وەڵامی نەدایەوە، گوتی: ڕۆڵەکەم گلێنەی چاوم! کوا گەیشتنمان بەیەکتر؟ بەدەنگێکی نزم ولاواز وەڵامی دایەوە گوتی: ئەگەر لەمەیدانی گردبوونەوە (ساحە المحشر) نەتدۆزیمەوە ئەوا بە خازینی دۆزەخ بڵێ ئەو دەمدۆزێتەوە، پاشان هاوارێکی کردو گیانی دەرچوو، دایکی هەستا بە شۆردن و کفن کردنی، ئینجا بانگی خەڵکی کرد و گوتی: خەڵکینە! وەرن نوێژ لەسەر کوژراوەکەی ئاگربکەن (قتیل النار) خەڵکی هاتن، هیچ کاتێك ئەوەندە قەرەباڵغ و فرمێسکیان نەڕشتوە وەك ئەو ڕۆژە[1].

## ٥٣٤- تۆبەی پیاوێکی دەشتەکی بەگوێ ڕاگرتنی یەك ئایەت

عباس ی کوڕی ابو الفرج ی الریاشی دەڵێ: گوێم لە اصمعی بوو دەیگوت ڕۆژێکیان چوومە مزگەوتی (الجامع) لە بصرە، لە ڕێگادا دەڕۆیشتم لەناکاو پیاوێکی فوول وشك ودەشتەکی بەدەرکەوت لەسەر وشترەکەی بوو شمشێرێکی لەلابوو، وەکەوانێکێشی بەدەستەوە بوو، لێم نزیك بوەوە سەلامی کرد و گوتی: ئەو پیاوە کێیە، یان لەنەوەکانیکێیە؟ گوتم: لەنەوەکانی (اصمع) گوتی: تۆی اصمعی؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: لە کوێ هاتیت؟ گوتم: لە شوێنی هاتووم کە کتێبی خوای گەورەی تێیدا دەخوێندرێنەوە، گوتی: بۆ خوا قسەی هەیە کە ئادەمیزاد بیخوێنێتوە؟!

---

( ١) کتاب التوابین، ابن قدامە المقدسی، لاپەڕە (١٩٦)



گوتم: بەڵێ، گوتی: دەی بیخوێنەوە هەندێك لەوەی كە لەلاتە بۆم، گوتم: دابەزە لە شوێنی خۆت ئەویش دابەزی، دەستم كرد بە خوێندنی سورەتی (الذاريات) كاتێ گەیشتمە ئایەتی (وفي السماء رزقكم وماتوعدون) [1].واتە: رزق و ڕۆزیتان لە ئاسمانە لەگەڵ ئەوەی كە بەڵێنتان پێ دراوە.

گوتی: ئەی اصمعی ئەوە كەلامی خوایە؟ گوتم بەڵێ، سوێند بەخوایەی كە محمدی بەحەق ناردووە، ئەوە كلامی خوایە بۆ پێغەمبەرەكەی (ﷺ)ناردووە، پێی گوتم: بەسە! پاشان هەستا چوو وشترەكەی سەربڕی و گوتی: وەرە یارمەتیم بدە بۆ دابەش كردنی گۆشتەكەی منیش یارمەتیم داو هەرچی دەهات و دەڕۆیشت پێمان دەدا، پاشان چوو كەوان و شمشێرەكەی پارچە پارچە كردن و لە ژێر بارەكەی دانان و بەرەو دۆڵێك ڕۆیشت هەردەیگوت: (وفى السماو رزقكم وماتوعدون) منیش هەر گازاندەم لە خۆم دەكرد و دەمگوت وەك ئەو دەشتەكییە ئاگاداری ئەو ئایەتە بوو پێی بەخەبەر هاتەوە من پێی بەخەبەر نەهاتمەوە، كاتێ لەگەڵ خەلیفە هارون الرشید چووینە مەكە بەمەبەستی حەج كردن لە كاتی (طواف) كردندا دەنگێكی نزم و لەسەر خۆم بیست، ئاوڕم دایەوە دەبینم هەمان كابرای دەشتەكی لەڕو لاوازو زەردە هەڵگەڕابوو، سەلامی لێم كرد و دەستی گرتم ولە پشت مەقامی ابراهيم ی دانیشاندم وپێی گوتم: دەی وەرە كەلامی خوام بۆ بخوێنەوە، منیش دەستم كرد بە خوێندنەوەی سورەتی (الذاريات) تاكو

---

( ١) سورة الذاريات (٢٢)

گەیشتمە ئایەتی (وفي السماء رزقكم وماتوعدون) هاوارێکی کرد و گوتی: بەدەستمان کەوت ئەوەی خوا بەڵێنی پێدا بووین بەڕاستی پاشان گوتی: جگە لەمە چی تر هەیە لە کلامی خوا؟

گوتم: بەڵێ خوای گەورە دەفەرمووێ: (فورب السماء والارض انه لحق مثل ما انكم تنطقون) واتە: سوێند بە خواوەندی ئاسمان وزەوی ئەمە شتێکی ڕاستەوەکو ئەوەی کە ئێوە قسە دەکەن، دیسان هاوارێکی تری کرد و گوتی: یا سبحان الله! کێ یە خوای تووڕەکردووە تاکو سوێند بخوات؟! ئایە بە ڕاستگۆی دانانێن تاکو وای لێدەکەن پەنا بۆ سوێند خواردن ببات؟ سێ جار ئەم قسەی لەسەر یەك گوت ئینجا گیانی دەرچوو [1].

## ٥٣٥- حجاج وحطيط

زانای پایەدار و شارەزاو حەق پێژ حطيط ی الزيات ڕەحمەتی خوای لێ بێت کە لەسەردەمی حجاج دەژیا، ڕۆژێکیان بەفەرمانی حجاج هێنایان لەبەردەم حجاج ی خوێن ڕێژیان ڕاگرت کاتێ چووە ژوورێ حجاج گوتی: تۆ حطيط؟

گوتی: بەڵێ، پرسیاربکە ئەوەی بۆت دەرکەوتووە چونکە من لەلای مقامی ابراهيم بەڵێنم داوە بەخوا لەسەر سێ شت :

١- ئەگەر پرسیارم لێکرا، ڕاست گۆبم لەوەڵامەکەی.

(١) كتاب التوابين، ابن قدامة المقدسي، لاپەڕە (٢٠٦)




٢-ئەگەر توشی نەهامەتی بەڵاو ناخۆشی هاتم، ئارام بگرم.

٣-ئەگەر لەش ساغ و دڵخۆش بم سوپاسی خوا بکەم.

حجاج گوتی: سەبارەت بە من چی دەڵێ وڕات چیە؟ گوتی: ئەوەت پێ دەڵێم: تۆ یەکێکی لە دوژمنانی خوا، قەدەغە کراوەکانی خوا دەشکێنی وبە چاوی سووك سەیری دەکەیت، وە خەلکی بەتۆمەت دەکوژیت بەبێ بەڵگەی ڕاست

حجاج گوتی: ئەی سەبارەت بە امیر المؤنین عبدالملك ی کوڕی مروان چ دەڵێی وڕات چییە؟

گوتی: ئەو تاوان وستەمی لە تۆ گەورەتربوە، تۆش تاوانێکی لە تاوانەکانی ئەو.

حجاج فەرمانی کرد کەوا عەزابی بدەن وبە جۆرەها عەزاب، بە ئاگر پشتی بسوتێندرێت تاکو دەگاتە گۆشت و ئێسکی، بەو شێوە هێنایان بۆ عەزابخانەکەی حجاج و ئەوەندە ئازاریان دا وە ئەوەندە گۆشتی سەر پشتیان برژاند، بەڵام ئەو هیچ دەنگی نەکرد بە حجاجیان گوت: بەسە وازی لێ بێنە ئەو لە ئاخیری هەناسەکانیەتی حجاج گوتی: بڕۆن فرێدەنە ناو بازاڕ.

ڕاوی بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە دەڵێ:

من و هاورێێ یەکی من چووێنە لای پێمان گوت: ئە حطیط ئایا هیچ پێویستێکت هەیە؟






گوتی: تەنها هەندێك ئاوم بدەنێ.

ئینجا ئاویان بۆی هێنا وخواردیە دەست بە جێ گیانی دەرچو شەهید بوو بەدەستی حجاج ی ستەمکار و خوێن ڕێژ لە تەمەنی هەژدە (١٨) ساڵاندا ڕەحمەتی خوای لێ بێت[1].

دەڵێن: حجاج لەدوای کوشتنی سعیدی کوڕی جبیر کەسی تری نەکوشتووە، چونکە شێخ حسن ی بصری زۆر ئامۆژگاری کرد کەوا چیتر پەلاماری زانایان نەدات، هەر بۆیە ئازاری یەکجار زۆر بوو کاتێ سعیدی کوشت وخوێنی بە ناحەق ڕشت، دەڵێن هاواری دەکرد لەبەر نەخۆشیەکانی پاشان بێ هۆش دەکەوت کە بە هۆش خۆی دەهاتەوە دەیگوت: ئای چیم لە سعید کرد بەو شێوە ئەمە لە ژیانە تاریکەکەی دووبارە دەبووە تاکو خوای باڵا دەست لە ناوی برد و بەهیلاك چوو.

بەڵام ابن عیینە دەڵێ: تەنها یەك کەسی لە دوای سعید کوشتووە (ئەویش.. حطیط ی زیات بوو، ڕەحمەتی خوای لێ بێ).

---

( ١) مواقف ایمانیە، الشیخ احمد فرید، لاپەڕە (٢٥٨)






## ٥٣٦- ئیمامی احمد ومەینەتی یەکانی

لەوکاتەی مەئموون ی کوڕی هاورن الرشید بانگی خەڵکی کرد بۆ فەتوا دانیان بەوەی کە قورئان مەخلووقە، زۆرینەی زاناو قازی یەکان وەڵامیان دایەوە و گوتیان: بەڵێ قورئان مەخلووقە، بەڵام ئەو فەتوا دانەش بەزۆری بوو لەلایەن خەلیفە، ئیمامی احمدی کوڕی حنبل وهەندێك لە خەڵك و زانایان لەسەر ڕای اهلی سونەت و جەماعەت بوون وەبەرگریان لە بیروڕای اهلی سونەت و جەماعەت دەکرد.

– ابو جعفر الانباری دەڵێ: کاتێ ئیمامی احمد یان هێنایە لای مەئموون، هەواڵیان پێدام ومنیش لە ڕوباری فورات پەڕیمەوە دەبینم وا ئیمامی احمد لە شوێنێك دانیشتووە لەوبەری فورات، سەلامم لێی کرد، گوتی: ها ئەی ابو جعفر ئازار درایت؟ گوتم نەخێر ئەوە ئازار نییە، وەپێم گوت :تۆ ئەمڕۆکە گەورە سەری خەڵکی، هەموویان اقتداء بە تۆوە دەکەن، سوێند بەخوا ئەگەر وەڵامی خەلیفە بدەیتەوە خەڵکێکی یەکجار زۆر هەمان وەڵامی تۆدەداتەوە، بەڵام ئەگەر وەڵام نەدەیتەوە وەبێ دەنگ بیت ئەوا خەڵکێکی زۆر وەڵام ناداتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر تۆ نەکوژێ ئەوا بەخۆت دەمری، مردنیش هەردەبێ، کەواتە ئەی احمد لە خوابترسە وەڵام نەدەیتەوە.

دەڵێ: ئیمامی احمد گریا و گوتی: ماشاءالله.. ماشاءالله، پاشان چووەلای مەئموون، هەواڵی پێدا کە خەلیفە دەتکوژێ ئەگەر نەڵێی قورئان مەخلووقە، ئیمامی احمد گوێی نەدایە ئەو قسانە و دوعای کردو بەرەو قاپی



خوا دەستی بەرز کردەوە، گوتی: خوایە نەهێڵی من و مەئمون پێکەوە کۆببینەوە قسە لەسەر ئەو شتە بکەین هەر لە ڕێگادا دەڕۆیشت پێش گەیشتنی بەمەئموون یەکسەر هات و هاواری گریان گەیشتە ئیمامی احمد کەوا مەئمون مردووە، وە مردنی مەئموون لە مانگی ڕەجب ی ساڵی ٢١٨ کۆچی بوو، ئینجا ئیمامی احمدیان ڕەوانەی بغدا کرد و لەوی بەندیان کرد، لە پاش مردنی مەئموون معتصم بالله بوو بە خەلیفە و ئیمامی احمدی ئازاردەدا وە ئامادەیدەکرد بۆ لێدانی ئینجا کە پێمان گەیشتووە لە ئازاردانی ئیمام ئەوەبوو کە معتصم ویستی ئیمامی احمد ئامادەب کات و خەڵکیکی یەکجار زۆر لە بەردەم دەرگای کوببونەوە وەکو ڕۆژی جەژن چاوەڕوانی ئیمامی احمدیان دەکرد بێت ئینجا ڕێگایان بۆی فەرش کردو کورسیان بۆی دانا لەسەری دانیشت، پاشان گوتی: احمدی کوڕی حنبل ئامادە بکەن و بیهێنن بۆ لام، ئەوانیش هێنایان، کاتێ لەبەرامبەری وەستا سەلامی لێ کرد، معتصم گوتی: ئەی احمد ! قسە بکە و مەترسە ئیمامی فەرمووی: سوێند بە خوا کاتێ هاتمە لای تۆ بەئەندازەی یەك دەنکە دانە وێڵە لێت نەترسام وترسم لە ناو دڵ نەبوو، معتصم گوتی: سەبارەت بە قورئان چی دەڵێ؟ ئیمام: کەلامی خوایە وقەدیمە مەخلووق نییە خوا دەفەرمووێ: (وان احد من المشركين استجارك فاجره حتي يسمع كلام الله) واتە: ئەی محمد ئەگەر کافرەکان هانایان هێنایە بەرتۆ و داوای پەنایان لی کردیت، پەنایان بدە و بیانپارێزە تاکو گوێ لەوتەکەی خوا دەگرن.. قورئانیش وتەو کەلامی خوایە، نەیفەرموو تاکوگوێ مەخلووقی خوا دەگرن.

معتصم: ئایا جگە لەو بەڵگەیە چیترت لەلایە؟

ئیمام: بەڵێ، خوا دەفەرمووێ: (الرحمن علم القران) نەك (خلق القران) چونکە (خَلَقَ وعلَّمَ) لێك جیان.

– هەروەها (یس، والقران الحکیم) نەك (والقران المخلوق) خوای گەورە ئەوهای فەرمووە

معتصم: بیگرن وبەندی بکەن ئینجا بەندکرا و خەڵکیش بلآوەی کرد

بۆ ڕۆژی دواتر لەبەیانیەکەیەوە معتصم وەکو جاران لەسەر کورسیەکەی داینشت وگوتی: (احمدی کوڕی حنبل)م بۆ بانگ بکەن دووبارە خەڵك کۆبووەوە، بغدا هاواری لێ هەڵدەستا لەبەر قەرەباڵغی کاتێ ئیمامیان هێنا بۆ معتصم شمشێرەکان لە کالآنیان هاتوونە دەر و تیرەکانیش ئەستێرەیان گرتبوو، قەڵغانەکانیش داندرابوون، معتصم پرسیاری لێ دەکرد سەبارەت بە قورئان کە چی دەڵێی و ڕات چییە؟

ئیمام دەفەرموێ: ڕام وایە و دەڵێم (القران کلام الله غیر مخلوق) قورئان فەرمانیشت ووتەکانی خوایە و دروست کراویش نییە.

معتصم: لە کوێت ئەو قسەیە هێنا؟

ئیمام احمد: حَدَّثَني عبدالرزاق عن معمر عن الزهري عن انس، وقال:، قال: رسول الله (ﷺ) (ان کلام الله الذي استخص به موسی مأة الف کلمة وثلاثمائة وثلاث عشرة کلمة، فکان الکلام من الله والاستماع من موسی) واتە:




عبدالرزاق بۆی باس کردم ئەویش لە معمر ئەویش لە الزهری، ئەویش لە انس کوڕی مالك کە دەفەرمووێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: (ئەو وتە خواییەی کە خوا موسی ی پێ تایبەت کردووە و پێ هەڵبژاردووە (١٣١٣) هەزارو سێ سەد و سێزدە وشەیە، قسە کردن و تەکلیم لە خواوەیە، گوێ گرتنیش لە موسی وەیە ئینجا ئیمام بە معتصمی گوت: ئەگەر ئەوە لە خواوە بێت کە قسە لەگەڵ موسی بکات ئەوا قورئانیش بەهەمان شێوە قسەو و وتەی خوایە.

- هیچ نەما تەنها ئەوە نەبێ کە هەموو زاناو شەرع زانی بۆ کۆکردنەوە و موناقەشەیان کرد لەگەڵی، لە ماوەی سێ دانە ڕۆژ، ئەویش هەر وەڵامی دەدانەوە وموناقەشەی لەگەڵ دەکردن بەڵگە بە هێزەکانی بەڕوویدا دەهێنان، دەیفەرموو: من پیاوێکم فێری زانستێك بوومە قەت شتی وا فێر نەبووم، ئەگەر شتێکتان لە قورئان وسونەت پێیە ئەوا پێم بڵێن تاکو قسەی پێ بکەم لەبەرامبەر معتصم.

هەرکاتێ موناقەشەیان لەگەڵ دەکرد وداوایان لێ دەکرد کە بڵێ قورئان مخلوقە، ئەویش دەیگوت: چۆن شتێك دەڵێم کە نەگوترابێ معتصم گوتی: بەڕاستی احمد ماندووی کردین.

ئەوانەی کە زۆر دژایەتی ئیمامی ئەحمەدیان دەکرد محمدی کوڕی عبدالملك ی زیات بوو کە وەزیری معتصم بوو هەروەها احمدی کوڕی دۆادی قازی وبشری المریسی چەندی تریش کە معتزلە بوو دەیانگوت قورئان






مخلوقه.

ئینجا ابن دؤاد وبشری المریسی به خەلیفه یان گوت: ئەوه کافره وگومڕایه بیکوژه تاکو ئێمەش ئیسراحەت بکەین لەدەستی، خەلیفه گوتی: بەڵێنم بەخوا داوەکه به شمشێرنەیکوژم وفەرمانیش بەکەس نەکەم که به شمشێر بیکوژن دوو معتزلەکان گوتیان: به قامچی لێی بده، گوتی: ئەی احمد سوێند به خزمایەتیم لەگەڵ پێغەمبەر یان ئەوەتا ئەوه دەڵێ که من دەیڵێم یان به قامچی لێت دەدەم، بەڵام ئیمام لەوه نەترساو گوێ نەدایه لێدان، معتصم گوتی: جەلادەکان ئامادە بکەن، جەلاد هاتن یەك یەکه پێی گوتن: به چەند قامچی ی دەمرێ؟ گوتی: به دەقامچی، گوتی: بیگره و بیبه لای خۆت، ئیمامیان له ناو بەرگ و پۆشاکی خۆی هێنایه دەرو دوو گوریسی نوێیان لەدەستەکانی کردن و توند بەستایان، کاتێ قامچیان بۆی هێنا سەیری کرد گوتی: یەکێکی ترم بۆ بێنن پاشان قامچیان بۆی هێنا سەیری کرد گوتی: یەکێکی ترم بۆ بێنن پاشان به جەلادەکانی گوت: بەرەو پێشروه بڕۆین˝ کاتێ یەك قامچی لێ دەدا، ئیمام دەیفەرموو: بسم الله، قامچی دووەم، لا حول ولا قوه الا بالله، قامچی سێ یەم ! القران کلام الله غیر مخلوق، قامچی چوارەم: (قل لن یصیبنا الا ماکتب الله لنا) [1]، واته: ئەی پێغەمبەر بڵێ هیچ بەڵاو نەهامەتێکمان بەسەردانایەت تەنها ئەوه نەبێ کەخوا بۆی نووسیوین.

---

(١) سوره التوبه (٥١)



ئینجا پیاوی وا هەبوو لە جەلادەکان دەچووە پێشەوە دووقامچی لیٚ دەدا معتصم زیاتر هانی دەدان لەسەر لێدانی بە ئازارتر، کاتیٚ نۆزدە (١٩) قامچی لێدان معتصم چووە لای پێی گوت: ئەی احمد بۆ چی خۆت دەکوژیت؟ سوێند بەخوا بەزەییم پێت دادێتەوە.

ئیمامی احمد دەڵیٚ: پیاوێك هات وبەدەسکی شمشێرەکەی تێهەڵدام و گوتی: دەتەوێت بەسەر ئەو هەموو خەڵکەوە زاڵ بیت؟ وەهەندێکش دەیانگوت: هاوار بۆ خۆت وا خەلیفە لەسەر سەرت وەستاوە، هەندێکیش لەولاوە هاتن گوتیان: ئەی امیر المؤمنین خوێن لە ملمان بیکوژە، هەروەها کۆمەڵێکیش دەیانگوت: ئەی امیر المؤمنین، ئەو بە ڕۆژووە تۆش لەبەر ئەو خۆرە وەستاویت.

ئیمامی احمد دەڵیٚ: پێی گوتم: هاوار بۆخۆت یا احمد چ دەڵێی؟

گوتم: شتێکم بدەریٚ لە قورئان وفەرموودە با قسەی پیٚ بکەم خەلیفە گەڕایەوە پاشان بە جەلادەکانی گوت: بۆ پێشەوە، ئێنجا هانی دان لەسەر ئەوەی کە بە برسیەتی لێی بدەن، ئینجا چووە لای پێی گوت: هاوار بۆ خۆت ئەی احمد وەڵام بدەروە.

دەڵیٚ: دەهاتنە لام یەك یەکە داوایان لیٚ دەکردم دەیانگوت، ئەی احمد پێشەواکەت وا لەسەر سەرت وەستاوە پێیان دەگوت: ئەگەر یەکێك لە هاوەڵانت ئەوەای بکردایە چیت لیٚ دەکرد، معتصم پێی دەگوت: بەسە ئەی احمد وەڵامێکم بدەروە بەڵکو بچوکترین خۆشیت بۆ دێت تاکو لە دەستم




بەڕەڵلا بێت.

منیش دەمگوت: ئەی امیر المؤمنین: بەڵگەیەکم بۆ بێنە لە قورئان و فەرموودە تاکو وەڵامت بدەمەوە، معتصم گەڕایەوە شوێن خۆی دانیشت وگوتی: بەجەلادەکان بۆ پێشەوە، ئینجا بە فەرمانی خەلیفە جەلادێك دەهات و دوو قامچی لی دەدام وملی بۆ خەلیفە کەچ دەکرد، وەکو پێشتر زۆر هانی دەدان لەسەر توند لێدانم، هەر دەیگوت: چاك ببیەستنەوە دەك خوادەستان ببڕێ (بەجەلادەکانی دەگوت) ئیمام دەڵێ لەوکاتەدا عەقلم نەما و هۆشم ڕۆیشت، دوای کەمێك بەهۆش خۆم هاتمەوە، دەبینم پەت و حەبلەکان لە دەستەکانم کراونەتەوە، پیاوێك لەوێ بوو گوتی: ئێمە بەسەر دەم و چاوت کەویتن و پارچە بەڕێکمان فڕێ دایە سەر پشتت ولاشەمان پیس کردیت، گوتی: ئاگام لە هیچ نەبووە، هەندێ وردە ئاردی گەنم وجۆم بۆ بێنن، گوتیان: بیخورەوە و دواتر خۆت بڕشێنەوە، گوتی: نەخێر ڕۆژووەکەم ناشکێنم، پاشان بمبەن بۆ ماڵی (اسحاق ی کوڕی ابراهیم) ئینجا کاتی نوێژی نیوەڕۆهات و ابن سماعە پێش کەوت ونوێژی کرد، کاتی سەلامی نوێژی دایەوە وپێی گوتم: نوێژت کرد کەچی خوێن لەلاشەت دەچۆڕایەوە، گوتم: قەی چییەکات (عمر)یش نوێژی دەکرد و خوێن لەلاشەی دەچۆڕایەوە.

ئینجا کۆتایی بە خەلافەتی معتصم هات، (واثق باللە) کە ناوی ابو جعفر هارون ی کوڕی معتصم بوو بە خەلیفە لە دوای معتصم دانیشت لە ساڵی (٢٢٧)ی کۆچی مانگی ربیع الاول بەڵام واثق هیچ ئازارێکی ئاراستەی ئیمام نەکرد وتەنها ئەوە نەبێ پێی گوت: لێرە کۆچ بکە، هەندێك دەڵێن: پێی






گوت: نابیّ لە مالّ بیّتە دەر، ئینجا خۆی ون دەکرد لە هەندیّ شویّنی جیاواز پاشان دەگەڕایەوە مالّی، و دوبارە خۆی دەشاردەوە تا ئەو کاتەی (واثق) یش مرد.

ئینجا لە دوای ابو جعفر هارون کوڕی معتصم (الواثق).. (متوكل) دانیشت لەسەر پۆستەکە کە ناوی ابو الفضل جعفری کوڕی معتصم بوو، واتە ئەویش کوڕی معتصم بوو برای واثق بوو.

ئەویش لە سالّی (٢٣٢)ی کۆچی بووە خەلیفە، بەلاّم پیّچەوانەی بریارو ڕاوبۆچوونی (مەئموون و معتصم و واثق) هەلّس و کەوتی دەکرد و لە بیرو باوەڕ (العقیدە) وەك ئەوان نەبوو، هەرکەسیّ قسەی لە خەلقی قورئان بکردایە لیّ دەدا، وە بڕیاری دانابیّ کەس لەو بارەویە موناقەشە و موجادەلە بکەن، وەسزای تایبەتی بۆ دانان، هەروەها فەرمانی کرد هەرکەسیّ فەرمودە بگێڕیّتەوە با خۆی بەدەر بیّخیّ و یارمەتی دەدا، ئینجا بوو بە هۆکار و یاریدەدەر بۆ بلاّوکردنەوەی سونەت و لەناو بردنی بیدعە، وەبەڕاستی ئەو تاریکی و ستەمەی لەسەر خەلّکی ولابرد و دنیای ڕوناکی پیّ نیشان دان، وەهەرکەسیّ بەندکرابایە لەبەر قەزیەی خەلّقی قورئان هەموی بەڕەلّلاکردن ناخۆشی ومەینەتی لەسەر خەلّکی لادا بەجاریّ.

خوای گەورەش تۆلّەو ئینتقامی وەرگرتەوە لەوانەی کە کیّشەیان بۆ پیّشەوا احمدی کوڕی حنبل دروست دەکرد وهەولّیان دەدا بۆ لەناو بردنی، وەخوای گەورە سەر شۆڕی کردن و بەهیّزو توانای خۆی وبەرەکەتی قورئان






وسونەت ئیمامی احمدی سەرخست، ئینجا خەلیفە (متوكل) پرۆژەیەكی تایبەتی دانا بۆ ئەوەی چاكە بكات لەگەڵ ئیمامی احمد.

ئیمامی احمد گریا گوتی: لەوەتەی شەست (٦٠) ساڵە سەلامەتم لەدەست ئەوانە كەچی لە كۆتایی تەمەنم تووشی بەڵایان كردم، خوای گەورە ڕەحم بە پێشەوای ئێمە و هەموو دنیابكات، لەوكاتە كە لە نێو ئاگری عەزاب هاتە دەر وەك زێڕی سووری لێ هاتبوو،

كە تاقی دەكرێتەو بە بەڵاو نەهامەتی، ئارام دەگرێ، وەبەخۆشی و شادی سوپاسی خوا دەكات، ئەو هەڵوێستە ئیمانیە بەڕاستی وامان پێ نیشان دەدا كە وا ئیمام وەك شاخێكی نەجووڵاوبوو لە ئاست بەلاو ناخۆشی و ئارامی یەكانی، كە هەموو ناخۆشی و دەردەسەری بەسەریدا دەشكێنەوە، وە نموونەیەكی یەكجار گەورە و مەزن بوو بۆ ئێمە تاكو لەسەر ڕێگای سونەت و بەرنامەی پێغەمبەر (ﷺ)جێگیربین، ابو علی بن المدینی دەڵێ: خوا ئەو ئایینەی بەهێز كرد بە هۆی دوو كەس كە سێ یەمیان نەبووە: ابو بكری صدیق لە ڕۆژی هەڵگەڕانەوە وەئیمامی احمدی كوڕی حنبل لە ڕۆژی تووش بوونی بە بەڵاو نەهامەتی.

- بە بشری حافیان گووت: بۆ ناچی وەك ئیمامی احمد بڵێت بەرامبەر بە كاربەدەستان وستەمكاران؟

گوتی: ئایا دەتانەوێ هەستم بە پلەی پێغەمبەران ڕەفتار بكەم، كە بەڕاستی كارو هەڵوێستی ئەوانە نەك من.






چەند جوانە ئەو هەڵوێستە ئیمانیە لە خۆگری ئارامی لەسەر حەق، سەیرکە چۆن ئیمام بیرو بڕوای (العقیده) ی ڕاستی پاراست بۆ ئەو ئوممەتە، چۆن لە خۆی و لە تەمەنی هاتەدی تاکو ئەوکاتەی لە ژێر سێبەری بیرو بڕوای اهلی سونەت و جەماعەت حەسایەوە، کە بەڕاستی عەقیدەیەکی سپی و بێ گەرد بوو، هەروەکو پێغەمبەر بۆ ئێمەی بەو شێوە بەجێهێشتووە، ئیمامیش شایەنی ئەو نازناوە جوانە یەکە پێی بڵێن (امام اهل السنه) لەبەر ئەو هەڵوێستە گەورە و پڕ لە باوەڕە، خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات و پارداشتی لە ئوممەتی پێغەمبەر و عەقیدەکەی بداتەوە بە جوانترین پاداشت[1].

## ٥٣٧- هەندێ لەوتە بەنرخەکانی ئیمامی ( علی ) رضي الله عنه )

ئیمامی (علی) کوڕی ابو طالب (رضي الله عنه) دەفەمووێ :

-هەرکاتێ خوا ویستی کەسێ زەلیل وزەبون بکات، ئەوا بێ بەشی دەکات لە زانست و زانیاری.

- ئەگەر نوێژە سونەتەکان زیانی گەیاند بە نوێژە فەرزەکان، وازی لێ بێنن.

- هەرگێز هاوڕێتی پیاوی ئەحمەق و بێ عەقل نەکەیت، چونکە هەڵس و

---

( ١) مواقف ایمانیه، الشیخ احمد فرید، لاپەڕە(٢٥٩) دار طیبة چاپی پێنجەم ٢٠٠٦ ز






کەوت و ڕەفتاری خۆی بۆت جوان و ڕازاوە دەکات، ئینجا حەز دەکات کە تۆش وەك ئەو بیت.

– خەڵکی نەوەکانی دنیان، لۆمەیش لە هیچ کەسێك ناکرێ کە دایکی خۆی خۆش بوێت.

– هەرکەسێ داوای شتێك بکات، ئەوا پێی دەگات، یان نیوەکەی

– قسە بکەن دەناسرێن، چونکە پیاو وەك گەنجینەی شاراوە وایە لە ژێر زمانی دا.

– کەسێك بازرگانی بکات بەبێ شارەزابوون لەشەرع، ئەوا بەڕاستی کەوتۆتە نێو ریبا.

– کەسێك بەڵایە بچوکەکان بەگەورە سەیربکات (واتە: ناڕەحەتی و واوەیلای لەسەر بکات) خوا تووشی بەڵای گەورەی دەکات.

– هەرکەسێك یەك گاڵتە بکات ئەوا بەشێك لە عەقلی فرێ دەدرێت.

– دووکەس سەبارەت بە من لەناو چوون کەسێك زۆری خۆش ویستم و زێدەڕۆیی کرد لەوخۆشەویستی، وەکەسێك زۆر ڕقی لێم بێ وقسە بکات لە دژی من.

– لە هەموو تاوانێك بەهێز ترو گەورەتر ئەوەی کە خاوەنەکەی بە بچوکی دەزانێ.

– دووئارەزوو مەند هەرگیز تێر نابن، قوتابی زانست و زانیاری هەرگیز






لە زانست تێرنابێ، داواکەری ماڵی دنیا، هەرگێز تێرنابێ لە کۆکردنەوەی ماڵی دنیا.

– هەرکەسێك بیر لە درێژی سەفەر بکاتەوە، خۆی بۆ ئامادە دەکات[1].

## ٥٣٨- ٢٥ئامۆژگاری بۆ تۆبەکاران

بزانە کە تۆبە کردن وەزیفەی تەمەنی مرۆڤە، بۆ پیاوان و ئافرەتان چەند جوانە کە تۆبە کردن لێمان دانەبڕێت، ئەمەش گرنگترین ئامۆژگاری و وەسیەتە بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێ جێگربن لەسەر تۆبە و ڕەفتار کردن بەرنامەی خوا و سونەتی پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ)تاکو گەیشتنمان بە خوای گەورە.

١- سوپاسی خوا بکە کە تۆبەی پێ بەخشیت وگیانی لێ نەسەندیتەوە لەسەر گوناهو تاوان، (فلولافضل الله عليكم ورحمته لكنتم من الخاسرين)[2].

٢- بزانە کە تۆ مرۆڤێکی مردوو بوویت، بەڵام خوا زیندووی کردیتەوە بە نووری هیدایەت وگەڕانەوەت بۆ لای ئەو.

٣- ئایا دەزانی کە خوای گەورە چەندە دڵخۆشە بە تۆبەکەت لەگەڵ

---

( ١) نهج البلاغة للامام علي (كرم الله جهه) بشرح الشيخ محمد عبدة مؤسسة الخراسان للمطبوعات

(٢) سورة البقرة (٦٤)



ئەوەشدا هیچ پێویستی بەتۆبەی تۆنییە، لەوبەندەیە دڵخۆشترە کە لە شوێنی چۆڵ وشترو بارگەکەی لێ ون بووە، هەمو پێداویستی وخواردن و خواردنەوە شتی لەسەر و شترەکەیە تەواو لێی بێ ئومێد بووە وچاوەڕوانی مردن دەکات، لە ناکاو بارگەو بارەکەی دێتەوە بەرامبەری زۆر دڵخۆش دەبێ وهەڵە دەکات لەبەر دڵخۆشیەکەی دەڵێ ئەی خوایە من خوای تۆم و تۆش بەندەی منی.

٤- ئایا دەزانیت کە خوای گەورە بەهۆی تۆبەکەت هەموتاوانەکانت بۆ بە چاکە دەگۆڕێ.

٥- ئایا دەزانی ئێستا تۆ لەوکەسانەی کە خوا خۆشی دەوێن (ان الله يحب التوابين ويحب المتطهرين).

٦- لە تۆبە کردنەکەت ڕاست گۆبە، ئەگەر ڕاست گۆیی بنوێنیت لەگەڵ خوا لە تۆبەکردن خوای گەورەش بەڕاست گۆت دادەنێ، هەروەها بیر لەو کەسە بکەرەوە کە سەد نەفەری کوشت پاشان تۆبەی کرد، لە فەرمودەی صحیح دا هاتووە.

٧- خۆت بە دووربگرە لە هاوڕێ خراپ و لەگەڵیان دامەنیشە و ژمارەی تەلەفۆنەکانیان لەناو دڵ و دەروون و موبایلەکەت بسەڕەوە، وەئەوەی بەهۆی ئەوان بەبیرت دێتەوە لە دڵت دەربکە، چونکە ئەمە ژەهری بکوژە.

٨- زۆر دوعاو پاڕانەوە ئەنجام بدە بۆ ئەوەی خوا بەردەوامیت پێ بدات لەسەر تۆبەکەت و خواپەرستی یەکەت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ)زۆر ئەو




دوعایەی دەکرد ودەیفەرمو (یا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك) صحيح رواه احمد.

٩- هەمیشە لایەنی خۆشی و شادی وفراوانی ڕەحمەت و لێخۆشبوونی خوا بێنە پێش چاوانت، وەبیر لەلایەنە مەترسیدارەکە مەکەرەوە.

١٠- ئەوەی لە پێشتر ئەنجامت داوە خۆتی لێ بە دووربگرە، لە وێنە و گۆڤارو ژمارەی تەلەفۆنی ئافرەتان و کاسێتی ڤیدیو... مەگەر شتێك نەبێ کەباس لە ئاین و بەرژەوەندی ئاین بکات، وەکو کەناڵە ئایینی یەکان و گۆڤارو کتێب و..

١١- هەمیشە هەست بەوە بکە کە تۆبەکەت ناتەواوە و کەمترغەمی تێدایە، بۆ ئەوەی هەوڵ بدەیت زیاتر بەردەوام بیت لەسەری.

١٢- سەرەتا هەست بەنارەحەتی و ئازارێکی زۆر دەکەیت لەواز هێنانت لە گوناهوتاوان بەڵام بیر لەوە بکەوە کە خوا دەفەرمووێ (ومن يتوكل على الله فهو حسبه)[1]،واتە: کەسێ پشت بە خوا ببەستێ خوا بەسە بۆ ئەو کەسە، کە کاری بۆ ئاسان بکات.

١٣- دەبێ ئەوە بزاینت کاتێ خەڵکێکی خراپ و بێ دین دەبینیت نابێ بەهۆی کردەوەکانیان سارد بیتەوە، چونکە کۆمەڵگا هەموو جۆرەکەسانێکی تێدایە.

---

( ١) سورة الطلاق (٢)



١٤- بەرنامەی ژیانت بگۆڕە لەیەکەم ساتی تۆبەکردنت، لە هەڵس و کەوتی جوانی و بەجێ لەگەڵ مالّ و خێزان و دراوسێ و هاوڕێکانت، بۆ ئەوەی خەڵکی ئاسەواری تۆبە بناسن لە ڕوخسارت.

١٥- لە تۆبە کردنەکەت هەوڵ بدە زۆر هیمەت بەرزبە، قەت مەڵێ من ناتوانم شەو هەڵبستم وە ولە هەموو مانگێك سێ ڕۆژ بەڕووژوو بم، بەڵکو هەوڵ بدە تاکو دەتوانی بەدوای کرداری پڕ لە پاداشت بگەڕێی.

١٦- بەردەوام بە لەسەر نوێژە فەرزەکان لەمزگەوت لەگەڵ ئیمام، هەروەها هەوڵ بدە نوێژە سونەتەکانیش لە ماڵەوە بکە، ئینجا بزانە کە بەهەر هەنگاوێك بۆ مزگەوت چاکەیەکت بۆ دەنوسرێت، وەهەرجارێ کە دەچێتە مزگەوت پلەیەکت بۆ بەرزدەبێتەوە، وەخوای گەورە بۆت دەکاتە ڕوشنایی لە قیامەت لە جیاتی ئەوتاریکی یەی کەپێیدا دەڕۆیشتیت بۆ مزگەوت لە دنیادا.

١٧- خۆت شارەزا بکە لە ژیان و کەسایەتی پێغەمبەر هاوەڵانی، بۆ ئەوەی بزانیت کە ئەوان لەگەڵ خوا چۆن بوون وەلە گەڵ خەڵکی ڕەفتاریان چۆن بووە.

١٨- بۆی هەیەلەوکاتەی تۆبەت کرد هەندێ لە خزمان وهاورێ و هاوکارانت گاڵتەت بێ بکەن وپێت بڵێن دەتبینین دەچیتە مزگەوت و نوێژ دەکەیت و خۆت لێمان شاردۆتەوە، ئەوا بەهیچ جۆرێ وەڵامیان مەدەرەوە و بیر لەو خەڵکە بکەرەوە کە چەند گاڵتەیان بە پێغەمبەرانی خوا کردووە




کەچی هیچ سارد نەدەبوونەوە و هیمەتیان هەمیشە لەبەرزی دابوو.

١٩- سەردانی ئەو شوێنانە بکە کە دڵت نەرم دەکات و مردن و قیامەتت دەخاتەوە بیر وەکو گۆڕستان و سەردانی نەخۆش و..

٢٠- ئەگەر بتوانیت سەردانی ماڵپەڕی سایتە ئایینی یەکان بکەیت و سەیری کتێب و شتی بەسوود بکەیت و گوێ لە ئامۆژگاری چاك بگریت ئەوا شتێکی چاکە.

٢١- زۆر هەوڵ بدە خواپەرستی بەتەنیا بکە لە بەڕۆژووبوون و شەونوێژ خێرو سەدەقەو دوعای بەکوڵ وسەردانی خزمە نزیکەکانت بەتایبەت دایك باوکت، داوای دوعایان لێ بکە.

٢٢- کاتەکانت بەشتی بەسوود بەسەر بەرە وەکو: لەبەر کردنی قورئان بە رنامەی پەروەدەیی وشارەزابوون و داواکردنی زانست و زانیاری هەوڵ بدە کاتت بە فیڕومەدە.

٢٣- هاورێکی چاك و ڕاست گۆ بۆ خۆت بدۆزەوە، بۆ ئەوەی یارمەتیت بدات لە سەر شارەزا بوونت لە ئایین، ئینجا بزانە کە مرۆڤ لەسەر ئاینی هاورێکەیەتی

٢٤- خۆشەویستی دنیا لە دڵت فرێ بدە، بەهۆی ناسینی دنیاکە چۆنە وچەندە بێ بەهایە، چونکە بە خۆشەویستی دنیا دڵت چۆڵ دەبێ لە خۆشەویستی خواو پێغەمبەر (ﷺ)






٢٥- پێویستە بۆ پرس و ڕاکردن وشارەزا بوونت مامۆستایەکی چاك و دڵسۆزو خاوەن تەجرەبە و لە خوا ترس بۆ خۆت هەڵبژێری تاکو گیرو گرفتەکانی خۆتی لەلاباس بکەیت و ببێت بە چاوساغ ودەردەکانت سارێژ بکات، هەوەها لەوکاتانەی کە دلت ڕەق دەبێ وزیاترهانت دەدات بۆ کاری چاکە و بەردەوام بوونت لەسەر تۆبە.

## ٥٣٩- سوجدەیەك لە ژێر ئاودا

گەنجێکی تەمەن نۆزدە (١٩) ساڵان دەڵێ: من لەسەردەمی گەنجێتیم دا، وا گومانم دەبرد کە ژیان تەنها ماڵ وسامان پارەیە وەتەنها هەبوونی سەیارە و خاوو..

لە ڕۆژی هەینی دا وەکو نەریتی پێشووم لەگەڵ هەندێ لە هاوڕێ خراپەکانم دانیشتبووین لە کەنار دەریادا لەناکاو دەنگی بانگم بیست

حي على الصلاة.. حي على الفلاح.

سوێند دەخۆم بە درێژایی تەمەنم دەنگی بانگم بیستوە بەڵام هیچی لێ تێنەدەگەیشتم ونەمدەزانی مانای (حی علی الفلاح) چییە.

شەیتان مۆری لە دلم دابوو، وشەکانی بانگ لەلام وادەردەکەوتن کە هەرگیز لەمانایان تێنەگەم.

خەڵکی لە دەورمان بەرماڵی نوێژیان ڕادەخست وکۆدەبوونەوە بۆ نوێژ



ئێمەش خۆمان ئامادە دەکرد و پێداویستی مەلەوانی و هەواو ئۆکسجینی ناو دەریامان ئامادە دەکرد، بۆ گەشتێ: بۆ ژێر ئاو.. پۆشاکی غەواسیمان پۆشی چوینە نێو نێودەریا، لە کەنار بەدوورکەویتن تاوەکو گەیشتین بەناو زگی دەریادا،

هەمو شتێك تەواو بوو، بە دڵی ئێمە بوو، گەشتەکەمان گەشتێکی جوان بوو.

لەناکاو ئامێری مەلەوانی (غەواسی) لە کارکەوت، ددان و لێوەکانی پارچە پارچە بوون، ئەمەش هۆکار بوو بۆئەوەی ئاو بڕوات بۆ ناو دەم و زگمان، هەوڵم دا بە لووتم هەوا وهەناسە هەڵمژم ئەویش لەکارکەوت وئاوی سوێر چووە نێو دەمارو سیەکانم، نزیك بوو دەمردم، هەوڵم دەدا هەناسە هەڵکێشم و هاوارم دەکرد چ هەوایەك.. جوولەم دەکرد.. دەریاش تاریکە و هاوڕێکانیشم لێم دوورن.

بیرم لەوە دەکردەوە کە لەوپەڕی ترسناکی دامە.. من دەمرم.. دەستم کرد بەهاوارکردن.. ئاوی سوێریش دەچووە ناو زگم.. ژیانی ڕابردوم هەموی هاتە پێش چاوم چیم کردووە لە ڕابردوودا لەگەڵ یەکەم هاوارم دا زانیم کە بێ هێزم.. چەند دڵۆپێکی ئاوی سوێر خوا بەسەرمنی زاڵ کردووە، بۆ ئەوەی پێم نیشان بدات کە ئەو بەهێزو بەتوانایە.. دڵنیابووم کە هیچ پەناگەیەك نییە جگە لە خوا بەپەلە هەوڵم دا بێمە دەرەوە لەناو ئاو، بەڵام لە قوڵایی ئاودا بووم ونەمتوانی گرفت نییە من دەمرم، بەڵکو ئەمە ماڵ و ێرانی

یە کە چۆن دەگەم بە خوا کاتێ پرسیارم لێ دەکات لە کردەوەکانم.. دەبێ چی بڵێم؟

ئەوەی کە لە خۆم دەپرسیەوە نوێژ بوو کە چی بەزایەم دابوو، هاتەوە یادم کە شایەتومان بێنم، بۆ ئەوەی دوا وتەم بێ لە ژیانمدا، دەمگووت اشهد.. گەرووم دەگیرا وەك دەستێکی شاراوە لەسەر گەردنم دابنێن وابوو کە نەیدەهێلا شایەتومان بێنم.. جارێکی تر هەوڵم دا اشهد.. اشهد.. دڵم هاواری دەکرد، خوایە بمگێرەوە سەر دنیا، یەك کاتژمێر.. یەك خولەك.. یەك چرکە.. بەڵام دووورە.. هەستم بەهیچ شتێك نەدەکرد تاریکێکی زۆر سەیر دەوری دام، ئەمە دواین شت بوو کە بیرم لێی دەکردەوە نێو سینگم جارێکی تر، تاریکی نەما، چاوم کردەوە دەبینم یەکێ لە هاورێیانم لووتێکی هەواوی بۆ بەستام لە دەمم، هەوڵی هەناسەدانی لەگەڵ دەدام، ئێمەش هەر لەناو دەریادا بووین، خەندەیەك هاتە سەر لێوەکانم، تێگەیشتم کە من حاڵم باشە، دڵم هاواری کرد زمانم.. هەموو ماسولکەکان وخانە کانی لاشەم، اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمد رسول الله، الحمدلله.

کە هاتمە دەروە لە نێو ئاو من مرۆڤێکی تربوم، هەستم کرد تێروانیم بۆ ژیان بەتەواوەتی گۆڕا، ڕۆژەکان بەسەرمدا بەیانیان دەکردەوە لە خوایان نزیك دەکردمەوە، زانیم نەهێنی بوونم لە ژیاندا هەیە، بیرم لە وتەی خوا کردەوە کە دەفەرموێ (من جنوکە و ئادەمیزادم دروست نەکردوون تەنها بۆ خواپەرستی وبەندایەتی نەبێ) بەڵێ ڕاستە، دروست نەکراوین بە شتێکی بەزایە چوو بێ مانا، چەند ڕۆژێك تێپەڕی بیرم لەو ڕووداوە کردەوە، چوومە



سەر دەریاکەوە، بەرگ وپۆشاکی غەواسیم لەبەرکرد و بەرەو ئاوی دەریا دابەزیم، بەتەنیام.. چوومە هەمان شوێن لە نێو زگی دەریادا (لەو شوێنەی کە تێدا تووشی ڕووداوەکەبووم) سوجدەیەکم بۆ خوا برد، لەنێو دەریادا هەرگێز لە ژیانمدا سوجدەی ئەوها بە چێژم نەبردووە بۆ خوا، لە شوێنیك کە گومان نابەم کەس لەوشوێنانە لە پێش من سوجدەی بردبێ بۆخوا، بەو ئومێدەی کە ئەو شوێنە لە ڕۆژی قیامەتدا شاهیدیم بۆ بدات، خوای گەورە ڕەحمم پیێ بکات بەو سوجدەیە لەناو قوڵایی دەریادا.

ئومێدەو وارم ئەو بەسەرهاتە ببێتە جێگای پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەو کەسانەی گوناهو تاوان دەکەن واش گومان دەبەن کە خوا نایانبینیت[1].

## ٥٤٠- بەهۆی زانستی میرات موسلمان بوو

ئەمە بەسەر هاتی مامۆستایەکی مصری یە کە لە یەکێك لە زانکۆیەکانی (امریکی) کاردەکات، دەرچووی بەشی قانوونە لەگەڵ مامۆستایەکی جوولەکە دەڵێ: ئێمە لە وتووێژێکی قانونی بووین یەکێك لە مامۆستایانی قانوون کە جوولەکە بوو، دەستی کرد بە قسە کردن و باس کردن لە ئیسلام و موسڵمانان، منیش ویستم بێ دەنگی بکەم، پرسیارم لێ کردی ئایا تۆ قەبارەی قانوونی میرات دەزانی لە دەستووری امریکی؟

---

(١) تبت الی الله – یوسف الحاج احمد لاپەرە (٣٩٥)






گوتی: بەڵێ، زیاتر لە هەشت دانە بەرگ دەبێ گوتم: ئەگەر یاسایەکی میراتت بۆ بینم کە زیاتر نەبێ لە دە (١٠) دێر، ئایا باوەڕ دەکەیت کە ئاینی ئیسلام ئاینێکی راستە؟

گوتی: شتی وا نابێ منیش هەستام ئایەتەکانی میراتم بۆی هێنا لە قورئانی پیرۆز لە پێشم دانا، دوای چەند رۆژێك هاتەوە لام و پێی گوتم: ناگونجێ بۆ عەقلی بەشەر کەوا بەوشێوەیە هەموو پەیوەندی وخزم گەری ئەژمار بکات کە هیچ کەسێکیش لەبیر نەکات، واتە: ئەمە لە توانای مرۆڤدا نییە کەبەو شێوە هەمووی باس بکات و کەسیش فەرامۆش نەبێ، پاشان ماڵەکە دابەش بکات بەسەریان بەودادپەروەرییە کە هیچ کەسێك ستەمی لێ ناکرێ.

پاشان موسڵمان بوو بەهۆی ئەو موعجیزە خواییەی کە مێشکی مرۆڤی ڕاگرتووە، وەبەهێزەکانی لە ئاستی بێ هێزو توانابووینە.

ئەمە بەتەنیا ئایەتەکانی میراتە کە دەبێتە ڕێگایەك بۆ ئیقناع کردنی ئەو مرۆڤە جوو لەکەیە بۆ هاتنی بۆ ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلام [1].

(١) تبت الى الله يوسف الحاج احمد، لاپەڕە (١٨٨)



## ٥٤١- سفيان الثوري و ابو جعفري المنصور

سفيان الثوري دەفەرمووێ: منيان برد بۆ لای خەليفە ابو جعفر لە (مينا) پێم گوت: لە خوابترسە ! چونكە تۆ بەڕاستی ئەوپلەيەت پێدراوە وگەيشتيتە ئەو شوێنە پيرۆزە وەهاتی بۆ ئەو شوێنە بەشمشێری موهاجير وئەنصاريەكان، منداڵەكانيشيان لەبرسان دەمردن، عمری كوڕی خطاب هاتە حەج تەنها پانزە دیناری خەرج كردن، دەچوو لەژێر سێبەری درەخت دادەنيشت، خەليفە گوتی: بێگومان تۆ دەتەوێ من وەك (عمرم)بم؟

سفيان گوتی: گوتم وەك من مەبە، بەڵكو وەكو كەسێك بە كە جگە لە خۆت بێ وەلەسەرەوەی ئەوپلەيەكە من لەسەری دامە، (واتە: نەوەك من بە نەوەك خۆت) دەڵێ: كاتێ ئەوەم بۆی باس كرد گوتی پێم: برۆ دەروە..

-سفيان لە هەمو كەس لە زانا و خواناساندا زياتر سوور بوو لە سەر ئەوەی كە نەچێتە لای كاربەدەستان وستەمكاران وەنەوەستێ لەبەر دەرگايان، چونكە دڵنيايە لەوەی كە بەو جۆرە شتانە توشی زيللەت وبێ ڕێزی دەبێ لەلايان، ئەگەر بە زۆريش بيبەن ئەوا هەميشە زمانی ناوەستێ لە قسەو ئامۆژگاری حەق.

- دەڵێن: جارێك ابو جعفری منصور وسفيان گەيشتن بەيەكتر لەكاتی طواف كردندا، سفيانيش نەيدەناسی، دەڵێ: ابو جعفر شەقەيەكی لە پشتی سفيان دا پێی گوت ها... نامناسی؟ سفيان فەرمووی نەخێر بەڵام لێدانەكەت لە لێدانی كار بەدەستان وستەمكاران دەچوو... سبحان الله ما اروع هذە




الفراسة... حارس کە پیاوی خەلیفەبوو گوتی: ئەوە (امیر المؤنین)ە،

ابو جعفر گوتی: ئەوە بۆ چی نابیتەلامان چی لێت قەدەغەدەکات؟

سفیان گوتی: خوا قەدەغە دەکات لێم کە نێم بۆلاتان چونکە دەفەرمووی: (ولا ترکنوا الی الذین ظلموا فتمسکم النار)[1]، واتە: مەیلی خۆشەویستی و گوێ ڕایەلی نەکەن بۆلای کەسانێك کەستەم دەکەن ئەگینا ئاگری دۆزەخ دەتانگرێ.

- هەروەها جارێك چووە لای خەلیفە (المهدی) زۆر بە توندی قسەی لەگەڵ کرد، وەزیری مهدی گوتی: لە قسەکانت تێپەڕاندو زێدەڕۆییت کرد، لەسەر خۆوبەڕێز قسەلەگەڵ امیر المؤمنین بکە، ئایا ئەوها قسەی لەگەڵ دەکەیت؟ سفیان گوتی: بێ دەنگ بە تۆ، کەس فیرعەونی لە ناو نەبرد جگە لە هامان کاتێ سفیان ڕۆیشت، وەزیرەکەی گوتی: ئەی امیری ئیمانداران مۆڵەتم دەدەی بڕۆم لەگەردەنی بدەم؟ خەلیفە گوتی: بێ دەنگ بە، کەس لەسەر ڕوی زەوی نەماوە کەوا شەرمی لێ بکرێ جگە لەوە[2].

---

(١) سورە هود (١١٣)

(٢) مواقف ایمانیة، الشیخ احمد فرید، لاپەڕە(١٤٥)



## ٥٤٢- بەیاریدەدانی خوای گەورە

سعدی شیرازی دەفەرموێ :

پرسیان لە ئەسکەندەری ڕۆمی: ئەتۆ ولاتی مەشریق و مەغریب بەچی گرت و پاشایاتی پێشی تۆ عومرو غەزنەیان لە تۆ زۆرترو لەشکریان بێ سامان بوو وایان بۆ نەکرا..؟

فەرموی: بەیاریدەدانی خودای گەورە، هەروڵاتێکی گرتم ڕەعیەتم ئەزیەت نەداو مەعاش و ژیانی ئەهالی ئەوانم لە جێ خۆی هێشتەوە و باسی پاشاو گەورەکانم بەخراپە نەکرد و دائیمەن بە چاکە باسم دەکرن[1].

## ٥٤٣- پاشاو عابید

سعدی شیرازی دەفەرموێ:

یەکێك لە پیاو ساڵحان پاشایەکی دیت لەناو بەهەشت و عابیدێکی دیت لە ناو دۆزەخ، پرسی: سەبەبی چییە؟ دەرەجەی پاشا چی بوو و چوونی عابید بۆ دۆزەخ لە چییەوە بوو؟

ئەوە پێچەوانەی تێگەیشتنی عالەمە.

---

(١) گوڵستان، لاپەڕە (١٤٠)

پێیان گوت: لەبەر خۆش ویستنی ساڵحان پاشا چووە بەهەشت عابید یش لەبەر خۆش ویستنی زاڵمان چووە دۆزەخ[1].

کەواتە لە دوا ڕۆژدا خۆشەویست لەگەڵ خۆشەویستەکەی ڕادەگیرێ..

## ٥٤٤- سوور بوون لەسەر کۆکردنەوەی ماڵی دنیا

کاتێ هارون الرشید لەگەڵ (بەهلول) کۆببوەوە پێی گوت: ئامۆژگاریم بکە، بەهلول گوتی: بەچی ئامۆژگاریت بکەم؟

ئەمە گۆڕەکانیانە، ئەمەشیان کۆشك و قەسرەکانیانە، پاشان گوتی: ئەی امیر المؤمنین چی دەکەیت کاتێ خوای گەورە تۆی ڕاگرت لەبەر دەستی خۆی وەپرسیاری ئەو کەونەی لێ کردیت کە لە دەنگی خورمادا هەیە و وەئەو قەڵشەی کە لە خورمادا هەیە و هەروەها ئەو توێکڵە وردە و تەنکەی کەلەسەر دەنکی خورمادا هەیە، چۆن وەڵامی دەدەیتەوە وەکاتێ کە تۆ تینووی، ڕووتی.. برسی.. وەخەڵکی مەیدانی مەحشەریش هەمویان سەیرت دەکەن و پێدەکەنن؟ خەلیفە لە نێو پەند وەرگرتندا خەریك بوو دەخنکا.. فەرمانی کرد بەوەی کە یارمەتییێکی بهلول بدەن وەهەندێ پارەی بۆ بێنن، بەهلول گوتی: من نامەوێ بیدە بەوکەسانەی کەلێت سەندوون پێش ئەوەی کە هیچ شتێکت لەلانەبێ کە ڕازیان بکەیت ئینجا ئەو چەند دێڕە شیعرەی

---

( ١) گوڵستان، لاپەڕە (١٦٠)




بۆی خوێندەو گوتی:

**دع الحرص على الدنيا وفي العيش فلا تطمع**

**ولا تجمع من مال فما تدري لمن تجمع**

**فان الرزق مقسوم وسوء الظن لا ينفع**

**فقير كل ذي حرص غني كل من يقنع**

واتە: واز بێنە لە سووربوون وهەوڵ دان بۆ کۆکردنەوەی ماڵی دنیا، وەلە ژیانیش تەمەع مەکە، ماڵی دنیا ئەوەندە کۆمەکەرەوە، چونکە تۆ نازانی بۆ کۆیدەکەیتەوە، بێگومان ڕزق وڕۆژی دابەشکراوە لەلایەن خوا، بەد گومانیش شتێکی خراپە هیچ سوودێکی نییە، هەژارە ئەوکەسەی کە سوورە لەسەر کۆکردنەوەی ماڵ، دەوڵەمەندە ئەوەی کە دڵی ئارامە و قەناعەتی بەکەمێك لە ماڵی دنیادا هەیە[1].

## ٥٤٥- گرفتێك لە تێنەگەیشتن

زۆر جار مرۆڤەکان لەبەر تێنەگەیشتیان لە شتێك زۆر بە زەقی گرفت دروست دەکەن بۆ دەوروبەریان کەدەبێتە هۆکاری دروست بوونی کێشەی گەورتر شەڕو پێکدادان، ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر گوێ نەگرتن و ئارام نەگرتن لەبەرامبەر هاوڕێکەت یان خەسمەکەت، یان بۆ روون نەکردنەوە ئارام

(١) رحلة الخلود – د. مصطفى مراد، لاپەڕە (٩)



نەگرتن بۆ ڕوون کردەوە..

– دەڵێن دوو ئەسپ سوار بەیەك گەیشتن، لە نزیك قوچەکێکی کۆن کە داندرابوو، کێشەیان لیّ پەیدا بوو لەسەر ڕەنگەکەی، یەکیان دەیگوت ! ڕەنگی زەردە ئەویتر دەیگوت: شینە، لەیەك کاتیشدا لە کاتێکدا کە تەنیشتێکی ڕەنگێك بوو تەنیشتەکەی تریشی ڕەنگێکی تر بوو واتە: لێك جیابوون، دوو ئەسپ سوارەکان نەیانویست یەك چرکە ڕاوەستن چیتر کێشە و سەر نەنێنەوە تاکو پشکنینی ڕەنگەکان دەکەن بزانن قسەی کیّ یە وکێش هەلەیە، بەڵام هەردووکیان قسەی خۆیان پیّ ڕاست بو قسەی ئەویتریان پیّ هەڵەبوو..

لە ڕاستیدا لایەکی بەڕەنگی زەرد بۆیە کرابوو وەلایەکەی تریشی بەڕەنگی شین بۆیەکرابوو )

دەرەنجام هەردووکیان جنێووقسەی ناشیرینیان گۆڕییەوە لەگەڵ یەکتر پاشان بوو بە گۆڕینەوەی شمشێرو لێکدان بەتیر[1].

## ٥٤٦- ئافرەتێك ئامۆژگاری ئیمامی عمر دەكات

قتادە دەڵیّ: ڕۆژێکیان ئیمامی عمر لە مزگەوت دەرچوو، جارودی (العبدی) لەگەڵدا بوو، ئافرەتێك لەسەر چەقی ڕێگادا ڕاوەستابوو ئیمامی عمریش سەلامی لیّ کرد، ئەویش وەڵامی دایەوە، گوتی: ئەی عمر زۆر لێك

---

(١) هل فات الاوان لتبدأ من جيد باسل شيخو لاپەرە (٤١)

دووره لەسەردەمێك دەژیام كە سەردەمی تۆ بوو پێیان دەگوتی: عومەرۆك (عمیر) لە بازاری (عكاظ) ی (مكە) منداڵەكانت دەترساند بە عەساكەت، چەند رۆژێكی نەبرد تاكو پێیان گوتی (امیر المؤمنین) گەورەی ئیمانداران كەواتە لە خوا بترسە سەبارەت بەو خەڵكەی كە لە ژێر دەستتە، ئینجا بزانە هەركەسێ لە رۆژی قیامەت بترسێ ئەوا بەڕاستی هەموو دوورێكی بۆ نزیك دەبێتەوە، كەسێكیش بترسێت لە مردن ئەوا لە دەستدانیش دەترسێ.

جارود گوتی: ئەی ئافرەت زۆرت گوت لەسەر امیر المؤمنین ئیمانی عمر فەرمووی: وازی لێ بێنە ئایا نایناسی ئەوەكێیە؟ ئەوە (خولە) ی كچی (حكیم)ە، خێزانی (عبادەی كوڕی (صامت)ە، كە خوای گەورە لەسەرەوەی حەوت ئاسمانەكان گوێ لە قسەكانی بوو كە مشتۆمڕی دەكرد وشەكوای حاڵی لەلای پێغەمبەر دەكرد، ئینجا سورەتی (المجادلە) سەبارەت بە ئەو دابەزی، كەواتە (عمر) حەق ترە سوێند بەخوا كە قسەی لەگەڵ بكات وگوێ لێ بگرێ [1].

## ٥٤٧- ئافرەتێك ئارام دەگرێ لەسەر نەخۆشی پەركەم (الصرع)

عطاء دەڵێ: عبداللە ی كوڕی عباس پێی گوتم :

ئایا ئافرەتێكت پێ نیشان بدەم كە ئەهلی بەهەشت بێ؟

گوتم بەڵێ.

---

( ١) صفحات نیران من حیاة السابقات، نذیر محمد مكتبی لاپەڕە (٢٧٢)




فەرمویَ: ئەو ئافرەتە ڕەش پێستەی کە هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: من تووشی نەخۆشی پەرکەم – صرع – هاتووم کاتیَ ئەو نەخۆشیە دەمگریَ لە هۆش خۆم دەچم، وەخۆم ڕووت دەکەمەوە، دوعام بۆ بکە بەڵکو خوای گەورە شیفام بدات، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: ئەگەر ئارام دەگرێت و دوعات بۆ نەکەم ئەوا بەهەشتت بۆ هەیە، ئەگەر حەزیش دەکەیت دوعات بۆ دەکەم وخوا شیفات دەدا و چاك دەبیتەوە، ئافرەتەکە گوتی: ئارام دەگرم بەڵام من خۆم ڕووت دەکەمەوە دوعام بۆ بکە کە خۆم ڕووت نەکەمەوە پێغەمبەریش دوعای بۆ کرد [1].

ئینجا هەرکاتیَ توشی پەرکەم دەهات لە هۆش خۆی دەکەوت و خۆی ڕووت ناکردەوە.

## ٥٤٨- ئایا باوەڕدەکەن..؟

قورئانی پیرۆزی لەبەرکرد لە نێوان بانگ و قامەت کردن

پیاوێك تەمەنی لە چل ساڵان ڕەت کردووە و بەردەوامیشە لە سەر عەرەق خواردنەوە، هەردەم سەرخۆشە و لە خێزان و کچەکانی دەدات ولەماڵ دەریان دەکات، دراوسیَ کانیشیان بەزەییان دێتەوە پێیان، هەر داوای لیَ دەکەن کە ئازاریان نەدات، شەو بەسەر خۆشی بەسەر ئەبات، خێزانیشی بەگریان شەو بەسەردەبات زۆر ڕەوشتی خراپە.. لە نزیك

(١) صفحات نیران من حیاه السابقات / نذیر محمد مکتبی لاپەڕە(١٤٢)






ماڵەکەیان گەنجێکی موسڵمان ودیندار هەیە ڕۆژێکیان دێتە سەردانی ئەو پیاوە بێ ئاگایە و سەرخۆشە لەدەرگا دەدات ئەویش بەسەرخۆشی و بەولاو بەم لا دادەکەوێت دەڕوا دەرگای لێ بکاتەوە.

دەبینی گەنجێکی ڕووخۆش وقسەخۆش نورو ڕۆشنایی دەدرەوشێتەوە لە ڕۆخساری بەسەریدا هاوار دەکات.. چیت دەوێ؟

گەنجەکە دەڵێ: هاتوومە بۆ سەردانت ! دووبارە بەسەری دەقیژێنی وپێی دەڵێ: لەعنەتی خوات لێ بێ ئەی سەگ، ئەمە کاتی سەردانە! تفێکی دەکاتێ، لاوەکە تفەکەی لەدەم و چاوی دەسڕێتەوە وپێ دەڵێ: ببورە کاتێکی تر دیمەوە وەلات.. ڕۆیشت بۆ ماڵی خۆی هەر هەوڵ دەدا و دوعای بۆ دەکات، پاشان سەردانی دەکات.. دەرەنجام وەك جاران وایە، تاکو جارێکی تر دێتەوە دەبینی پیاوە ئەو جار بە تەواوی بەسەرخۆشی دێتە دەرەوە پێی دەڵێ: من دەرم نەکردیت بۆ چی هاتیتەوە؟ لاوەکە بەقسەیەکی نەرم و لەسەرخۆ وەلامی دەداتەوە پێی دەڵێ: خۆشم دەوێیت دەمەوێ لەگەڵت دانیشم،.. پیاوەکە خەجاڵەت بوو بەمە وگوتی: من سەرخۆشم.. لاوەکە گرفت نییە هەر لەگەڵت دادەنیشم ئەگەر سەرخۆشیش بیت، لاوەکە هاتە ژوورێ وباسی گەورەیی خوا و بەهەشت و دۆزەخی بۆی کرد، موژدەی پێدا کە خوا تۆبە کارانی خۆش دەوێت، پیاوەکەش هەر گوێی بۆ دەگرت و بەرگریشی لە ڕابردووی خۆی دەکرد، پاشان لاوەکە ڕۆیشت، جارێکی تر هاتەوە لای بەسەرخۆشی بینی، ئەمجارەشیان باسی بەهەشت و تامەزرووی بەهەشتی بۆی کرد، وەشووشەیەکی بۆنی خۆشی بۆی بەدیاری لەگەڵ خۆی






بۆی هێنابوو ئینجا ڕۆیشت، هەوڵی دا لە مزگەوت چاوی پێ بکەوێ بەڵام نەهاتبوو، دووبارە چووە لای بینی لەو پەڕی سەرخۆشی دایە.. هەندێ قسەی لەگەڵ کرد، ئەویش دەستی کرد بە گریان و هاواری کرد، گوتی: خوالێم خۆش نابێ هەرگیز.. من ئاژەڵم.. هەمیشە سەرخۆشم خوا وەرمناگرێتەوە.. کچەکانم لە ماڵ دەرکردوە وخێزانم ئازاردەدەم، ستەم لە خۆم دەکەم.. بەوشێوە دەردە ڵی خۆی دەکرد لەگەڵ لاوەکە.. لاوەکەش بەهەڵی زانی بۆ ئەو مەبەستە گوتی: لەو زووانە لەگەڵ کۆمەڵێ مامۆستاو پیاوی باش دەچیتە (عومرە) تۆش وەرە لەگەڵمان، گوتی: من بێم کە چی عەرەق خۆریشم! !..؟ گوتی: نەخێر هیچ نییە تۆیان وەك من خۆش دەوێ و ڕێزت دەگرن. ئینجا گەنجەکە هەستا خۆی ئامادەکرد و پۆشاکی احرامی لەسەیارەکە دانا و گوتی: خۆت بشۆرە و احرام ببەستە ! ئەویش احرامەکەی لێ وەرگرت لەبەرخۆی کرد و خۆی پاك و پوخت شۆرد، لاوەکەش زۆر بە پەلە نەوەك پەشیمان بێتەوە، هەر بە پەلە جانتاکەی پیاوەکەی هەڵگرت و لەبیری چوو عەڕەقەکەی لێ فڕێ بداتە دەرەوە، سەیارەکە دەرچوو پیاوێکی سەرخۆش و گەنجێك و دووپیاوی ساڵح تێدابوون، لە ڕێگادا باسی تۆبەیان دەکرد، پیاوەکەش سوڕەتی فاتیحەش نازانێ، بەڵام فێریان کرد.. بەشەو لە مەکە نزیك بوونەوە، پیاوەکەش بۆنی عەڕەقی لێدەهات.. سەیارەکەیان ڕاگرت تاکو بخەون، پیاوەکە گوتی: ئێوە بخەون من سەیارەکە لێدەخۆرم !! ئەوانیش بەنەرمی وەڵامیان دایەووە، ئینجا دابەزین و جێگایان بۆ ئەویش ئامادەکرد، ئەویش سەیری دەکردن تاکو






نووستن.

لەناکاو بەخەبەر هات، سەیری کردن دەبینی وا نوێژدەکەن، بەخۆی یەوە دەیگوت سەیرکە ئەوان دەگرین و نوێژ دەکەن منیش سەرخۆش و بێ ئاگام، بانگی بەیانی درا، بەخەبەریان هێنا و نوێژیان کرد پاشان خواردنیان ئامادە کرد، ئەوها خزمەتیان دەکرد دەتگوت ئەمیریانە، لێرەوە دەستی پێ کرد و دڵی نەرم دەبوو، وەشەوقی پەیدا دەبو بۆ ماڵی خوا و کەعبەی پیرۆز، هەردەگریا و دەیگوت خوایە ڕەحمم پێ بکە داخیلی نێو مزگەوتی (حرام) بوون لەمەکە، ئەو زیاتر لە هەموان ڕای دەکرد بۆ لای کەعبە و هاواری دەکرد و دەگریا، خوایە بەزەییت بێتەوە پێم.. ئەگەر وەرمنەگریتەوە دەرم کەیت هانا و هاوار بۆ کوێ بەرم؟

بەدەست بەتاڵی ڕەتم نەکەیتەوە ئەی خوایە گیان.. !

ئەوانیش دەترسان لێی.. زەوی دەهەژاند لەبەرگریان و هاواری، پێنج ڕۆژی خاراییند بە نوێژ و دوعاو پاڕانەوە، دەستیان کرد بەگەڕانەوە بەرەوماڵیان.. لە ڕێگادا جانتاکەی کردەوە و عەرەقەکەی لە نێو فڕێ دایە دەروە، گەیشتەماڵەوە.. خێزانەکەی دەگریا لەگەڵ کچەکانی، پیاوێك کە تەمەنی لە چل ساڵان ڕەت کردووە ئێستا لە نوێ وە لە دایك بوو، بەردەوام بوو لەسەر نوێژی و خواپەرستی، پیشەکەشی مووی سپی و ڕەشی تێکەڵ کردبو، ئینجا لە مزگەوت بو بە بانگدەر (المؤذن) لەگەڵ قورئان خوێندندا لە نێوان بانگ و قامەت کردندا قورئانی پیرۆزی لەبەر کرد.






ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر هیمەتی بەرزی وبێداربوونەوە لە بێ ئاگایی هەمو گوناهبارێك ئەگەر بەراستی تۆبەی کرد، وە قورئانیشی خوێند خوای گەورە شارەزای دەکات لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزی پێ دەبەخشی[1].

## ٥٤٩- تۆبەی کرد لە غەیبەت کردن

سفیان کوڕی حسین دەڵێ: لەلای ایاس ی کوڕی معاویە دانیشتبووم پیاوێك بەوێدا تێپەڕیی منیش بەخراپە باسم کرد (غەیبەتم کرد) ئینجا ایاس ی کوڕی معاویە پێی گوتم: بێ دەنگ بە ! پاشان گوتی: ئایا تۆ غەزای ڕۆمت کردوە؟ گوتم نەخێر، گوتی: غەزای تورکت کردووە؟ گوتم: نەخێر، گوتی: دەبینی ئێستا تورك وڕۆمەکان لەدەستت سەلامەت بووینە بەڵام موسڵمانێکی برات سەلامەت نییە لەدەستت، دەڵێ: منیش لەو ڕۆژەوە تۆبەم کرد و وازم هێنا لە باس کردنی خەڵك و وهەرگیز غەیبەتی کەسم نەکرد[2].

## ٥٥٠- خواپەرستێك.. لەگەڵ جاریەکەیدا

علی کوڕی الحسین دەفەرمووێ:

دراوسێکی خواپەرستمان هەبو زۆر خۆی ماندو دەکرد لە خواپەرستیدا ئەوەندە نوێژی دەکرد تاکو قاچەکانی قەڵش دەبون، وەئەوەندە دەگریا

---

( ١) التوبە.. وروائع التائبین ابو عمر الزغبی، لاپەڕە (٤٢٢)

( ٢) التوبە.. وروائع التائبین، ابو عمر الزغبي، لاپەڕە (٣١٦)






تاكو چاوەكانی نەخۆش دەكەوتن، خانەوادەكەی لێ كۆبوونەوە و داوایان لێ كرد كە وا ماڵ و خێزان پێك بێنێ ژن بێنێ، ئەویش لەوەدەترسا ئەگەر ئافرەتێك مارە بكات كە ئازاد بێت (نەك كۆیلە..) سەرقاڵی بكات لە خواپەرستی بۆیە بیری لەوەكردەوە كە جاریەك بكرێ بەمە ماڵ وخێزان دروست بكات، هەستا جاریەكی كڕی كە گۆرانی بێژو دانەرو پسپۆربوو لە ئاواز و شیعرو گۆرانی، ئەویش نەیدەزانی ڕۆژێكیان لە میحرابەكەی خۆی نوێژی دەكرد، جاریەكەشی هەندێ لەبەیتە شیعرەكانی دووبارە دەكردەوە و ئاوازی خۆشی لەگەڵ بە كاردەهێنا، وەدەنگیشی بەرزدەكردەوە خواپەرستەكەش ئەمەی بیست ودڵی بۆی چوو كاتێ لەو ئاوازو دەنگە خۆشە بو، وەنوێژەكەی بە زۆری بۆ تەواو نابوو، بۆیە زوو كۆتایی بەنوێژ كردن هێنا و هاتە لای گوێ بۆ گرت، جاریەكە پێی گوت: گەورەم بەڕاستی گەنجایەتیت بەتەواوی لە ناوبردووە، ژیانت پڕە لە ئازارو ناڕەحەتی، هەموو خۆشی و چێژی ژیانت وەلا ناوە، ئەگەر هەندێ گوێم بۆ بگریت بۆ گۆرانی و ئاوازم، ئەویش دلی كەوتە سەركاری جاریەكە و خۆی بەو شتە سەرقاڵ كرد و وازی هێنا لە هەوڵ وكۆششی لە خواپەرستیدا، ئەو هەواڵە گەیشتە هەندێ لە هاوڕێ یەكانی خۆی كەبەڕاستی خواپەرست بون یەكێك لەوانە نامەیەكی بۆ نارد وتێیدا بۆی نوسی: بسم الله الرحمن الرحسم، لە ئامۆژگاركارێكی دڵسۆزی بەڕەحم و دكتورێكی نەرم ونیان وبەویژدان بۆ كەسێك كە خۆشی وچێژو شیرنایەتی قورئانی لە خۆی داپچراندوە، هەروەها ملكەچی وغەمباری لەلانەماوە، هەواڵم پێ گەیشتووە كەوا جاریەكت كڕیوە بە بەشەكەی



قیامەتت، ئەگەر زۆرت بەکەم فرۆشتووە و قورئانت بە ڕەقس و گۆرانی داوە ئەوا من دەتترسێنم لەوەی کەشتێك هەیە هەموو چێژوو تامی دنیان لێ دەسێنێتەوە کە مردنە وئەوەی ئارەزووی دنیایە هیچی نایەڵێ لەلات، وەمنداڵەکان هەتیودەکات، وەك بڵێین لەناکاو دێت لەسەر غیرەیەك زمانەکان لاڵ دەکات، ئەندامەکانت هەمووی لەکار دەکەون وەکفنەکان نزیك دەبنەوە لێت بە هۆی ئەوەو لەماڵ وخێزان و دراوسێ دادەبڕێت، ئینجا نامەکەی پێچایەوە دای بە کوڕێك ناردی بۆلای، کاتێ چوە لای ونامەکەی کردەوە کە لە مەجلیس وکۆڕی کەیف وخۆشی وسەیران بوو، سەرقاڵ بوو بە گۆرانی وئاوازەکانی خێزانەکەی، کاتێ نامەکەی خوێندەوە، ڕای کرد و ئاوی دەمی قووت دەدا وبەپەلە ڕۆیشت لەمەجلیسی خۆشی و شادی و گۆرانیەکانی، وەهەمو ئامێرەکانی گۆرانی ومۆسیقای شکاندو بەتەواوی وازی هێنا و تۆبەی کرد لەو کارەی، وەدەستی کرد بە خواپەرستی تاکو مردن.

کاتێ مرد، هاوڕێکەی لە خەویدا بینی پێی گوت: خوا چی بەسەر هێناییت؟

گوتی: چووین بۆ لای خوایەکی بە لوتف و بەکەرەم بەسۆز بەهەشتی بۆ حەڵاڵ کردنین، وە جاریەی بەهەشتی لە جیاتی جاریەی دنیادا پێ بەخشیم، کە ناوەناوە ئاوم دەداتێ و پیرۆزبایشیم لێ دەکات[1].

---

(١) من روائع العريفي، د.محمد عبدالرحمن العريفي، لاپەڕە(٣٨٩)

# ٥٥١- تۆڵەی خوا

الخطاب لە کتێبي (عدالة السماء) دا دەڵێ: پیاوێکی قەساب هەبوو لە بغدا پێش نوێژی بەیانی دەچووە دوکانەکەی بزن ومەڕی سەردەبڕین و پاشان دەگەڕایەوە بۆ ماڵ، لە دوای ڕۆژهەڵات دەچو دوکانەکەی دەکردەوە گۆشتەکەی دەفرۆشت، شەوێك لە شوان دوای سەربڕینی بزن و مەڕەکانی بەتاریکەشەو دەگەڕایەوە ماڵ وبەرگ پۆشاکیشی هەموی خوێناوی بوو لەبەر سەربڕینی بزن و مەڕەکانی، لە ڕێگادا گوێی لە هاوارێك بوو لە یەکێك لە کۆڵانەکانی کە هیچ ڕووناکیێکی لی دانەگیرسابو، لە ناکاو گەیشتە سەر لاشەیەکی مردوو گەوابەچەند لێدانێکی بەچەقۆ کوژرابوو وەچەقۆیەکەشی لەناو لاشەی چەقێندرابوو، ئەویش بەپەلە چەقۆکەی دەرهێنا و فرێدا ئەولاوە، دەستی کرد بە هەڵگرتن ویارمەتی دانی لاشەکەی خۆینیشی لەلاشەی قەساب دەهاتە خواری (کە خوێنی ئاژەل بوونەك هی پیاوەکە بەڵام پیاوەکەش لاشەی خوێناوی بوو) خەڵکی لێ کۆبوونەوە کاتێ چەقۆیان بینی لە دەستی قەساب و خوێنیش دەتکا لە لاشەی وەترسیشی لێ نیشتبوو پیاوەکەیان تۆمەتبار کرد بەکوشتنی ئەو پیاوە پاشان بڕیاریان دا کەوا دەبێ لە تۆڵەی ئەو پیاوە بکوژرێتەوە، کاتێ ئامادەکرا بۆ گۆڕەپانی تۆڵەوەرگرتنەوە ودڵنیا بوو کەوا دەیکوژن لە نێو خەڵکی هاواری کرد و گوتی: خەڵکینە سوێند بەخوا من ئەوپیاوەم نەکوشتوە بەڵام من بیست (٢٠) ساڵ پێش ئێستا کەسێکی ترم کوشتووە ئێستاش وا تۆڵەم لێ وەردەگیرێتەوە لە حەقی ئەو کوشتنەم، ئینجا بەسەرهاتی خۆی بۆ خەڵکی

گێڕایەوە گوتی: (بیست ساڵ لەمەوبەر گەنجێك بوون کاری پەڕاندنەوەی خەڵکم دەکرد بە هۆی بەلەمێك وخەڵکم لەوبەرەوە بۆ ئەوبەری ڕوبار دەگواستەوە ڕۆژێك لەڕۆژان کچێکی زۆر جوان لەگەڵ دایکی هات ومنیش هەردووکیانم گواستەوە بۆ ئەوبەر، پاشان لە ڕۆژی دواتر هاتنەوە سواری بەلەمی من بوون، ڕۆژبەدوای ڕۆژ دڵم دەکەوتە سەر ئەو کچە ئەویش بەهەمان شێوە، داخوازیم لە باوکی کرد بەڵام باوکی پێی نەدام لەبەر هەژاریم، پاشان ماوەیەکی زۆر لێم دابڕا، نەبەخۆی نەبەدایکی دیار نەبوون، منیش دڵم هەر بەندە بە ئەو، دوای دووساڵ یان سێ ساڵ وەکو جاران لە نێو بەلەکەم دابووم وچاوەڕوانی نەفەرم دەکرد تاکو بیانگوزامەوە لەناکاو ئافرەتێك هات لەگەڵ منداڵەکەی داوای کرد بیگوازمەوە بۆ ئەو بەری ڕووبار، کاتێ سواری بەلەم بوو، گەیشتینە ناوڕاستی ڕووبارەکە سەیرێکی ئافرەتەکەم کرد، دەبینم هەمان ئافرەتی هاوڕێمە کە بەنیاز بووم بیخوازنم، بەلام باوکی نەیهێشت، دڵم بە بینینی زۆر خۆش بوو، دەستم کرد بە باسکردنی سەردەمی پێشوی خۆمان کە چەندە یەکترمان خۆش دەویست بەڵام ئەو زۆر بە ئەدەب و ڕێزەوە قسەی دەکرد، وەهەواڵی پێدام کە شووم کردوە ئەوەش منداڵەکەمە، شەیتان بۆی ڕازاندنەوە کە خراپەی لەگەڵدابکەم لێی نزیك بومەوە، بەسەریدا هاوار کردم وباسی خوای بەبیر دەهێنامەوە بەڵام من گوێم نەدەدا بەوە ئافرەتە هەژارەکە هەرمنی پاڵ دەدا و بەرگری لە خۆی دەکرد بە گوێرەی توانای، منداڵەکەش هەرهاواری دەکرد و دەگریا لە نێو دەستی، کاتێ ئەوەم بینی منداڵەکەم لێ وەرگرت و لە ئاوم نزیك کردەوە وگوتم:

ئەگەر خۆتم تەسلیم نەکەیت ئەو منداڵەت دەخنکێنم، زۆر پاڕایەوە وە دەگریا، بەڵام سوودی نەبوو هەر ئاوڕم لێ نەدایەوە، سەری منداڵەکەم لە ناو ئاودا نقوم دەکرد ودەرم دەهێنا، ئەویش دەگریا و سەیری دەکردم وچاوی خۆی دادەپۆشی، منداڵەکەش دەست و قاچی دەجوولاندن لە نێو ئاو تاکو هێزی نەماو ئەندامەکانی لە کارکەوتن و کە هێنامەدەرەوە مردبوو، یەکسەر لاشەکەی منداڵەکەم فڕێ دایە ناو ئاو، ئینجا چوومە لای ئافرەتەکە، بە هەمو هێزو توانای بەرگری لە خۆی دەکرد، زۆر دەگریا منی دەبڕاندوە لەبەرگریانی، بەمووی سەری ڕامدەکێشا و لە ئاوم نزیك دەکردەوە سەرم لەناو ئاو نقوم دەکرد و دەرم دەهێنا، بەڵام ئەو هەر سوور بوو لەسەر ئەوە کاتێ دەستەکانم ماندووبوون، سەرم لە ناو ئاودا نقوم کرد بینیم هەرهاوار و جوولانی دەکرد تاکو ئەویش لە جولە کەوت ومرد، ئەویشم فڕێ دایە ناو ئاو پاشان گەڕامەوە و کەسیش ئاگای لەوتاوانەم نەبو پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایە کە دەرفەت دەدا بەڵام کەس لەبیر ناکات و وەکەسیش فەرامۆش ناکات لەوەی کە تۆڵەی لێ وەرنەگرێتەوە، خەڵکی کە ئەمەیان بیست دەستیان کرد بە گریان، ئینجا سەری پیاوەکەیان بری (ولا تحسبن الله غافلا عما يعمل الظالمون)

وا گومان مەبە کە خوا بێ ئاگایە لەوەی کە ستەمکاران دەیکەن [1].

---

(١) بدائع العريفي، د. محمد عبدالرحمن العريفي، لاپەڕە (٢٤٠)




## ٥٥٢- ئافرەتێکی تێکۆشەر

**المرءءة المجاهدة**

ئەو ئافرەتەی کە شان بە شانی پیاوان لە مەیدانی جەنگ تێدەکۆشی بریتیە لە (نسیبە)ی کچی کعبی انصاری، کە بەشداری کردووە لە ڕۆژوی (احد) و حدیبە و خیبر و حنین و عومرەی قەزاو وڕۆژی الیمامە.

عمری کوڕی خطاب (رضي الله عنه) دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ)فەرمویەتی: (هیچ کاتێ ئاوڕم بەلای ڕاست چەپ نەداوەتە لە ڕۆژی – احد– ئیللا (نسیبە)م بینوە جەنگاوە لەگەڵ کافرەکان) واقدی دەڵێ: لە ڕۆژی احد دەجەنگا لەگەڵ قوڕەیشیەکان، وە دوانزە برینی لەلاشەدا هەبوون ماوەی یەك ساڵ برێنیکی لە ئەستۆی دا هەبوو تیماری دەکرد، پاشان بانگکەرێکی پێغەمبەر (ﷺ)بانگی کرد بۆ هەرای (حمراء الاسد) نسیبەش بەرگ و پۆشاکی خۆی پێچایەوە بۆ ئەوەی بەشداری لێ بکات کاتێ هەستا ویستی بڕوات لەبەر نەزیف بوونی ئەستۆی نەیتوانی بەشداری بکات و لە شوێنی خۆی بەدڵ عاجزی دانیشت.

هەروەها لە خەلافەتی خەلیفەی راشد پیشەوا ابو بکری صدیق (رضي الله عنه) دەرچوو بۆ جیهاد و بەشداری کرد لە ڕۆژی هەڵگەڕانەوە (یوم الردە) چووە ناوشەڕو هەوڵی دابەخۆی تائەوکاتەی خوای گەورە (مسیلمە)ی درۆزنی لەناوبرد، کە گەڕایەوە زیاتر لە دە برین هەبوون لەلاشەی.

– واقدی دەڵێ: کاتێ هەواڵ گەیشتە نسیبەی کچی کعب کە کوڕەکەی






(حبیب ی کوڕی زید) کوژراوە بەدەستی (مسیلمە) بەڵێنی دا لەگەڵ خوا یان دەبێ ئەو پێشی مسیلمە بکوژرێ یان مەرگی مسیلمە ببینێ ئەوە بو بەشداری کرد لە جەنگی (الیمامە) لەگەڵ قائیدی ئیسلام و شمشێری خوا، خالدی کوڕی وەلید، عبدالله ی کوڕی خۆیشی لەگەڵدا بوو، ئینجا لە و ڕۆژەدا ئاواتەکەی هاتە دی و مسیلمەی کذاب کوژرا، ئەویش دەستێکی لێ پەڕی لە جەنگدا.

– ابن هشام دەڵێ: لە ڕێگای – ام سعد – ی کچی سعد – ی کوڕی الربیع چوومەلای ام عمارە – نسیبە– پێم گوت: ئەی پۆرێ هەواڵم بدەرێ نسیبە گوتی: لە ڕۆژی أحد دەرچووم کوندەیەکم پێ بوو ئاوی تێدا بوو هەڵمگرتبوو، چووم تاکو گەیشتمە پێغەمبەر (ﷺ)وهاوەڵانی شکستیان هێنا گەڕامەوە لای پێغەمبەر ولەگەڵ کافرەکان دەجەنگام و بەشمشێری خۆم بەرگریم لە پێغەمبەر دەکرد بە کەوانەکەشم شەرم دەکرد.

ام سعید دەڵێ: بینیم برینێکی قوڵ هەبوو لەسەر ملی، گوتم: کێ ئەوەی لێدایت؟ گوتی: ابن قمئە[1].

---

( ١) صفحات نیران من حیاە السابقات نذیر محمد مکتبی لاپەڕە (١٥١)



## ٥٥٣- ابو جعفر المنصور ودوعای خوا پەرستێك

کاتێ ابو جعفری المنصور خەلیفەی عباسی لە بغدا دەهاتە مكە بۆ حەج کردن لە کۆتایی شەو دەچوو طوافی دەکرد وکەسیش ئاگای لێ نەبو، شەوێك لە شەوان نزیکی بەرەبەیانی بوو خەریکی طواف کردن بوو گوێی لە دەنگی یەکێك بوو دوعای دەکرد ودەیگوت (ئەی خوایە داوات لێ دەکەم کەوا فەساد وخراپە و ستەم لەسەر زەوی بەدەربێخی وەئەوەی پەردەیە لە نێوان حەق وئەهلی حەق لابدەیت لەستەم کردن) کاتێ ئەمەی بیست بە پەلە چوو بۆ ئەوەی سەرچاوەی ئەو دەنگە بدۆزیتەوە کاتێ دۆزییەوە بانگی کردو پرسیاری لێ کرد، لەوەی گوێی لێ بوو، پیاوەکە بە خەلیفەی گوت: ئەگەر دڵنیام دەکەیت کە زیانم بێ ناگەیەنیت ئەوا پێت دەڵێم کە مەبەستم چییە وەکێ یە، خەلیفە گوتی: دڵنیابە، لە خۆی نزیك کردەوە لێی پرسی، پیاوەکە گوتی: ئەی امیری ئیمانداران ئاگادار بە کە ئەوەی پەردە لە نێوان حەق وئەهلی حەق دادەنێ بەهۆی ئەوەی کە تەماعی دنیا دەخاتە نێوانیان، وئەوەی خراپە وستەم و فەسادیش بلاودەکاتەوە ولەسەر زەوی بێگومان ئەوە تۆی، خەلیفە گوتی: هاوار بۆ خۆت چۆن شتی وادەبێ وتەماعی دنیام لەلازیاد دەبێ کە چی ئەوەی بمەوێت لە ژێردەستمە گوتی: ئایا ئەو تەمەعە بەسەر کەس دا هاتووە وەك بەسەر تۆ ئەی امیری ئیمانداران، بەراستی خوای گەورە تۆی کردوە بەگەورە ولێپرسراوی کاروباری موسلمانان ومالّ وسامانیان، ئینجا کاروبارت فەرامۆش کردون وگرنگیشت داو بە مالّ و سامانیان، وە لە نێوان تۆو خەڵکیش پەردەیەکی پۆڵاینت دروست کردوە،




هەروەها چەند وەزیرو یاریدەدەرت هەڵبژاردوون کەبەراستی پیاوی خراپ و دڵ ڕەقن، ئەگەر شتێك لەبیر بکەین بەبیرت ناهێننەوە، وەئەگەر چاکەیەك بکەیت یارمەتیت نادەن، وەلەسەر خەڵکت بەهێز کردون بە ماڵ و سەروەت وهێزی پیاوان و بەچەك، کەستەمیان لێ بکەن، وەفەرمانت پێ کردوون کەوا کەس نێتە لات جگە لە فلان و فلان..

وەفەرمانیش ناکەیت بەوەی مافی ستەم لێکراوان بدرێت وبرسی وڕووت وبێ ماڵ و سامانەکانیش تێر بکرێن، چونکە هەرکەسێ بێ مافی تایبەتی هەیە لە مال و سامان و پارە پوول، هەواڵی خەڵك لە تۆ دەشارنەوە کەلەبەرژەوەندی ئەوانە مەگەر ئەو هەواڵە نەبێ کە حەزیان لێ یە و خۆ نزیك دەکەنەوە لێت بە هۆی ئەو جۆرە قسانە، ئینجا ئەوانە بە تەواوی بوونەتە هاوڕێ و هاوەڵت کە بێتە لات ئەوان پەردەن لە نێوانتان دەتوانن هەموو زانیارییەکان وەرگرن لێیان خۆ تۆش بێ ئاگای لەوە(١).

## ٥٥٤- بەیەك وتە چوار پزیشك موسلمان بوون

د. عبدالله دەڵێ: بانگهێشت کرام بۆ کۆنگرەیەکی پزیشکی لە ئەمریکا منیش وام بە خەیال هات کە بە بەرگ و پۆشاکی خۆم بڕۆم – نەك بەجلی نەخۆشخانە – گەیشتمە ئەوێ، چووینە ناو قاوشێك دکتۆرێکی غەریبم بینی و دانیشتم لە تەنیشتی، پێی گوتم: ئەو جل وبەرگە بگۆرە ئابڕومان نەبەیت

(١) مشاهير خلفاء بني العباس عدنان حسن صالح لاپەڕە (٣٤)






لەلای خەڵکی بێگانە، خۆم بێ دەنگ کرد، کۆنگرەکە دەستی پێکرد، دوو کاتژمێر بەسەردا چوو، کاتی نوێژی نیوەڕۆهات، ڕوخسەتم وەرگرت و هەستام نوێژم کرد، هەرچەندە دیمەنەکەم جێگای تێڕوانین بوو، پاشان بانگی عەسری فەرمو هەستام نوێژی عەسریشم کرد، هەستم کرد کەسێك لە تەنیشتم نوێژدەکات و دەگریی، کاتێ نوێژم تەواو کرد دەبینم هەمان ئەو هاوڕێ یە عەرەبە بوو کە گوتی: ئەو جل وبەرگە بگۆڕە، فرمێسکی دەباراندو دەیسڕیەوە ودەیگوت: ئەمە یەکەم نوێژمە لەوەتەی چل ساڵە ڕەگەزنامەکەشم امریکی یە وبەڵام یەك ڕەکعەت نوێژم بۆ خوا نەکردووە، کاتێ تۆم بینی نوێژی نیوەڕۆت کرد بەراستی ئاینی ئیسلام هاتە بیرم کە دەمێك بوو لە بیرم نەمابوو، گوتم: ئەگەر ئەو گەنجە هەستا نوێژی دووەمی کرد – واتە: نوێژی عەسر – منیش لەگەڵی نوێژ دەکەم، دەك خوا پاداشتت بداتەوە بە چاکە..

سێ ڕۆژ تێپەڕی.. کۆنگرەش چەند بەحسێکی پێشکەش بە پزیشکەکان کردووە، حەزم دەکرد یەکێك لەوانە پرسیارم لێ بکات سەبارەت بە ئیسلام بەڵام هەمویان سەرقاڵ بوون، لە کۆتایی کۆنگرەکە پرسیاریان کرد لێم بۆچی جل وپۆشاکی دکتۆران ناپۆشی؟ منیش سوپاسم کردن کە گرنگیان پێدام وپێم گوتن: ئەمە جل و بەرگی خۆمانە ئێستاش من لە نەخۆشخانە نیم، پاشان ویستم هەڵێك بدۆزمەوە بۆ بانگەوازی کردنیان، بەڕێوەبەر ئاماژەی کرد کە کاتم تەواو بوو، هاتە سەر خەیالم کە من بەڕاستی لە نێوانیان بووم بە نیشانەی پرسیار – (علاقە استفهام) گوتم: کۆنگرە






بەملیۆن بۆ خەرج دەكرێ بۆ بەحسێك كە پەیوەندی بە نێولاشەوە هەیە، ئەو لاشەیە بۆ چی دروست كراوە؟

بەزەردەخەنی یەوە پێكەنیم ودانیشتم بەرێوەبەر سەیری سەر سوڕمانی دكتورەكانی دەكرد، ئاماژەی كرد كەوا بەردەوام بم لە قسەكانم منیش باسی ئیسلام وحەقیقەتی ژیانم بۆیان كرد، وەباسی هەدەف و ئامانج لە دروست بوون وكۆتایی پێ هاتنی دونیام بۆ كردن كاتێ كۆتاییم بەقسەكانم هێنا..

چوار پزیشكی ئافرەت هەستانەوە و بڕیاریان دا كە بێنە نێو ئیسلام بە ئارەزووی خۆیان[1].

## ٥٥٥- زانایەك لە خانەی ڕەقس وسەمادا

شیخ فی المرقص:

د. محمد عبدالرحمن العریفي دەڵێ: پیاوێك پێی گوتم: لە نزیك ماڵمان مزگەوتێكی بچوك هەیە زانایەكی پیرو بەساڵابوو نوێژ بۆ خەڵكی دەكات لەو مزگەتە، ژیانی خۆی لە خوا پەرستی و دەرس و ئامۆژگاری بەسەر بردوە، ڕۆژێكیان بیری كردەوە كە ژمارەی نوێژ خوێنەكان هەر كەم دەبن، زۆر بە پەرۆش بوو بۆیان، وای هەست دەكرد كە هەمویان كوڕی ئەون، بۆیە ڕۆژێك ڕووی كردە خەڵك و گوتی: چییە زۆربەی خەڵك بەتایبەت گەنجەكان هەر نزیكی مزگەوت ناكەون وبەڵكو هەر نایناسن یەكێك لە نوێژ خوێنان وەڵامی

---

(١) التوبه، وروائع التائبين، ابو عمری موحمد الزغبی، لاپەڕە (٣٧٤)






دایەوە گوتی: لە خانەی ڕەقس و ڕابواردنن، زاناکە گوتی: ڕەقس و خانەی ڕەقس چییە؟ یەکێك گوتی: قاوشێکی گەورەیە مەنە سەیەکی بەرزیان داناوە لەدار کچان دەچنە سەری ڕەقس و سەما دەکەن وخەڵکیش لە دەوریان سەیردەکەن، شێخ گوتی: (اعوذ باللە.. ئەوانە سەیردەکەن موسلمانیشن)؟ گوتیان بەڵی، ئەو جارە گوتی: لا حول ولا قوە الاباللە.. واجبە ئامۆژگاری خەڵك بکەین گوتیان: یا شێخ چۆن ئامۆژگاریان دەکەیت لە قاوشەکە — خانەی ڕەقس؟ گوتی: بەڵێ، پاشان بەپەلە مزگەوت هاتەدەرەوە و دەیگوت وەرن با بچینە خانەی ڕەقس وسەما و ڕابواردن، هەولیان دا پەشیمانی بکەنەوە، بەڵام ئەو هەر سوور بوو لە سەر ئەوە، گوتیان ئێستابچیت خەڵکی گاڵتەت پێ دەکەن وئازارت دەدەن، گوتی: بۆ چی... ئێمە لە پێغەمبەر (ﷺ)باشترین — کە ئازاردرا وگاڵتەی پێکرا؟

پاشان شێخ دەستی یەکێکی گرت و گوتی: وەرە خانەی ڕەقسم نیشان بدە ڕۆیشت بە هەموو باوەڕو متمانەوە، ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە خانەی ڕەقس لە دوورەوە خاوەن قاوشەکە چاوی پێ کەوتن، وا گومانی برد کە ئەوان بۆ دەرس و موحازەرە هاتوون، کاتێ چوونە لای، خاوەنەکە سەرسام بوو، کاتێ شێخ گوتی: دەمانەوێ ئەوانەی لێرەن ئامۆژگاریان بکەین دووبارە خاوەن قاوشەکە سەرسام بوو گوتی: داوای لێ بووردنم هەیە ناتوانم ئیزنتانم بدەم بۆ ژووریٚ، زۆر هەوڵی لەگەڵ دان و باسی پاداشتی گەورەی خوای بۆ کرد، بەڵام هەربێ سوود بوو، شێخ گوتی: پارەت دەدەینێ ئینجا ڕازی بو بەو برەپارەی کە دەخلی ڕۆژانەی کاری بوو، وەداوای لێ کردن کە






بەیانی بێن بۆ ئامۆژگاری و وەعزدان، کاتی هات کە شێخ بێت بۆ ئەوەی، کە چووە ژووریّ خەڵکی هەمو لەویّ بوون، وەمەسرەحیان ڕازاندبوەوە بەشتی خراپ و بیّ شەرعی، شەیتانەکانیش خەڵکیان گەرم دەکرد و چەپڵەیان لێدەدا بۆیان، لەناکاو پەردە لادرا، دەبینن پیاوێکی زانای بەهەیبەت و یقارە لە پشت پەردەوە لەسەرکورسێك دانیشتووە، خەڵك واقیان وڕما، سەرسام بوون، هەندێکیان وا گومیانیان برد ئەمە ناوبڕی خۆشی وپێکەنینە، شێخ دەستی کرد بە قسە کردن گوتی: بسم الله الحمدلله والصلاه والسلام علی رسول الله پاشان دەستی کرد بە ئامۆژگاری کردنیان، خەڵکی هەندێك تەماشای یەکتریان دەکرد، هەبوو لەناویان بە گاڵتە پیّ دەکەنی و هەبوو ڕەخنەی دەگریّ بەڵام ئەو ئاوری لەکەس نەدەدایەوە قسەکانی خۆی نەدەبڕی، تاکو پیاوێك لە قاوشەکە دا هەستایەوە خەڵکی بیّ دەنگ کرد و داوای کرد لێیان کەگوێی بۆ بگرن، خەڵکی هێور بوونەوە و قاوشەکەش بەبی دەنگی دەوری دا خۆشی و ئارامی ڕژایە سەر تەنها دەنگی شێخ نەبیّ، چەند قسەیەکی بۆ کردن کە لە پێشتر نەیانبیستبوو، کێوی دەهەژاند بە ئایەتەکان، فەرمودەکان نموونەکان.. بەسەر هاتی تۆبەی چەند کەسێکی گوناهبار.. دەیگوت خەڵکینە، ئێوە زۆر ژیان و زۆریش بیّ ئەمری خواتان کرد، کوا تام و چێژی گوناهوتاوان، تام وچێژ نەماو ڕۆیشت بەڵام نامەی کردەوەکان بەڕەشی مایەوە، پرسیارتان لیّ دەکریّ لە ڕۆژی قیامەت، ڕۆژێك دێت کە هەموو شتێك لە ناو دەچیّ جگە لە خوای واحد القهار..

خەڵکینە ئایا سەیری کردەوەکانتان کردووە، وەسەیری ئەوەتان کردووە






کە بۆ کوێ دەتانبات، ئێوە لە دنیادا بەرگەی ئاگر ناگرن کە چی بەشێکە لە حەفتابەش لە ئاگری دۆزەخ، پێش ئەوەی کاتتان لەدەست بچێ پەلە بکەن بۆ تۆبە و گەڕانەوە بۆ لای خوا، زۆر قسەکانی کاریگەربوون هەر ئامۆژگاری دەکرد، چونکە قسەکانی لە دڵ دەهاتنە دەرێ وەدەچوونە نێو دڵ، خەڵکی زۆر گریا، ئەویش زیاتر ئامۆژگاری بەخشی، پاشان دوعای بۆ کردن داوای لە خوا کرد کە لێیان خۆش بێ وڕەحمییان پێ بکات، ئەوانیش بەیەك دەنگەوە دەیانگوت امین امین، ئینجا لەسەر کورسیەکەی هەستا و زیاتر سام و هەیبەتی دروست بوو ودەوری دا لێی، هەمویان بەدوای کەوتن کە چووە دەرێ، بەڵی.. هەمویان تۆبەیان لەسەر دەستی ئەو کرد، نەهێنی بوونیان لە ژیانیان ناسی، زانیان کەوا ڕەقس و تام و چێژی تاوان هیچ سودیان پێ ناگەیەنی، کاتێ پەڕاوەکان فڕین وتاوانەکانیش گەورە بوون، خاوەنی ڕەقس خانەکەش تۆبەی کرد و پەشیمان بوەوە لەسەر ئەو تاوانەی کە ئەنجامی دابوو[1].

## ٥٥٦- لە نەخۆشخانەوە

د. محمد العریفی دەڵێ: گەشتێکم کرد بۆ شوێنیك لە مانگی ڕەمەزان، کەش و هەوا لەوێ زۆر ساردبوو، لە بنکەیەکی ئیسلامی دەمانیەوە نوێژی تەراویحمان دەکرد، پاشان دەرسی ڕۆژانەمان ئاراستە دەکردن، یەکێك هات لەسەر عەرەبانەکەی بوو کوڕەکەی هێنا بووی، پیاوێکی پیرو بەساڵاچوو

---

( ١) روائع العریفی، د. محمد عبدالرحمن العریفی، لاپەڕە (١٩٦)






بوو، بێ تاقەت لە ڕۆیشتن، شەوێك لە شوان دیار نەبوو وە نەمدۆزیەوە گوتم: لەوانەیە لەبەر سەرما هاتبێ و باران ڕێگای لێ گرتبێ شەوی دووەم داهات و شەوی سێ یەمیش هەرنەهات، پرسیارم لە کوڕەکەی کرد، گوتی: نەخۆش کەوتوە و ماوەی سێ ڕۆژە لە نەخۆشخانە خەوتووە، بڕیارمان دا لەگەڵ چەند نوێژ خوێنیك کە بەیانی دوای عەسر سەردانی بکەین.

چووین بۆ نەخۆشخانە، هاتنمان شتێکی سەیربوو جێگای تێڕوانین بوو کە من جل و بەرگێکم لەبەر بوو ئەویتر کراسێکی درێژ.. یەکێکیش بانتوڵی لەبەر بوو. یەکێ لە دکتورە ئافرەتەکان پرسیاری لێ کردین.. ئایا ئێوە هەموتان کوڕی ئەون؟ گوتمان: نەخێر.. گوتی: کەواتە کۆمەڵەی خێرخوازی وچاکسازین؟ گوتمان نەخێر.. گوتی: ئێوە کێن؟ وەبۆچی هاتوون؟ وەکێ خەرجی ئەو ڕێگایەی بۆ داون تاکو بێنە ئێرە؟

بەلای من شتێکی سەیر نەبوو کاری ئێمە سەرسام ببو، چونکە ئەو داینابوو کە ئەو نەخۆشە پیرە دوو سێ مانگ لە نەخۆشخانە بخەوێنی و کەسیش سەردانی نەکات، بەڵکو ئەگەر کە مرد نەخۆشخانە خەرجیەی کفن و دەفن و پێداویستیەکانی بۆ جێ بەجێ دەکات، منداڵەکانیشی هەر لێی ناپرسن، پزیشکەکە تێگەیشت کە ئێمە موسڵمانین، ئەویش برای ئێمە یە لە ئیسلامدا چووینە ژووری هاوڕێکەمان، برایەکیشمان لەدەرەوە لەگەڵ پزیشکەکە ڕاوەستابوو باسی ئیسلامی بۆ دەکرد، ئێمەش گەیشتین بە ابو عماد پیاوێکی پیرو بەساڵاچوو بوو، شوێنەواری نەخۆشی بەسەریدا دیاربوو، سەرم ماچ کرد، گریا، گوتم حاڵت چۆنە؟



گوتی: سوپاس بۆ خوا – ناتوانم بە ڕۆژوو ببم، قورئان دەخوێنم زیکری خوا دەکەم بە گوێرەی توانام دەستی کرد بە قسەکردن بە گریانەوە، قسەکانیشی لەبەرگریان بۆ نەدەکرا، تامەزرۆی مزگەوت بوو غەمبار بوو لە سەردابڕانی لە مزگەوت ونوێژی تراویح، برایانیش زۆر دڵیان دەدایەوە وسەبر و ئارامیان بەسەر دڵدا دەباراند، سەیری ژوورەکەم کرد بینیم دوپیاوی پیری لێ بوون، خەڵکی ئەوشارە بوون، ئەورووپی بوون، زمانیانم نەدەزانی بە باش یەکێ لەبرایەکانمان ناردم کە بچێت سەلامیان لێ بکات وپرسیار لە حاڵیان بکات، زۆر بە ئێمە سەرسام بوون ئەوەی زۆر سەیر بوو ئەوە بوو هەمان پرسیاریان ئاراستەی کردن کە پزیشکەکە کردی لێمان، ئێوەکێن؟ کۆمەڵەی خێرخوازین؟

کاتێ هەواڵمان پێدا کە هیچ خزمایەتی ونزیکی نییە لە نێوانمان تەنها نزکیی ئایین نەبێ وەکەسیش کرێی سەردانەکەمان نەداتەوە، هەردوکیان بەسەر سامیەوە سەیری یەکتریان دەکرد، وابزانم یەکیان خۆی هەڵدەکێشا لەسەر ئەویتر ئەیگوت: من کچەکەم کارتێکی بۆ ناردووم بەبۆنەی جەژن منیش گەڕامەوە لای هاوڕێکەم ویستم خوا حافیزی لێ بکەم، ئەو دووپیاوانەش بەلای منە زۆر سەیر بوون و و زۆریش سەیریان دەکردم، پرسیارم کرد لە هاوڕێکەم گوتم: ئایا قسەو گفتوگۆ هەیە لە نێوانتان؟ واتە لەگەڵ ئەو دوو پیاوانە.

گوتی: ئەو دوو پیاوە پیرە کاتیان بەشتی زۆر سەیر بەسەر دەبەن




گوتم: چۆن؟

گوتی: تاكو عەسر دەخەون، كاتیٚ بیٚداردەبنەوە، هەردوكیان برسێن خوادرنیان بۆ ئامادە دەكریٚت، كاتیٚ تیٚر یان خوارد دەست دەكەن بە قسەی پڕوپۆچ وگاڵتە و جویٚن دان، كاتیٚ نەخۆشخانەیان پڕ كرد لە هات و هاوار پزیشكەكە دیٚت یەكە و شووشەیەكی عەڕەقیان دەداتیٚ وابزانم بۆ بیٚ هۆش بوون وخەو لیٚ كەوتنە، ئەوانیش دەخۆنەوە تاكو عەسری بەیانی دەخەون !! پاشان بیٚدار دەبنەوە هەمان بەرنامە دووبارە دەكەنەوە.

بۆیە چەندین جۆرە نەخۆش هەن، ئەو نەخۆشەی كەو بیٚدارو ئاگایە لە قورئان خویٚندن و زیكرویادی خوا و نویٚژ بیٚگومان وەكو ئەو دووپیاوە پیرەنییە كە كاتیان بەو جۆرە بەسەر دەبەن[1].

## ٥٥٧- سیحرم لیٚكراوە !!

انا مسحور:

د. العریفی دەڵیٚ: پیاویٚك هاتە لام وگوتی: برایەكم توشی سیحربووەو سیحری لیٚكراوە، دەمەویٚت كەسیٚكمان پیٚ نیشان بدەیت هەندیٚك قورئانی لەسەر بخویٚنیٚت و ڕوقیەی شەرعی بۆ بخویٚنی، منیش داوام كرد كە براكەی بیٚت بۆ لام، كاتیٚ هاتە لام.. دەبینم نەخۆشەكە ڕۆخساری گۆڕاوە و دڵی زۆر تەنگ بووە، حاڵی زۆر پەریٚشانە.

---

( ١) من روائع العريفي، د.محمد عبدالرحمن العريفي، لاپەڕە (٤٦٩)



پرسیارم لێی کرد چیتە؟

گوتم: نیشانەی سیحر لێکردنەکەت چییە؟!

گوتی: هەست بە دڵتەنگی دەکەم، هەمیشە حاڵم ناخۆشە و لە هەراسان دام بێزارم لە هەمو شتێك، تێکەڵی خەڵکم بێ خۆش نییە، تەنانەت دایکم و خوشکانیشم، بەرگری دانیشتنیان ناگرم، خێزانم زۆر گرفتمان بۆ پەیدا دەکات، ئەوە یەك ساڵە چووە ماڵی باوکی..

حەز ناکەم لەگەڵ منداڵەکانیشم دانیشم، پاشان باسی لە هەموو گرفتەکانی کرد وبێ دەنگ بوو.

گوتم: بۆ چی هەر سووری لەسەر ئەوەی کە سیحرت لێکراوە، بۆی هەیە تاوانێکت کردبێ ئەمەش تۆڵەی تاوانەکەبێ لەسەرت کە دڵت بەو شێوە تەنگ وناڕەحەتە، خوا دەفەرمووێ (وما اصابکم من مصیبة فبما کسبت ایدیکم ویعفو عن کثیر)[1]، واتە: تووشی هەر بەڵاو نەهامەتی یەك هاتن ئەوا بەدەستی خۆتانە و بەهۆی هەڵەکانتان خواش لە زۆر تاوان خۆش دەبێ

گوتی: نەخێر سیحرم لێکراوە ڕوقیەی شەرعیم لەسەر بخوێنە گوتم: بە خۆت داوەرەوە وچاودێری کردارت بکە و موژدەت لێ بێ بەخێر.

گوتی: نەخێر لەسەرم بخوێنە... سیحرم لێکراوە..

کاتێ زۆری لێم کرد و گلاسێکی ئاوم هێنا و سوڕەتی (الفاتحە)م لەسەر

---

(١) سورە الشورە (٣٠)

خوێندو فووم لێ کرد و پێم گوت: بیخۆرەوە لەسەرم خوێندی ئەویش ئاوەکەی خواردوەوە دەرچوو.

دوای دوو ڕۆژ براکەی پەیوەندی پێوە کردم گوتی: یا شیخ موژدەت لێ بێ خوا سودی گەیاند پێی بە هۆی خوێندنەکەت، سەرسام بووم گوتم: چۆن؟

گوتی: دوێنی براکەم لەلای دایك و خوشکم بوو تاکو ئێوارە ئێوارەش چوو خێزان و منداڵەکانی هێنایەوە ماڵێ، سوێند بەخوا دایکم و خێزانەکەی هەر دوعات بۆ دەکەن، خوا پاداشتت بداتەوە بەخێر، لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئەو سیحرە، سوێند بە خوا زۆر سەرسام بووم بەوە، گوتم براکەت بابێتە لام.

کاتێ هەردووکیان هاتنە لام پرسیارم لە نەخۆشە کرد، هاه.. فلان سیحرت لێکرابوو؟

گوتی: نەخێر

بەڵام شتێکی ترم بینی، فیلم و مادە بێ هۆشکەرەکانم بینین

گوتم: چۆن؟

گوتی: کاتێ ڕۆیشتم لەلات، بەخۆم دا چوومەوە وە بیرم لەو ئایەتە کردەوە کە بۆت خوێندمەوە، دەگەڕام بە دوای شوێنەواری گرفتەکە دەبینم من بەردەوام نیم لەسەر نوێژ کردن لەوەتەی چەند ساڵێکە سەیری کاسێت و

شیریتی فیلمی ناشرین وبیَ شەرعی دەکەم، هەرلەبەر ئەوەش ڕقم لە خیَزانم دەبووەوە، لەگەلّ مندالّەکانم، بۆیە دلّتەنگی هەمیشە هاوڕیَم بوو، ویستم ئەو شتە لابدەم لەسەر خۆم بەهۆی عەرەق خواردنەوەم کە چی دلّتەنگیم زیادتر دەبو، گومانم برد سیحرم لیَکرابیَ هەموو فیلم و کاسیَتەکانم کۆکردنەوە و سووتاندنم، و ئاوم کردبەسەریان تاکوو بەتەواوی بڕیاری تۆبەم دا و گەڕامەوە لای خوا.

سویَند بە خوا یا شیَخ لەوەتەی ئەوهام کرد وام دەزانی کیَوی گەورە لەسەر شانمە لەسەر دلّمە، بەلاّم لەسەرم لاچوو دلّم خۆش بوو[1].

## ٥٥٨- مالّەکەم هیچ سوودی بۆم نەبوو

ما أغْنَى عَنِّي مالية

مردن لە بچوك وگەورە جیانابیَتەوە لە دەولّەمەند و فەقیریش لە ئازادو کویَلەش، هارون الرشید ئەو پیاوە بوو کە دەسەلاّتی ئەو هەمو زەوی داگرتبوو، ئەو پیاوە بوو کە سەری بەرز دەکردەوە و بەهەوری دەگوت: بڕۆ باران بباریَنە لە هیندو لە صین لە هەرشویَنیَك کە حەزت لیَ بیَ.. سویَند بە خوا لە هەر شویَنیَك باران بباریَنیت ئەی هەور ئەوا ئەو شویَنە لە ژیَر

(١) جامع رسائل فضيلة الشيخ العريفي، محمد عبدالرحمن العريفي بەرگی (١) لاپەڕە(١٨٦)




دەسەڵاتی منە.

ڕۆژێکیان بۆ ڕاو دەرچوو لە ماڵ بەلای پیاوێك تێپەری پێیان دەگوت: بەهلوول.. رشید پێی گوت: ئەی بەهلوول ئامۆژگاریم بکە.. بەهلوول گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران کوا باوان و باپیرانت تاکو ئەگەنەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ)وەتاکو دەکاتە سەرپشتی باوکت؟

هارون گوتی: هەموویان مردن.

بهلوول: کوا کۆشکەکانیان؟

هارون: ئەمە کۆشکەکانیانە

بهلول: کوا گۆڕەکانیان؟

هارون: ئەمە گۆڕەکانیانە

بهلووك: ئەمە کۆشك و ئەمەش گۆڕ.. بزانم کۆشکی ئەوان چ سوودی گەیاند بە گۆڕەکەیان؟

هارون: ڕاست دەکەیت ئەی بهلوول.. زیاتر ئامۆژگاریم بکە

بەهلوول: کۆشکەکانی تۆ لە دنیادا زۆر فراوان و گەورەن خۆزگە گۆڕەکەشت ئەوها فراوان گەورەدەبوو:

هارون دەستی کرد بە گریان و گوتی: زیاتر ئامۆژگاریم بکە.

بەهلوول: ئەی امیری ئیمانداران.. ئەگەر دەسەلات ومال و سامانی و



گەنجینەکانی پاشای کسری هی تۆ بێ، وەچەندین ساڵیش دنیا ئاوەدان بکەیتەوە — واتە: تەمەن چەندین ساڵ بێ — ئایا دوا ڕۆژی هەموو زیندووێك گۆڕنییە ن وەپرسیاری لە هەموو شتێ لێ ناکرێ؟

هارون: بەڵێ

پاشان خەلیفە هارون الرشید گەڕایەوە، کەوتە سەر جێگاونەخۆش کەوت کاتێ دوکتۆرەکان بێ ئومێد بوون لە چاکبونەوەی، وەهەستیان کرد کە ئەجەلی نزیك بووە، چەند ڕۆژێکی نەخایاند مردن بوو بە میوانی کاتێ هاتە سەر مردن و ناخۆشیەکانی مردن، بانگی سەر لە شکرودەرگاوانی کرد گوتی: هەموو لەشکرم بۆ کۆبکەنەوە، ئەوانیش کۆیان کردەوە، بەشمشێرو زرێ پۆشیان هاتن، ئەوەندە زۆر بون مەگەر خوا بزانێ ژمارەیان چەندبوون هەمویان لە ژێر فەرمانی ئەوبوون، کاتێ چاوی پێ کەوتن — گریا — پاشان گوتی: ئەی ئەو خوایەی کە موڵك و دەسەلاتت هەرگێز ناڕوات ڕەحم بەوەبکە کە موڵك و دەسەلاتی دەڕوات، فەرمانی کرد کفنی بۆ ئامادەبکەن وگۆڕی بۆ هەڵکەنن، فەرمانی جێ بەجێ کرا، چووەسەر لێواری گۆڕەکەی گوتی﴿ مَآ أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ ۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ ﴿٢٩﴾ ﴾[1]، واتە: ماڵ و سامانم سودی نەبوو بۆم، هەمو دەسەلات و سەڵتەنەتم لەناچوو.. ئینجا هەر دەگریا تاکو مرد.. کاتێ گیانی دەرچوو ئەو خەلیفەیان هێنا کە هەموو مولکی دنیا هی ئەو بوو خستیانە نێو چاڵێك کە زۆر تەسك وتریسك بوو، وەزیرو کارگێرو دار

(١) سورە الحاقە (٢٩)

و دەستی لەگەڵ نەچوون یارمەتیان نەداو هاوکاریان نەکرد، خواردنیان لەگەڵ نەنێشت، فەرش وڕایەخیان لە ژێر دانەنا، ماڵ ومولکی دنیا سودی پێ نەگەیاند،

– هەوەها کاتێ خەلیفەی ئەمەوی (عبدالملك ی کوڕی مروان) هاتە سەرمردن زۆر ناڕەحەت بو گوتی: پەنجەرەکانم بۆ بکەنەوە، کە کردیانەوە بینی وا کاسبکارێك لەسەر دوکانەکەی زۆر بەهەژاری دانیشتووە، خەلیفە دەستی کرد بە گریان گوتی: خۆزگە دارتاش دەبووم، خۆزگە حەمباڵ دەبووم، خۆزگە دوکاندارەبووم، خۆزگە نەدەبوومە گەورەی موسڵمان پاشان گیانی دەرچوو[1].

## ٥٥٩- لەبەر خاتری خوا تاوانم نەکرد خواش بۆی قەرەبوو کردمەوە

الدمشقی لە کتێبی (مطالع البدور)دا لە ئەمیری قاهیرە شجاع الدین ی الشرزی دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێکم بینی لەلامان بوو تەمەنی کەمێك بەسەر چووبوو زۆر ڕەش ئەسمەر بو کاتێ منداڵەکانی هاتنەلای هەموویان سپی وجوان بوون لێمان پرسی هۆکار چییە؟ گوتی: ئەو منداڵانە دایکیان فەرەنگیە، منیش سەربوردەیەکم هەیە لەگەڵی، پرسیمان چییە؟ گوتی:

---

(١) جامع رسائل فضيلة الشيخ العريفي، بەرگی (١) لاپەڕە (٢٣٢)




چوومە شام لە سەردەمی لاوێتی و سەردەمی سەلیبەکان، دوکانێکم بەکرێ گرت و کتانم تێدا دەفرۆشت ڕۆژێکیان لە دوکان بووم لەناکاو ئافرەتێکی فەرەنگی هات کە خێزانی یەکێك لە سەر لەشکرەکانی سەلیبی بوو، جوانی ئەو ئافرەتە سەر خۆشی کردم، شتم پێ فرۆشت لە نرخەکەی زۆر بۆم دابەزاند و هەرزانم پێ فرۆشت، پاشان ڕۆیشت، دوای چەند ڕۆژێك پێ چوو هاتەوە لام، منیش شتم پێ فرۆشت و بەنرخێکی هەرزان زۆر دووبارەی دەکردەوە ولێم، منیش درێژەم لەگەڵ دەدایێ لە قسەکردندا زانی کە من خۆشم دەوێت، کاتێ شتەکە گەیشتە ئەو ئەندازەیە.

بەو پیرەژنەم گوت: کە لەگەڵی دابوو: دڵم بەندبووە بەو ئافرەت چارە چییە؟ گوتی: ئەوە خێزانی فلان سەرکردەیە ئەگەر بزانێ هەرسێکمان دەکوژێ بەردەوام لەسەر ئەو حاڵە بووم، تاکو جارێك داوای پەنجا دیناری لێ کردم کە بێتەلام لە ماڵم، منیش هەوڵم دا پەنجا دینارم بۆی کۆکردەوە وپێم دا.

(شەوی یەکەم)

لەوشەوەدا چاوەڕێی بووم بێتە ماڵم، کاتێ خواردن و خواردنەوەمان بۆ هات، کاتێ هەندێ لەشەو ڕۆیشت، گوتم بەخۆم: ئایا شەرم لەوخوایە ناکەیت؟ کە چی تۆ پیاوێکی غەریب ونامۆی لێرە، لەبەردەستی خوای سەرپێچی دەکەیت لەگەڵ ئافرەتێکی گاور (النصرانیە)!!.. چاوم بەرزکردەوە بۆ ئاسمان گوتم: ئەی خوایە بەشاهید بە کە لەو ئافرەتە خۆش






بووم و گەردنم ئازاد کرد لەو پارەیە لەشەرمی تۆ و لەترسی سزای تۆ، پاشان لەسەر جێگاکەی ڕۆیشتم چووم بۆ شوێنێکی تر بۆ نووستن، کاتێ ئەوەی بینی لێم هەستایەوە بە تورەیی ڕۆیشت، بەیانی چوومە دوکانەکەم، کاتێ ڕۆژهەڵاتن و ئافرەتەکە هاتە لام دەبینم توورەیە، سوێند بەخوا ڕووخساری وەکو مانگ دەدرەوشایەوە، کاتێ بینیم گوتم: بەخۆم تۆ چی تاکو خۆت بپارێزیت لەو جوانە؟ ئایا تۆ ابو بکری... عمری.. یان جنیدی عابیدی، یان حسن ی زاهیدی، هەربەوشێوە مامەوە داخم دەخوارد لەسەری کاتێ تێپەڕێ وڕیشت، گەیشتمە پیرەژنەکە پێم گوت: ئەمشەوەم بۆ بێنەوە!!

گوتی: سوێند بە حەزرەتی مەسیح ئەوجارە نایەتەوە تاکو سەد دیناری نەدەیتی، گوتم بەڵێ: هەوڵم دا بۆی کۆبکەمەوە، سەد دینارم کۆکردنەوە پێم دا.

(شەوی دووەم).

کاتێ شەو داهات لەماڵ چاوەڕوانی بووم هات،.. وەکو مانگ دەدرەوشایەوە، کاتێ دانیشت، ترسی خوا بەسەرم زاڵ بوو، گوتم: چۆن فەرمانی خوا بشکێنم لەگەڵ ئافرەتێکی گاوری کافر.. لەبەر خاتری خوا وازم هێنا لێی، بەیانی چوومە دوکانم، دڵیشم هەر سەرقاڵە پێی لە ناکاو بەلای من تێپەڕی، دەبینم تورەیە، کاتێ بینیم لۆمەم لە خۆم دەکرد کە بۆچی وازم لێ هێنا، بەوشێوە بە داخ و پەژارەوە مامەوە، لە پیرەژنەکەم پرسی، پیرەژن گوتی: ڕازی نابێ ئەو جارە تاکو پێنج سەد دیناری نەدەینێ یان ئەبێ لە



خەفەتی بمریت.

گوتم: بەڵێ: دەیدەمێ، هەوڵم دا، بیرم کردەوە کە دوکانەکەم بفرۆشم وەهەموو کەل و پەلیش.. وام کرد پێنج سەد دینارم پێدا..

لەوسەین وبەینەدا بانگ کەرێ بانگەوازی کرد لە بازاڕ گوتی: هۆ خەڵکی موسڵمان، ئەو ڕێکەوتنە ی لە نێوانمان دا هەبوو کۆتایی پێهات لە ئێستاوە تاکو هەفتەیەك مۆڵەت دراوە بە بازرگانەکانی موسڵمان منیش ئەوەی لە ماڵ بوو هەموم کۆکردەوە لە شام ڕۆیشتم ولە دڵیشم ئاهو حەسرەتی ئەو ئافرەتە هەرمابوو دەستم کرد بە فرۆشتنی جاریە (کۆیلەی ئافرەت) بەڵکو خۆشەویستی ئەو ئافرەتم لە دڵدا دەربچێ، سێ ساڵان ئەوکارەم کرد، پاشان جەنگی (حطين) دروست بو (لە نێوان قائد صلاح الدين وسەلیبییەکان) موسلمانەکان گەڕانەوە لای خۆیان، داوای جاریەیەکیان کرد لێم بۆ پاشاکەیان، منیش جاریەیەکی زۆر جوانم هەبو، بەسەد دینار کڕیان لێم، نەوەد دینارم وەرگرت و دەدیناریش بە قەرز مایەوە لە ئەستۆی ئەو قائیدە.

قائیدەکە گوتی: بڕۆن ئەو بازرگانە بێنن بۆ لای ئەو جاریانەی من با لە ئافرەتانی فەرەنگی دانەیەکی بەدڵ خۆی هەڵبژێری لە جیاتی دە دینارەکەی کەماوە.

(دیاری) الجائزة...

کاتێ دەرگایان بۆم کردەوە هەمان ئافرەتی هاوڕێم بینی، ئەوم هەڵگرت و بۆخۆم هەڵبژارد، کاتێ هاتمەوە ماڵێ، پێم گوت: ئایا دەمناسی؟




گوتی: نەخێر

گوتم من ئەو هاوڕێەتم کە بازرگان بوم، کە سەدو پەنجا دینارت لێم وەرگرت وپێت گوتم: دڵت پێم خۆش نابێ تاکو پێنج سەد دینارم نەدەبیتێ کە ئێستا من تۆم بە (دە) دینار کرد بە موڵکی خۆم، ئافرەتەکە گوتی: اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمد رسول الله.

موسڵمان بوو، بە جوانتریت موسلمانبوون منیش مارەم بڕی لە خۆم کەمێکی پێ چوو دایکی سندوقێکی بۆ نارد، کاتێ کردمانەوە دەبینم ئەو دوو کیسەپارەیەی تێدا بوون کە من پێم دابوون، جاری یەکەم پەنجا دینار و جاری دووەم سەد دینار، هەروەها ئەو جل و بەرگەی کە لەبەری دەکرد کە دەهاتە لام لە دوکانەکەم لەولاتی شام.

ئەمە بەسەرهاتی دایکی منداڵەکانم بوو، ئەوەیە کە چێشتتان بۆ دروست دەکات، بەڵێ... کەسێك لەبەر خاتری خوا واز لە شتێك بینێ بێگومان خوا بۆی قەرەبوو دەکاتەوە، بەندە خۆی لە خەڵك دەشارێتەوە، بەڵام چۆن دەتوانێ خۆی لە خوا بشارێتەوە کەچی هەمیشە لە گەڵی دایە[1].

---

( ١) جامع رسائل فضيلة الشيخ محمد العريفي، د.محمد عبدالرحمن العريفي، بەرگی (٢) لاپەڕە(٧٢٩)






## ٥٦٠- دوعای بۆ ئیمانداران دەکرد

ابن الضحاك دەڵێ :

له خەومدا (شريح ی کوڕی یونس)م بینی، پێم گوت: خوای گەورە چی بەسەر هێنای ئەی ابو الحارث؟

گوتی: لێم خۆش بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا کۆشکێکی پێدام له تەنیشت کۆشکی محمدی کوڕی بشیری کوڕی عطاء ی الکندی

گوتم: ئەی ابو الحارث تۆ ئەمڕۆکه لەلای ئێمه له محمدی کوڕی بشیر گەورەتری

گوتی: ئەو قسەیەمەکە: چونکه خوای گەورە بەشی تایبەتی داناوە بۆ ئەو لە کردەوەی هەمو باوەڕدارێکی پیاو و ئافرەت، چونکه ئەو دوعای دەکرد و دەیگوت: ئەی خوایه له مسوڵمانان وئیماندارانی پیاو ئافرەت خۆش بە، بەو هۆیەوە ئەو پلەی وەرگرت لەلای خوای گەورە[1].

---

(١) الف قصه وقصه من حیاه الصالحین والزاهدین بەرگی (٢) لاپەڕە (١٩٤)






## ٥٦١- چەندە تامەزرۆی فێربوونی قورئانە

ئافرەتێك دەڵێ: لە حەرەمی مەكەبووم لە شوێنی نوێژكردنی ئافرەتان لە ناكاو ئافرتێك دەستێكی دا لە پشتم، چەند قسەیەكی كرد بە زمانێك كە عربی نەبوو گوتی: یا حەجە!! یا حاجە!! ئاوڕم لێی دایەوە، دەبینم ئافرەتێكە لە تەمەن مام ناوەندی بوو، وابزانم توركی بوو، سەلامی كرد لێم، خۆشم ویست لە دڵم سبحان الله ڕۆحەكان وەك لەشكری فەرمانپێكراوان دەگەڕێن.. ویستی شتێك بڵێ، هەوڵی دەدا وشەكانی كۆبكاتەوە بە عربی پێم بڵێ، ئاماژەی بۆ ئەو قورئانە كرد كە هەڵمگرتووە، پاشان بە عەرەبییێكی شكاوە گوتی: (تۆ دەخوێنی لە قورئان)؟ گوتم: بەڵێ: دەبینم ئافرەتەكە ڕەنگی سوورهەڵگەڕا چاوی پڕبوون لە فرمێسك، دیمەنەكەی سەرسامی كردم، دەستی كرد بە گریان، گوتم: چیتە؟ بە دەنگێكی پڕلە گریانەوە بەشەرمەزاری سەیری كردم و گوتی: من قورئان ناخوێنم، گوتم: بۆچی؟ گوتی: نازانم بیخوێنم، قسەی تەواو نەكرد لە هاواری گریانی دا، دەستم كرد بە هێور كردنەوەی ودەستم لەسەر شانی دانا، گوتم ئێستا تۆ لە ماڵی خودای، داوای لێ بكە فێر بیت و یارمەتیت بدات بۆ فێر بوونی قورئان فرمێسكەكانم لێ سرینەوە، دەستی بەرزكردەوە وگوتی: اللهم افتح قلبی اقرا قران.. خوایە دڵم بكەیتەوە وفێری قورئانم بكەیت چەند جاری ئەمەی دووبارە دەكردەوە، پاشان ئاوڕی لێ دامەوە گوتی: من دەمرم وفێری قورئانیش نابم، گوتم نەخێر بە یارمەتی خوا فێر دەبیت بەتەواوی خەتمی دەكەیت.






چەند جار گوتم: سورەتی (الفاتحه) دەزانی؟ دڵی خۆش بوو گوتی: بەڵێ: دەستی کرد بە خوێندنەوەی تا کۆتایی، پاشان بۆی دانیشت چەند سورەتێکی بچوکی خوێندەوە کە لەبەری بوون، من سەرسام بووم بە زانینی عەرەبیەکەی کە قسەی دەکرد و باسی ژیانی خۆی دەکرد سەبارەت بە هەوڵی بۆ فێربوونی قورئان ڕەنگی گۆڕا گوتی: دەمرم وفێری قورئانیش نابم، من لە ناو ئاگری دۆزەخم! ! من تەنها گوێ لە کاسێت دەگرم بۆ خوێندنەوە، ئەوە کلامی خوایە، هەر باسی گەورەیی وعەزەمەتی خوای دەکرد، خۆم بۆ نەگیرا لەبەر گریان، ئافرەتێکیش زمان عرەبی نییە لە شارێکی عەلمانیە لەوە دەترسی بمریت وفێری قورئانیش نەبێ، هەموو ئومێدی ئەوە بوو کە قورئان خەتم بکات، دەگریا غەمباردەبوو، دڵی تەنگ ببو، چونکە قورئان ناخوێنی، دەبێ ئێمە حاڵمان چۆن بێ کە فەرامۆشمان کردووە و فێربوین ولەبیر مان کردووە، دەبێ حاڵمان چۆن بێ کە هەموو ڕێگایەکان ئاسنن بۆ فێربون ولەبەرکردن[1]

---

( ١) من روائع العريفي، د.محمد عبدالرحمن العريفي، لاپەڕە (٢٢٤)






## ٥٦٢- تازە هەستم بە ئارامی کرد

د. العریفی دەڵێ :

لە ئەلمانیا بووم، یەکێك لە دەرگای دا، دەبینم ئافرەتێکی لاو لەپشت دەرگا وەستاوە بانگ دەکات، پێم گوت: چیت دەوێ؟

گوتی: دەرگایەکە بکەرەوە، گوتم: من پیاوێکی مسولمانم هیچ کەسم لەلا نییە وجائیز نییە تۆش بێیتە لای من، زۆری لێ کردم منیش دەرگام نەکردەوە، گوتی: من لە کۆمەڵەی پیاوانی ناوداری ئایینم دەرگا بکەرەوە و ئەو چەند پەرتوکانە و ئەو پەڕاوانەش بگرە بۆ خۆت بیخوێنەوە، گوتم: هیچم ناوێ، دەستی کرد بە پاڕانەوە و داوای کردنەوەی دەرگای زۆر کرد، منیش پشتم تێ کرد و چومە ژوورەکەی خۆم و دەرگام نەکردەوە لێ، هیچی بۆنەکرا تەنها ئەوەبوو دەمی خۆی کرد بە کونی دەرگاکەوە و دەستی کرد بە قسە کردن سەبارەت بە ئایینەکەی وەئامانج ومەبەستەکانی ئایینی باس دەکرد بۆم لە کونی دەرگاوە بۆماوەی (١٠) خولەك بانگەوازی لەگەڵ کردم، کاتێ کۆتایی بەقسەکانی هات چومە لای دەرگاکەوە ولێم پرسی بۆ چی بەوشێوە خۆت ئازاردەدەیت؟

گوتی: تازە من هەست بە ئارامی دڵ و دەروونم دەکەم چونکە هێزو توانای خۆم بەخشی و خەرجم کرد لە ڕێگای ئایینەکەم[1]، (ان تکونوا تالمون

---

(١) من روائع العریفي د. محمد عبدالرحمن العریفی لاپەڕە (٣٠٤)






**فانهم يالمون كما تالمون وترجون من الله ما لا يرجون)[1].**

**واتە ئەگەر ئێوە ئازار بچێژن وماندووبن لە برینداربوون وشەڕو بەرەنگاربوونەوەی دوژمن لە جیهاد دا، ئەوا ئەوانیش ئازار دەچێژن وەکو ئێوە، بەڵام ئێوە ئومێدتان هەیە بەشتێك لەلایەن خواوە کە پلەی شەهیدی وپاداشت و سەرکەوتنە، لە کاتێکدا ئەوان ئەو ئومێدەیان نییە (صفوة التفاسیر).**

## ٥٦٣- ترسام لەوەی تۆش لەگەڵ ئەوان بیت

**دەگێرنەوە کە پیاوێك هەبوو هەمو ڕۆژێ هەزار جار لەعنەتی دەکرد لە شەیتان ڕۆژێکیان لە ژێر دیوارێك خەوتبوو یەکێك لە خەوی هاتە لای و بێداری کردەو وپێی گوت: هەستە: چونکە ئەو دیوارە خەریکە دەڕووخێ ودەکەوێتە سەرتا، پیاوەکە گوتی: تۆکێی کە ئەوەندە بەڕەحمی؟ گوتی: من شەیتانم، گوتی: چۆن شتی وا دەبێ کە چیی من ڕۆژی هەزار جار نەفرین لە تۆ دەکەم، شەیتان گوتی: لەبەر ئەوەی زانیم پلەی شەهید چەندە گەورەو پیرۆزە لەلای خوا ترسام لەوەی کە تۆ لەگەڵ ئەوان بیت وبە پلەی شەهیدی بگەیت[2].**

---

**(١) سورة النساء اية (١٠٤)**

**(٢) الف قصه وقصه من قصص الصالحين والزاهدين بەرگی (١) لاپەڕە (٣٩١)**



## ٥٦٤- خوای گەورە لێت خۆش بێ ئەی عبدالله

ابن ابو الزناد دەڵێ: اسمای کچی ابو بکری صدیق کراسێکی پێغەمبەری (ﷺ)لەلابوو، کاتێ عبدالله کوڕی زبێر بەدەستی حجاج شهید کرا (کە کوڕی اسماء بوو) کراسەکە ون بوو، وەکو ون بوو کەس نەیزانێ کێ بردی، اسماء فەرموی ون بونی کراسەکە زۆر لەسەرم بە ئازارتربوو لە کوشتنی عبدالله ی کوڕم، کراسەکەی دۆزییەوە و لەلای پیاوێك لەولاٌتی شام وگوتی: ئەوکراسە بۆ اسماء نانێرمەوە تاکو دوعام بۆ نەکات کە خوا لێم خۆش بێ، ئەو هەواڵە گەیشتە اسماء گوتی: چۆن داوای لێخۆشبوون بکەم بۆ کەسێك عبدالله ی کوڕی زبێری کوشتووە؟

(وادیارە ئەوکەسەی کراسەکەی لەلابوە لە پیاوان و یاریدەدەرانی حجاج بووە).

خەڵکی گوتیان: ئایا کراسەکەت بۆ ناهێنێتەوە؟ اسماء گوتی: پێ بڵێن با بێت، پیاوەکە بەخۆی و بەرکراسەکە هات و (عبدالله)ی کوڕی عروەی کوڕی زبێری لەگەڵ بوو (ئەو عبدالله)یە نەوەی اسماء بوو، چونکە عروەش کوڕی اسمایە وەك عبدالله ی شەهید) اسماء بە پیاوەکەی گوت: کراسەکە بدە بە عبدالله ئەویش دای بە عبدالله، گوتی: وەرت گرت عبدالله؟ گوتی: بەڵێ اسماء گوتی: خوای گەورە لێت خۆش بێ ئەی عبدالله

گوتی: مەبەستم عبدالله کوڕی عرویە[1] واتە: دوعای بۆ پیاوەکەنەکرد

---

(١) الف قصە وقصە من قصص الصالحین والزاهدین بەرگی (١) لاپەڕە (٣٩٧)




## ٥٦٥- زوڵم لە ئێمە و دەعوا لە دوژمن

ڕۆژێکیان کوڕێکی خەلیفە هارون الرشید هاتە لای باوکی گوتی: کوڕی فلان وەزیر جوێنی پێدام بە دایکم هاورن الرشید ڕووی لە مەجلیس کردو فەرمووی: ئەو کەسانە شایەتی چ نەوعە عەزابێکن؟

هەندێکیان گوتیان: کوشتنی، هەندێکی: زمان بڕین، هەندێك بە تالآنکردن و نەفی کردن جوابیان دایەوە.

ئینجا هارون الرشید فەرموی: ئەی کوڕی من، واباشە لێی ببوری ئەگەر ناتوانی تۆش جوێن بە ئەو بدەوە، ئەمما هەر هەندە لە حەد دەرنەچی، وەئیللا زوڵم لە ئێمە و پەیدا دەبێ و دەعوا دەکەوێتە سەر دوژمن

بەوەی قەت ناڵێ ئینسان پیاوی عاقڵ

لەگەڵ فیلی بەقووەت بێتە مەیدان.

بەڵێ مەرد ئەوکەسانەن خۆ بەتەحقیق

قسەی ناخۆش نەکات وەختی لێ قەومان[1]

---

(١) گوڵستان سعدی شیرازی لاپەڕە (١٠٣)






## ٥٦٦- هەندێ لەوتەو ئامۆژگاری یەکانی شێخ عبدالقادر گیلانی

بێگومان هەرکەسی دڵسۆزی وپاکی ناودڵی بنوێنێ لەخواپەرستی و هەموو کاروباریدا بێگومان زمانی دەبێتە کانگای دانایی و حیکمەت هەمیشە ئامۆژگاری وقسەی چاك و پاکی لی ٚهەڵدەقوڵی شێخ عبدالقادری گیلانی یەکێکە لەوزانا بەرزوپایە دارانەی کە هەمیشە زانست و وەرع و خۆپارێزی ئەو لە دنیادا ڕەنگ دەداتەوە لە کاتێك کە ئاکۆژگاری دەبەخشێ وتەکانی ڕێك لەگەڵ دەقی ڕەوشت ی پێغەمبەرن (ﷺ).

شێخ عبدالقادری گیلانی دەفەرموی: (ئامۆژگاریت دەکەم بەلەخواترسان و گوێ ڕایەل بوونی وپابەند بوون بە شەرعی دیار (ظاهر) وسەلامەتی سینە لە ڕەوشتە ناشیرینەکان وەپاکی نەفس و ڕووخۆشی لەگەڵ برا موسڵمانەکەت، هەروەها بەخشینی یارمەتی بەکەسی ناچار و ڕێبوار و لابردنی ئازار لەسەر شان وملی خەڵکی و ئامۆژگاری بەخشین بە بچوك وگەورە و وازهێنان لە ڕقەکاری و ناکۆکی لەگەڵ برا مسولمانەکەت).

– هەروەها دەفەرموێ: (ئەگەر خۆشەویستی ورِق لێبوونەوەی کەسێکت لە دڵدا بێت، ئەوا کردەوەکانی بەرامبەر بە قورئان و سونەت بکە، ئەگەر لە قورئان وسونەت کردەوەکانی وەرنەگیرا بوون ئەوا موژدەت لێ بێ بەوەی کە خوا تۆی سەرکەوتوو کردیت وشوێن پێغەمبەرەکەی کەوتیت و وازت لێ هێناوە لەبەر کردەوە خراپەکانی، وەئەگەر کردەوەکانی موافیق بە قورئان وسونەت بوون تۆش ڕقت لێی هەڵدەستاو خۆشت نەدەویست بزانە






که تۆ هەوەس پەرستیت وبەهەواو هەوەسی خۆت هەڵس و کەوت دەکەیت وە ستەمکاری بەوەی کە ڕەقت لێ دەبێتەوە[1].

## ٥٦٧- زانستێکی ڕوون وئاشکرا

خاتوو عائیشه دایکی ئیمانداران (رضي الله عنهما) زۆر حەزی لە زانست بووە ئەگەر پرسیاری شتێکت لێ بکردایەوە دەچوو پرسیاری دەکرد تاکو بە تەواوی وڕوونی بیزانیایە، ئینجا وەلامی دەدایەوە،

جارێك پێغەمبەر (ﷺ)فەرموی: هەرکەسێك لە ڕۆژی دوای بەوەردی لێ پرسینەوەی (الحساب) لەگەڵ بکرێت ئەوا عەزاب دەدرێت، عائیشه فەرموی: ئایا خوای گەورە نافەرمووی (فاما من اوتي كتابه بيمينه فسوف يحاسب حسابا يسيرا)[2]، واتە: هەرکەسێ کە خاوەن ئیمان و کردەوەی چاك بێت ونامەی کردەوەکانی بدرێتە دەستی ڕاستی ئەوا پرسیاری سووك و ئاسانی لێ دەکرێت بەهۆی ئیمان وکارەچاکەکانیەوە ئەکەوێتە بەر ڕەحمەتی خوا.

پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: ئەوە نامەی کردەوەوەرگرتنە نەك ئامار لەگەڵ کردن، هەرکەسێ بەوردی لێپرسینەوەی کردەوەکانی لەگەڵ بکرێت ئەوا یان دەرناچێ لە ناو دەچێ — یان زۆر ماندوو دەبێ[3].

---

(١) مناقب الشيخ عبدالقادر الكيلاني يونس الشيخ ابراهيم السامرائي لاپەڕە (١٧) چاپی دووەم ١٩٨٨ ز

(٢) سوره لانشقاق (٧–٨)

(٣) رواه البخاری



## ٥٦٨- سوپاس بۆ خوا توشی گوناهێك نەبووم

شێخی سعدی لە کتێبی (گوڵستان) دا دەفەرموێ :

عابیدێکم دیت لە قەراغ بەحرێك، پڵینگ بریندای کردبوو، وبەهیچ دەرمان چاك نەدەبو، لاواز بووبوو، دائیمەن سوپاسی خوای دەکرد و دەیگوت: الحمدلله.. بەو بەلایە گرفتارم نەوەك بە گوناهێك کە شەرمەزاری خوابم[1].

## ٥٦٩- ئیمامی ( عمر ) و ئافرەتە ئەویندارەکە

زیدی کوڕی اسلم دەڵێ: شەوێکیان ئیمامی عمری کوڕی خطاب دەرچوو بەمەبەستی پاسەوانی کردنی، بینی چرایەك داگیرساوە لەماڵێك کە لێی نزیك بوەوە دەبینێ ئافرەتێکی پیرە خەریکی کاری غەزەل بوو، یان پەڕەی دەکرد دەیگوت.

علی محمد صلاة الابرار　　　صلی علیك المصطفون الاخیار

قد کنت قواما بکی الاسحاب　　　یالیت شعري والمنایا اطوار

هل تجمعني وحبیبي الدار

بەو چەند وتەیە سەلاوەتی دەنارد بۆ پێغەمبەر و باسی حاڵی خۆشی دەکرد کە لە شەوان چەند دەگریا تاکو بەیانی، هەوەها خۆشەویستی خۆی

---

(١) گوڵستان سعدی شیرازی لاپەڕە (١٥٨)




بەو چەند دێڕە شیعرە دەردەبڕی بۆی، وەداوای دەکرد کەلەگەڵ پێغەمبەر دا (ﷺ) لەبەهەشت کۆببێتەوە.

کاتێ (عمر) ئەمەی بیست دەستی کرد بە گریان ئینجا لە دەرگای دا، ئافرەتەکە گوتی کێیە؟

گوتی: عمری کوڕی خطاب

ئافرەتەکە: من چ کارم بە (عمر)ە بۆ چی عمر لەو دەمەدا هات؟ ئیمامی عمر: دەرگابکەرەوە ڕەحمەتی خوات لێ بێ، هیچ زیانت پێ ناگات ئافرەتەکە دەرگای کردەوە، عمریش چووە ژوورەکەی وپێی گوت: ئەو چەند وتەیەم بۆ دووبارە بکەرەوە کە تازە گوتت: ئەویش بۆی دوبارە کردەوە، کاتێ گەیشتە کۆتاییەکەی کە دەڵێ(هل تجمعني وحبيبي الدار) واتە: من وخۆشەویستەکەم (مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ)لەبەهەشتدا کۆدەکەیتەوە؟ (عمر) گوتی: منیش لەگەڵ خۆتان ببەن، بۆ ئەوەی پێکەوە کۆببینەوە واتە: ناوی منیش بخەرە نێو بەیتەکەت ئافرەت گوتی: (وعمر فاغفر له يا غفار) ئینجا ڕازی بوو پاشان گەڕایەوە [1].

---

(١) صفحات نيران من حياة السابقات، نذير محمد مكتبي، لاپەڕە (٧٦)



## ٥٧٠- تۆبەی ئافرەتێك كە خێزانی مسلم ی تێك دا

ابو مسلم ی الخولانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) كاتێ دەگەڕایەوە ماڵ سەلامی دەكرد، كاتێ دەهاتە ناوەڕاستی ماڵەكە دەیگوت: الله اكبر، هەروەها خێزانیشی لەگەڵ الله اكبری دەكرد، دەڵێ: كە دەچووە ژوورەكەی عەباوپێلاوەكانی دادەنا و دەست بەجێ خواردنیان بۆ دەهێنا و ئەویش خواردنەكەی دەخوارد.

شەوێكیان هاتەوە گوتی: الله اكبر بەلاَم كەس وەلاَمی نەدایەوە، پاشان چووە بەردەم دەرگاكەوە بینی وا خێزانەكەی دانیشتووە وماڵەكەشی هیچی چرای لێ دانەگیرساوە، بەخێزانەكەی گوت: ئەوە چی یە خێرە ئەوها گۆڕاویت گوتی: خەڵكی هەموویان حاڵیان باشە تۆش ابو مسلم بۆ ناچیتە لای معاویە بەڵكو فەرمان دەكات خزمەتكارێك و هەندێك پارەتیمان بۆ دەنێریت؟

ابو مسلم كە ئەمەی لە خێزانەكەی بیست زۆر ناڕەحەت بوو، وەزانی كە ئەم قسەیە خۆی نییە خەڵكی دڵ و دەروونی تێك داوە و قسەیان لەلای كردوون، بۆیە گوتی: (اللهم من افسد علی اهلی فاعم بَصَرهُ) واتە: ئەی خوایە داوات لێ دەكەم ولێت دەپاڕێمەوە هەركەسێك خێزانەكەمی لەسەرم تێك داوە چاوی كوێر بكەیت.

دەڵێ: لەوكاتەش ئافرەتێك لەوێ بوو پێی دەگوت: تۆ خێزانی ابو مسلم ی بۆ چی بە پیاوەكەت ناڵێ وەكو خەڵك معاویە خزمەتكارێكتان بۆ بگرێ وهەندێ پارەتان بداتێ بۆ پێداویستی ژیانتان..

دەڵێ: لەناکاوبینیان ئافرەتەکە هەر لەوێ مابوو چراش داگیرسابوو، ئافرەتەکە چاوی هیچ نەبینی گوتی: چراکەتان کوژایەوە؟ گوتیان: نەخێر.. گوتی: انا لله چاوەکانم ڕۆیشت.. واتە کوێر بووم.. بەو شێوە هاتە لای ابو مسلم هەر لێی دەپاڕایەوە وداوای لێ بووردنی لێ دەکرد واتە تۆبەی کرد لەوکارەی کە ئەنجامی دا – (ابو مسلم) یش دوعای بۆ کرد خوای گەورە چاوەکانی بۆی گەڕاندەوە، وەخێزانی ابو مسلم وەکو جارانی لێ هات وهاتە سەر حاڵی پێشوو لە ملکەچی وسەبر و ئارامی، هەروەها لەگەڵ ابو مسلم الله اکبری دەکرد وەڵامی سلامی دەدایەوە[1].

## ٥٧١- نەخۆش وسەرپێچی کردن

د. العریفی دەڵێ: ڕۆژێکیان سەردانی نەخۆشێکم کرد کە تووشی دەردێکی ترسناك ببو، نەخۆشیەکە جێگای خۆی کردبوە لەناو لاشەی، لاوازو بێ هێزببو ئێسکەکانی نەرم کردبوون وپێستی خواردبوو.

هەندێ لە هاوەڵانی بە نهێنی پێیان گوتم: دکتۆر گوتویەتی کۆتاییەکەی ڕوون و ئاشکرایە و نزیکە، زانستیش لەلای خوایە.

بە هێواشی چوومە ژوورەکەی، چاوەڕوان بووم دەنگی قورئان پێشوازیم لێ بکات بەرماڵێکی نوێژ لەوی بینیم ڕاخسترابێت بۆ نوێژ، وەنەخۆشەکەش بینیم کە بەبێ تاقەتی ڕووی لە خوا کردبێت.

(١) التوبة وروائع التائبين ابو عمر محمد الزغبی لاپەڕە (٢٢٦)

لە دەرگام دا، مۆڵەتیان پێدام کە بێمە ژووری، نازانی من کێم ونامناسی چوومە ژوورەکەی، هێمنی لەوێ سەریراپبوو، ڕۆشنایش خامۆش کرابوو ژوورەکە لە گۆڕستان دەچو، ئاوێنەکە بە بەشێکی سپی داپۆشرابوو، تاکو خۆی نەبینێتەوە وەنەیبینی کە توکی سەری هەڵوەراوە ئێنجا نەخۆشیەکەی بێتە وەبیر.

منی بینی خۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی لەسەر تەختەکەی دابنیشێ، هەندێك لە هاوەڵانی دانیشتبوون لەلای هەموو خەمی گەورەیان ئەوەبوو کە باسی نەخۆشیەکەی لە بیر ببەنەوە، وا گومانیان دەبرد کە ئەمە گەورەترین خزمەتیە کردوویانە و پێشکەشیان کردووە پێی، ناچاری بکەن کە پێبکەنی؟ بەڵێ: پێکەنین بەڵام بەس ئەوان پێدەکەنین،

لاوە نەخۆشەکەش پێدەکەنی بەقسەیان، یان پێکەنینی بەدەردێخست، نازانم!! بەڵام لە بیری چوو کە نامەی کردەوەکانی لە هەموو چرکەیەك دەپێچرایەوە وە زۆربەی ئامێرەکانی لاشەی ئێستا لەلای لە کار کەوتوون توانای کاریان نییە، لە هەر چرکەیەك بێ دەگونجێ بمریت.

کاتێ دانیشتم یەکێك هەستایەوە دەنگی تەلەفزیۆنەکەی کز کردو نەیهێشت گۆرانیەکانی دەنگ بەرزبکاتەوە، وام هەست کرد کە من پیاوێکی ڕەزاگران بووم لەسەر ملی ئەوان، کۆڕومەجلیس وشەونخوونیم لێ تیك دان.

لا حول ولا قوە الا باللە.. ئەو دڵانە چەند ڕەقن

خۆم ون دەکرد لە سووچێکی ژوورەکە، دەمخواست کەیەك قورئان



ببینم، بەرماڵ نوێژ تەسجیل و کاسێتی قورئان.. بەڵام زۆر بەداخەوە، شتی وام نەبینی لەوژووره، ئەوەی لەوێ بوو هەموی گۆڤارو ڕۆژنامە بوون، وێنەی مەلیکە جمالی فەرەنسایی لەسەر یەکێکیان بوو، یەکێکی تر وێنەی گۆرانیی بێژی لەسەر بوو، وابزانم دێتەوە یادم وێنەی ئەو نەخۆشەم لەسەر ڕۆژنامەیەك بینی چەندین جار لەسەر بابەتی وەرزش وگەنجان هەمووی لە تەیشتی بوو لاپەڕە بەلاپەڕە چەندین جار هەڵی دەدانەوە.

لەڕاستیدا دەگریام وسەیرم دەکرد، چەندین فرمێسکم لە چاوەکانم باراند هاوڕێیانی هەوڵیان دەدا منیش لەگەڵیان بەشداری بکەم لە پێکەنین بەڵام من موجامەلەم دەکرد لەگەڵیان وبەزەردەخەندەوە ئاوڕم لێ دەدانەوە.

یەکێ لەوانە شتێکی سەیری گێڕایەوە، کە گوێی لە موحازەرەیەکی من بووە، یان لە شاشەی تەلەفزیون بینیویەتی، بۆ ئەوەی نەخۆشەکە پێبکەنی، وەمنیش چیتر نەگریم و پێبکەنم، بەستەزمان واگومان دەبات کەسێبەرەکەی بچووك وباریکە قسەی سەیرو پروپووچی فڕێ دەدا بەرامبەر ئەوانی تر، لەڕاستیدا خوێنی زۆر گران بوو، نزیك نەبوو خۆی بێ دەنگ بکات، چۆن ئەگەر قسە بکات.

بەزەردەخەنەوە سەیرم دەکرد، ولەدڵی خۆشم دەمگوت: ئاااااه مااااه

ئارام دەگرم لەسەریان، بەرگەی کۆڕومەجلیسیان ناگرم، مۆڵەتم وەرگرت بچمە دەرێ، لەناوقاوشی نەخۆشخانە چەند هەنگاوێکم نا، کاتێ نزیکی دەرگا بوومەوە بە خۆم گوت: نابێ بڕۆیت تاکو بەڕاستی ئامۆژگاری ئەو






نەخۆشەنەکەیت، بۆی هەیە ئەمە ئاخیر دیداریێ لەگەڵ مان، کەچی هەروابوو ئاخیر ریداربوو. گەڕامەوە لای، لەدەرگام داو چوومە ژووریێ، داوام کرد لە هاوڕێیانی بەتەنیا بەجێمان بێلن بۆ ماوەی کەمێك.

دەرچوون وبەهێمنی دەرگایان داخست، من و یاسر بەتەنیا لە ژوورەکە بووین، زۆر بە وردی سەیری دەکردم، وابزانم دەیزانی کە چ دەڵێم..

بەڕاشکاوی گوتم: یاسر کاتی موجامەلەنەما، دەزانی کە من تۆم زۆر خۆش دەویێ، کە خۆم سەرقاڵ کردووە و کارم بەجێ هێشتووە تەنها لەبەر خاتری تۆبووە هاتووم بۆ ئێرە، کاتێ زانیم نەخۆش کەوتیت نارەحەت بووم، بەوهەواڵە وابزانم غەمباری منیش کەمتر نییە لە غەمباری تۆ، تۆ ئەگەر فرمێسك بۆ خۆت دەڕێژیت لەسەر نەخۆشیەکەت، ئەوا من خوێن دەبارێنم لە چاوانم لەسەر تۆ سەری داخست و گریا منی خنکاند بە پەند وەرگرتن گوتم: یاسر کە هاتمە لات تۆم دەناسی، واگومانم برد کە ئێستا تۆ لەسەر بەرماڵی نوێژی وە قورئانێکت بەدەستەوەیە، تۆ وەك پیاوێکی کە ئێستا بەڵێنت پێدراوە بە خانەی مانەوە (ڕۆژی دوایی) یاسر.. پزیشك پێی گوتیت کە نەخۆشیەکەت چییە وچەند ڕۆژێکی دیاری کراوت ماوە لە ژیانی دنیادا، تۆ نازانی ئایا نوێژی جومعەی داهاتوو لەکەڵمان نوێژ دەکەیت یان ئێمە نوێژت لەسەر دەکەین گریانی زیاتر بوو.

گوتم: یاسر، دەبێ هەر نامەکانی کردەوەت بپێچرێنەوە ئەگەر کەسێکی ساغ فەرمانی پێکرابێ کە خوای خۆش بوێت و گوێ ڕایەڵی بێ لە دەبێ






کەسێکی نەخۆش و دەردەدار چۆ بێ، ئەو دەبێ زیاتر لە لەش ساغەکە ئاگادار بی، یاسر.. لە هەرکوێ یەك بیت، باسی تۆم کردووە لە پێشتر وەپێم ڕاگەیاندی وئاگادارم کردیتەوە کە دەبێ دوعاو پاڕانەوە واستغفار وزیکر ئەنجام بدەیت، یاسر.. کوا دڵەنەرمەکت، کوا خواپەرستی یە جوانەکەت کە لە تۆم دەبینی یاسر.. کوا ئازایەتیت کوا پاڵەوانیتێت کە بڕیارت دابوو ولەسەری کوا وتەکەت کە دەتگوت: پێویستە مرۆڤ تف لە ڕووی شەیتان بکات و ئاوڕ لەوسوەسەی نەداتەوە.

چۆن ئەوەندەزوو لە خوا دورکەوتیتەوە کە چی زۆرت پێویست پێی هەیە گریانی زیاتر بوو.. هێورم کردەوە بەچەند وشەیەکی خۆش و سوپاس گوزاری.

پاشان دەرچووم لە ژوورەکەی وبەجێم هێشت.

دوای سێ ڕۆژ نوێژمان لەسەر کرد.

ڕەحمەتی خوای لێ بێت وپلەی بەرزبێ امین[1].

---

( ١) من روائع العريفي د.محمد عبدالرحمن العريفي، لاپەڕە(٤٦٧)






## ٥٧٢- ئافرەتێك لەبەرخوا پەرستی خۆشی دنیای لە خۆی حەرام كردووە

محمدی كوڕی قدامە دەڵێ: هەواڵمان پێگەیشتوە، كە ئافرەتێك هەیە ناوی (حسنە)یە هەموو چێژو خۆشیەكانی دنیای وەلا ناوە ڕووی كردۆتە خواپەرستییێكی ڕاستەقینە، لە ڕۆژدا بە ڕۆژووە، لە شەویشدا سەرقاڵی خواپەرستی و زیكرو یادی خوایە، هیچ شتێكی لە ماڵدانییە، هەركاتێ تینووی دەبێ دەڕووات لە ڕووباری بەدەستی خۆی ئاو دەخواتەوە، وادیارە ئافرەتێكی زۆر جوان و شۆخ وشەنگە، ڕۆژێكیان یەكێ لە ئافرەتان پێی دەڵی: بۆ چی شوو ناكەیت؟

ئەویش گوتی: پیاوێكی زاهید و خواناسم بۆ بدۆزەوە كە داوای هیچ شتێكی دنیام لێ نەكات، وابزانم ناتوانی شتی وابكەیت وئەوجۆرە كەسانە بدۆزیتەوە، سوێندبەخوا ئەوە لە دڵمدا نییە كە دنیا بپەرستم وچێژ لەگەڵ پیاوان لە ژیانی دنیادا وەرگرم

ئەگەر پیاوێكت دۆزیەوە كە بگری و بمگرێنێ وبەرۆژوو بێ و خێرو چاكە بكات و منیش هان بدات بۆ چاكە ئەوە بەڕاستی شتێكی چاكە ئەگەر نا سڵاو لە پیاوان[1].

---

(١) صفحات نيرت من حياه السابقات نذير محمد مكتبى لاپەڕە (١٠٤)






## ٥٧٣- قورس ترین وسووك ترین شت لەسەر بەندە

سَلْمیِ دەڵێ: خوشكی بشری الحافی گوتی :

قورس ترین شت لەسەر بەندە گوناهو تاوانە، وەسووك ترین شت لەسەری تۆبە كردنە، بۆ چی شتە قورسەكەی كە گوناهو تاوانە لانابات بەشتە سووكەكەی كە تۆبەكردن و بەشیمان یە لەسەر كردەوەی خراپ؟!![1]

## ٥٧٤- دایكێك ئامۆژگاری كچەكەی دەكات

دایكی احمد كچی عائیشە كچی ابو عثمان النیسابوری دەڵێ: دایكم پێی گوتم: بەوشتە دڵ خۆش نەبیت كە لە ناودەچێ، وەدڵت غەمبارو بەپەژارەنەبێ بۆ شتێك كە دەڕوات، دڵت بە خوا خۆش بكە، وەخەم و پەژارە و ئازارت با لەسەرئەوەبێ كە لەبەر چاوی خوای گەورە بكەویت هەورەها پێ دەگوتم: پابەندبە بە ڕێز و ئەدەب بە نهێنی و بە ئاشكرایی هەركەسێ: بێ ڕێزی نواند بە ئاشكرایی ئەوا بە ئاشكرایی سزا دەدرێ، وەهەركەسێ بە نهێنی بێ ڕێزی بنوێنێ ئەوا بە نهێنی سزا دەدرێ[2].

---

(١) صفه الصفوه ابن الجوزی بەرگی (٢) لاپەڕە (٥٢٦)

(٢) صفحات نیرات من حیاة السابقات نذیر محمد مكتبي لاپەڕە (٢٢٩)






## ٥٧٥- دڵسۆزی لە دوعاکردندا

ڕۆژێکیان خەلیفەی راشید عمری کوڕی عبدالعزیز بەلای پیاوێك تێپەڕی کە چەند وردە بەردێکی لەدەستدا بوون یاری پێ دەکردن ودەیگوت: (اللهم زوجني من الحور العين) ئەی خوایە حۆریە چاوجوانەکانی بەهەشتم لی ٚمارە ببڕە، ئیمامی عمر بۆی هەستایەوە پێ گوت: بەڕاستی تۆ خراپترین داخوازی کاری کە داوای شتێك لە خوا دەکەیت بۆچی ئەو بەردانە فڕێ نادەیت وبەدڵسۆزی لەخوا بپاڕێیەوە، هەر لەو شوێنەدا عمر ڕونی کردەوە کە وا مەرجەکانی دواگیرا بوون، ئەوەیە دڵسۆز بێ لە دوعا کردندا وە دڵت ئامادە بێ کاتێ زمانت قسە دەکات، نەك دڵت لەلایەك بێ وزمانیشت سەرقاڵ بێ بە دوعا کردن، ئەمەش بە بەڵگەی قورئان و سونەتی پێغەمبەرە (ﷺ):

﴿ فَٱدۡعُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾ غافر: ١٤.

واتە: بە دڵسۆزی ولە ناخی دەروونەوە بانگی خوابکە ئاینی ڕاست و ڕەوابۆ ئەوە.

(ادعو الله وانتم موقنون بالاجابة واعلموا ان الله لا يستجيب دعاء من قلب غاقل لاه) رواه الترمذي (٤٨٣/٥) واتە: بانگی خوابکەن لێی وەپاڕێنەوە، لە کاتێك کە ئێوە دلنیا بن لەوەی کە وەڵامتان دەداتەوە، وەهەروەها بزانن کە خوای گەورە وەڵامی ئەو دوعایە ناداتەوە کە لە دڵێکی غافل وبێ ئاگا هەڵدەقوڵێت کە نازانی چ دەڵێ [١].

---

(١) الدوله الامويه، د.علی محمد الصلابی بەرگی (٢) لاپەڕە (١٦٩)






## ٥٧٦ - لە خزمەتی سفیان الثوري دا

ئیمامي الذهبي دەفەرمووێ: سفیان الپوری بەڕاستی خاوەن وەرع و خۆپارێزی و خواپەرستێکی وابوو کە ناوی دەرکردبوو لە سەردەمی خۆی

-ابن وهب دەڵێ: (سفیان ی الثوري)م بینی لە حەرەمی مکەدا لە دوای نوێژی مەغریب هەستایەوە بۆ نوێژی سونەت، سوجدەیەکی بردو سەری بەرز کردەوە تاکو بانگی عیشا،

-علی کوری فضیل ی کوڕی عیاض دەڵێ: چوومە کەعبە مەبەستی طوافم هەبوو بینیم سفیان نوێژ دەکات ولە سوجدەیە، جارێك سوڕامەوە لە دەوری کەعبەدا دەبینم هەر لە سوجدەیە، جاری دووەم بەهەمان شێوە هەر لە سوجدەبوو، حەوت طوافم کرد واتە: نەوەدو چوار جار بە دەوری کەعبە سوڕامەوە ئەو هەر سەری بەرز نەکردوە و هەر لە سوجدەی دا بوو.

عبدالرزاق کە یەکێکە لە قوتابیەکانی دەڵێ: کاتێ سفیان هاتە لامان، گۆشتم بۆی ئامادە کرد لەگەڵ خەل، پاشان دەستی کرد بە خواردنی ئینجا چوم مێوژی (طائف)م بۆی هێنا، خواردی، پاشان هەندێ مێوژی ترم بۆی هێنا ئەویش خوارد، کاتێ تەواوبوو لە خواردنی، هەستایەوە و خۆی پێچایەوە و گوتی: ئەی عبدالرزاق: دەڵێن ئالیك بدە بە کەرو ئازاری بدە، واتە ئیشی پێ بکە، ئینجا هەستا نوێژی کرد تاکو بەیانی ماشاءالله

-خەلیفە ابو جعفری منصور ناردی بە شوێنی تاکو بیکاتە قازی بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە ·وەنەیویست ببێ بە قازی، خەلیفە بەمە زۆر تووڕەبوو،






گوتی: ئەی غلام.. شمشێرو پارچە ·پێستێك ئامادە بكە (بۆ سەر بڕینی سفیان) كاتێ ئامادەیان كرد و سفیانیش دڵنیابوو كە سەری دەبڕن بە خەلیفەی گوت: ئەی خەلیفە مۆڵەتم بدە تاكو بەیانی.. ئەویش مۆڵەتی پێدا

كاتێ شەو تاریك بوو كەڵ و پەلی خۆی خستە سەر ئێسترەكەی، وەهیچ منداڵ و خێزانیشی نەبوو یەكسەر لە كوفە ڕای كرد.

كاتێ بوە بەیانی ابو جعفری منصور چاوەڕوانی دەكرد كە بێت بۆ ئەوەی سەری ببڕێ، كاتێ بووە چێشت تەنگاو هەر نەهات و گوتی بەوانەی لە دەوری بوون، بڕۆن بەدوای سفیان بۆ ئێرە بیهێنن، ئەوانیش بە دوای گەڕان و نەیاندۆزیەوە.

گوتیان: ئەو لەبەرەبەیاندا ڕایكردووە، بۆیە خەلیفە تووڕە بوو هەواڵی نارد بۆ هەمو پاشا و گەورەی ولاتان: هەركەسێك سفیانم بۆ بگرێ چ بە زیندوویی چ بە مردوویی ئەوە و ئەوەی پێ دەبەخشم (واتە: دیارێكی گەورەی دانابوو بۆی)

سفیان ڕایكرد كەس نەیزانی بۆ كوێ چووە، بەخەیاڵی داهات كە بچێتە یەمەن، بەڕێ كەوت بۆیەمەن بەڵام لە ڕێگادا خواردن و پێداویستی لێ برا، بۆیە بڕیاری دا كە ببێتە ڕەنجبەری باغەوانێك لە گوندێك كە لە سەڕێگای یەمەن بوو، چەند ڕۆژێكی پێچوو كاری كرد لەوێ، پاشان خاوەن باغەكە بانگی كرد گوتی: تۆ خەڵكی كوێ ی؟ كە چی ناشزانی كە ئەو سفیانی ثوری یە كە زاناو خواپەرست وزاهیدە سفیان گوتی: خەڵكی (كوفە)م






باغەوان: خورمای کوفە خۆشترە یان خورمای ئێمە؟

سفیان: نازانم من نەمچێژتووە تاکو بزانم کامیان خۆشترە.

باغەوان: سبحان الله !! خەڵکی دەوڵەمەندو فەقیر و هەمو کەس، تەنانەت ئاژەڵ و کەرو سەگیش لەبەر زۆری خورمای ئێمە لێی دەخۆن تۆش هێشتا نەتخواردووە،

بۆ چی ناخۆی، کە چی تۆ کار لەوباغە دەکەیت؟

سفیان: لەبەر ئەوە تۆ نەتگوت لێی بخۆ تەنها گوتت کار بکەم.

باغەوان سەرسام بوو لێی زانی کە ئەو بەڕاستی پیاوێکی خۆپارێزو متورعە بۆیە پێی گوت: وا خۆت لە حەرام دەپارێزی هەردەڵێ سفیانی پوری سفیانیش بێ دەنگ بوو ڕۆیشت بۆ سەر کاری.

خاوەن باغەکە لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆی دەرچوون لەماڵ باسی هەواڵی سفیانیان دەکرد.

باغەوان بە هاوڕێکەی گوت: من خزمەتکارێکم لەلایە وگەنجە زۆر خۆپارێزو زاهیدو لە خوا ترسە سوێند بە خوا دەڵێ سفیانە.

هاوڕێ گوتی: دەی بزانم نیشانەکانی چۆنن؟

باغەوان: باسی هەمو نیشانەکانی بۆی کرد.

هاوڕێ: سوێند بە خوا ئەمە سفیانە، سوێند بە خوا جگە لە ئەو کەسی تر نییە بە باغەوانی گوت: وەرە بچین بیگرین بەڵکو دیاری خەلیفە بەرمان





ده‌كه‌وێ چونكه پاره‌یه‌كی زۆری داناوه بۆ ئه‌و كه‌سه كه سفیانی بۆ بگرێ

كاتێ هه‌ردووكیان هاتن بۆ ناو باغه‌كه، ده‌بینن سفیان كه‌ل و په‌لی كۆكردۆته‌وه ڕایكردووه بۆ یه‌مه‌ن، سفیانه گه‌یشته یه‌مه‌ن، پاشان هه‌ندێ له خه‌ڵك زانیان كه ئه‌مه سفیان ئه‌وه‌نده‌ی نه‌برد تاكو تۆمه‌تی دزیان وه‌پاڵ نا، بردیانه لای والی یه‌مه‌ن، كاتێ هاته به‌رده‌ستی والی، خه‌ڵكی هاواریان كرد، كاتی والی سه‌یری سفیانی كرد بینی كه پیاوێكی به‌ڕێزو به ویقاره سیمای ئه‌هلی چاكه‌ی له ڕوخساری ڕه‌نگ ده‌داته‌وه، پێی گوت: دزیت كردووه؟

گوتی: نه‌خێر سوێند به خوا دزیم نه‌كردووه.

والی گوتی: ئه‌وان ده‌ڵێن دزیت كردووه.

سفیان گوتی: ئه‌مه تۆمه‌تێكه بۆمنیان هه‌ڵبه‌ستیوه بگه‌ڕێ به‌نێوكه‌ل و په‌لیان بزانه كێ دزی كردووه

والی فه‌رمانی كرد كه بڕوات له‌لای وه‌گوتی پێیان: تاكو لێكۆڵینه‌وه‌ی له‌سه‌ر ده‌كه‌ین.

پاشان پێی گوت: ناوت چییه؟

گوتی: ناوم عبدالله یه

گوتی: سوێندت ده‌ده‌م ده‌بێ ناوی ڕاستیم پێ بڵێت، هه‌مومان به‌نده‌ی خواین

گوتی: ناوم سفیانه






والی: سفیانی کوڕی کێ؟

سفیان: سفیانی کوڕی عبدالله

والی: سوێندت دەدەم کە بەڕاستی ناوی خۆت و باوکتم ونازناوم پێ بڵێت

سفیان: ناوم سفیانی کوڕی سعیدی ثوری یە

والی: بەڵێ

والی: تۆی کە لەبەر دەستی خەلیفە ابو جعفری منصورت ڕاکردووە؟

سفیان: بەڵێ

والی: تۆی کە داوای قەزاوەتیان لێ کردوویت و تۆش نەتکرد؟

سفیان: بەڵێ

والی: تۆی کە خەلیفە دیاری داناوە بۆ ئەو کەسەی کە تۆ بدۆزێتەوە؟

سفیان: بەڵێ

لەوکاتە دا والی یەمەن سەری داخست و پاشان سەری بەرزکردەوە پاشان گوتی ئەی ابو عبدالله (ئەمە کونیەی سفیان بوو کاتێ والی زانی کە سفیانە کونیەکەی بیر هاتەوە کە ابو عبدالله یە) لێرە بمێنەوە لەلای من ئەگەر حەز دەکەیت وەهەرکاتێ حەزت کرد برۆی ئەوا دەتوانی برۆیت سوێند بە خوا ئەگەر خۆت لە ژێر قاچی من بشارێتەوە قاچم بەرزناکەمەوە ودالتەت






دەدەم وپارێزگاریت لێ دەکەم،

لێرەدا سفیان چووەدەرەوە بەڵام داوای نەکرد کە لەلای والی بمێنێتەوە بەڵکو ڕۆیشت بۆ مەکە، ابو جعفر بیستی کە سفیان لەمەکەیە، کاتەکەش کاتی وەرزی حەج بوو، ابو جعفر دارتاشەکانی نارد بۆ مەکە وگوتی ئەگەر سفیان تان بینی یەکسەر هەڵیواسن، دارتاش هاتن و داریان دانا لە زەوی بۆ هەڵواسین چوونە ناو حەرەم و بانگی سفیان یان دەکرد، سفیانیش زانایان دەوریان دابوو پرسیاریان لێ دەکرد و ڕێزیان دەگرت، سەری خستبووە نێو کۆشی فضیل ی کوڕی عیاض وقاچەکانیشی لەلای ابن عیینە بوون، گوتیان ئەی ابو عبدالله لە خوابترسەو دوژمنمان بێ خۆش مەکە، دەڵێ: چووە ژێر دیواری کەعبە و دەستی گرت بە پەردەی کەعبە ودوعای کرد وگوتی: دوورم لێ ئەگەر ئەبوو جعفری منصور پێی بگات وبێتە ژووری کەعبە، دەڵێن دوعای گیرابوو لە ڕێگادا مرد پێش ئەوەی بگاتە مەکە، ئەو هەواڵەیان گەیاندە سفیان و ئەویش هیچی نەگوت[1].

## ٥٧٧- ئێمە لەوەری بەهاردایین بەڵام جوانیەکەی نابینم

پیاوێ:ی نابینا دانیشت لەبەردەرگای باڵاخانەیەکی گەورە و پارچە نووسینێکی لەسەر کاغەزێکی گەورە لە پێش خۆی دانابوو، لەسەری نووسیبوو (من پیاوێکی نابینام داواتان لێ دەکەم هاوکاریم بکەن).

---

(١) من روائع العريفي، د. محمد عبدالرحمن العريفي، لاپەڕە (٥٠١).






پیاوێك بەوێدا تێپەڕی کە پیشەی نوسین و هەڵواسینی نوسراوەکانی ڕێکلامی بازرگانی و ئەو جۆرە شتانە بوو، لەوێ ڕاوەستا بینی کە پارچە نوسراوەکەی نرخێکی ئەوەندە زۆر ناکات تەنها چەند قروشێك دەکات، هەندێك شتی بۆی زیاد کرد وبەبێ ئەوەی نابیناکە ئاگای لێ بێ نووسراوەکەی لەبەردەم هەڵگرت و بردی لەلای خۆی ڕێکلامێکی تری بۆ نووسی کاتێ نوسراوەکەی بۆ تەواوکرد، هێنای لەبەردەم نابیناکەی دانا و ڕۆیشت هەر لەو ڕۆژەدا پیاوەکە (کە نوسراوەکەی بۆی گۆڕی) بەوێدا تێپەڕی تەماشای کرد بینی بەردەم پیاوە کوێرەکە پارەیەکی یەکجار زۆری لێیەوە خەڵکی بێ ئەندازە یارمەتیان داوە، پیاوەکە زانی کە ئەمە کاری ئەوە و بەهۆی گۆڕینی نوسراوەکەبوو، نابیناکە پرسیاری کرد وگوتی: ئەگەر ئەمە هۆکارەکەی گۆڕێنی پارچە نوسراوەکەیە چی لەسەر نووسرابوو؟

وەڵامی دایەوە گوتی: هیچ نەبوو تەنها ڕاست گوییی بەس ویستم بۆت نوێ بکەمەوە (واتە: هەروەك هی پێشترم بۆ نووسیبوو)

ئینجا پیاوەکە پێکەنی و ڕۆیشت، نابیناکە نەیزانی کە چی بۆ نوسرا لە جاری دووەم.

بەڵام لەسەر پارچەکەی نووسرابوو (ئێمە لەوەرزی بەهاردایین، بەڵام ناتوانم جوانی وشۆخ وشەنگی بەهار ببینم) (١).

---

(١) هل فات الأوان لتبدأ من جديد، باسل شێخۆ، لاپەڕە (١٤٣).



## ٥٧٨- ئەو جارە لە بیری ناکەم

دەگێرنەوە کە پیاوێك ڕۆژێك دەچێتە باخچەی ئاژەڵان، دەبینی لافیتەیەك هەڵواسراوە لەسەری نووسرابوو (ترسناکە.. لە شێر نزیك نەکەویتەوە) بەڵام نوسراوەکەی لە بیر چوو بوو یەکسەر دەستی خستە نێو قەفەسەکەوە شێرەکەش پەلاماری دەستی دا و نزیك بوو دەستی تەواو لەلاشەی جیابکاتەوە، بەڵام لەبەر هەبوونی پزیشك و تیمارکردنێکی بەپەلەو چاکساز دەست بەجێ نەشتەرگەرێکی ئاساییان بۆ کرد و چاك بوەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پیاوە سەرسام بوو بەو وەزعەی هەر بە خۆی دەگوت: بۆ چی شێر پەلامارم دەدات من پیاوێکی پاك وبێ زیانم تەنها ویستم گاڵتەی لەگەڵدا بکەم، هەرگیز باوەڕم نەدەکرد کە بەو شێوە ئازارم بدات ئەو جارە لێی خۆش بووم ولەبیرم چوو کە چی ڕوویدا لە پێشتر.

دوای دو هەفتە هەمان پیاو سەردانی باخچەی ئاژەڵانی کرد و سەردانی هەمان قەفەسی کرد کە شێری تێدابوو، جارێکی تر دەستی خستە نێو قەفەسەکەوە، بەڵام ئەو جارە شێرەکە پەلاماری داو بەتەواوەی قۆڵی هەمووی گرت و خستیە دەمیەوە، پاشان بەری دا، بەپەلە ئەو پیاوە گواستراوە بۆ نەخۆشخانە، بەڵام موعجیزە بوو کە ئەو جارە ڕزگاری بوو لە شێر دوای شەش مانگ وجاری سێ یەم هاتەوە بۆ هەمان باخچەی ئاژەڵ وبەرامبەر بەقەفەسی شێر وەستا و گوتی: (من دەزانم کە تۆ نەتویست من

ئازاربدەیت ئەوەڵێت خۆش بووم، بەڵام ئەوجارە لە بیری ناکەم)[1].

-پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرمووێ

(لا يلدغ المؤمن من جحر واحد مرتين)

واتە: پیاوی بڕوادار دووجار لەیەك كووندا دەستی ناگەزترێت.

## ٥٧٩- هەوڵ بدە داوای زاست بكە

الحميدی دەڵێ: گوێم لە ئیمامی شافعی بوو دەیفەرموو: من لە پێشتر دا لە کاتی منداڵیم زۆر هەوڵم دەدا کە خۆم شارەزابکەم لە بواری شیعر، هەر داوای شیعرم دەکرد دەمنوسیەوە، ڕۆژێکیان لە (مکه) دەڕۆیشتم گوێم لە دەنگێك بوو دەیگوت: ئەی محمدی کوڕی ادریس هەوڵ بدە داوای زانست بکە، دەڵێ: منیش ئاوڕم لەولاو ئەولادایەوە کەسم نەبینی، گەڕامەوە داوای زانستم کرد ولەسەر پارچەم دەنووسیەوە دەمکردە نێو جانتاکەوە تاکو پڕبوو [2]

(١) هل فات الأوان لتبدأ من جديد، لاپەڕە (٨٨).

(٢) حلية الأولياء، ابو نعيم الأصفهاني، بەرگی (٩) لاپەڕە (٧٢).




## ٥٨٠- چرکەکان لە تەمەنت کەم دەکەنەوە

قتادەی کوڕی خلید دەڵێ:

بە پیاوی ئیماندار ناگەیت مەگەر لە سێ شوێن نەبێ:

-لە مزگەوتێك کە ئاوەدانی دەکاتەوە بە نوێژ و زیکرودیاری خوا.

-لە ماڵێك لە ئەو ماڵە دایدە پۆشێ و پارێزگاری لێ دەکات، وەکاتی خۆی لەوێش بەزایە نادات.

-بگەڕێت بە دوای کاروباری دنیاو پێداویستی ژیان و گوزەرانی خۆی وماڵ وخێزانی کە بزانێ تووشی گوناهو تاوان نابێ.

-عبدالله ی کوڕی مسعود دەفەرمووێ:

هیچ کاتێك بەوشێوە پەشیمانی ڕووی تێنەکردووم، وەك ئەوەی کە پەشیمانی ڕووی تێ کردم لەسەر ئەو ڕۆژەی کە تیشکی خۆری تێدا ئاوابوو لەتەمەنی منی کەم کردەوە و هیچی لە کردەوەکانم زیادنەکرد.

-فضیل ی کوڕی عیاض دەفەرموێ:

چەند کەسێك دەناسم کە ئەوەندە گرنگی بەکات دەدەن وبەهیچ شێوەیەك بەزایەی نادەن مەگەر لە شتی چاك وپاك نەبێ کە قسەو گفتوگۆ کانیان دەژمێرن لەو جومعەیە تاکو جومعەی داهاتوو.

-کۆمەڵێك چوونەلای یەکێ لەخواپەرستانی سەلەفی صالحین بەمەبەستی سەردان وقسەکردن.. گوتیان وابزانم کاتیشمان گرتیت؟



گوتی: ڕاست دەکەن خەریکی قورئان خوێندن بووم کە هاتن قورئان خوێندنەکەمتان بڕی.

-هەروەها ئیمامی شافعی دەفەرمووێ: ئەگەر کات لە شتی چاك بەسەرنەیت ئەوا شەیتان ناچارت دەکات کەوا بەشتی خراپ بەسەری ببەیت وتووشی باطل دەبیت[1].

## ٥٨١- ئەگەر حەقی دەدەیتەوە ئەگەرنا بانگ دەدەم

ابن کثیر دەفەرمووێ: لەسەر دەمی خەلیفەی عباسی المعتضد پیاوێکی فەقیر و بێ دەسەلات هەبوو، ماڵ و پارەیەکی زۆری لەلای یەکێك لەگەورە بەرپرسانی ئەوە سەردەمەدا هەبوو، داوای لی دەکرد و ئەویش هەر درێژەی پێدەدا و گرفتی بۆ دروست دەکرد کە نەیداتەوە، وای لێهاتبوو هەر جارێ داوای مافی خۆی دەکرد ئازاری دەدا وفەرمانی بە خزمەتکارەکانی دەکرد لە لێی بدەن ڕۆژێکیان چووە لای سەر لەشکرێکی جەنگی شکاتی لەلاکرد، ئەویش چوو داوای لێ کرد کە پارەکەی بداتەوە بەڵام هیچ سوودی نەبوو تەنها گوتی: هیچ ماڵی کەسم لەلانی یە وانکاری لێ کرد، پیاوە بێ دەسەلات و هەژارەکەش دەڵێ: هەر ئەوەندە کە بێ ئومێد بووم لەوەی کە پارەکەم بداتەوە و غەمباری تەواو دایگرتم لەناکاو بەوشێوە هەر دەگەڕام ونەرمدەزانی بچمە لای کێ سکالای حاڵم بکەم پیاوێك پێی گوتم: بۆ ناچیتە لای فلان

(١) صحيح وصايا الرسول، سعد يوسف ابو عزيز، بەرگی (٢) ل (٤٣٨).




بەرگدروو (الخیاط) کە ماڵیان لەبەردەم مزگەوتە، گوتم: چاکێ دەتوانێ کار لەو ستەمکارەبکات تاکو خەیات بیکات، دەیبینی گەورە بەرپرسانی وڵاتیش هیچیان بۆ ناکرێ، پیاوەکە گوتی: نەخێر خیاط زۆر چاکترە وەزۆر خەڵکی لێ دەترسن و ستەملێکراوان زۆریان هانا بەرئەو دەبەن، برۆ لای بەڵکو دەرباز دەبیت لەوستەمکارە، منیش چوومە لای وباسی حاڵ و وەزعی خۆمم بۆی کرد و ئەوەی کە بەسەرم هاتووە لە دەست ئەو ستەمکارە، کابرای خیاط هەستاو دوکانەکەی داخست ولەگەڵم هات تاکو چووینە بەردەرگای ستەمکارەکە لە دەرگامان دا، بە تووڕەیی دەرگای لێ کردینەوە، کاتێ خیاط ی بینی زۆر ترسا ... و ڕێزی لێ گرت و بەخێرهاتنی کرد

خیاط پێی گوت: حەقی ئەو پیاوە فەقیرە بدە

پیاوەکە گوتی: حەقی هیچ کەسێکم لەلانییە و ئەوەش هیچی لەلای من نییە خیاگ هاواری بەسەرداکرد و گوتی: ئەگەر حەقی ئەو پیاوە دەدەیت ئەگەرنا.. بانگ دەدەم!!

پیاوە ستەمکارەکە کاتێ ئەمەی لە خیاط بیست ڕەنگی ڕوخساری گۆڕاو یەکسەر هەموو پارەو پوولی منی هێنا و تەسلیمی کردم ئینجا ڕۆیشتین.

منیش سەرسام بووم لە هەڵس و کەوتی ئەو خیاطە لەگەڵ ئەوەی کە پیاوێکی لاواز وبێ هێزیش بوو بەڵام سامێکی یەکجار زۆری هەبوو لەبەرامبەر ئەو ستەمکارە، کە چۆن توانی ئەو پیاوە گەورەیە بۆی ملکەچ بێ، پاشان هەندێ پارەم پێدا بەڵام وەری نەگرت، گوتی: ئەگەر شتی وام وەربگرتایە






ئەوا ماڵ وسامانێکم دەبو، کە ئەژمارە نەدەکرا

لێم پرسی وپێم گوت کە چەندە سەرسام بووم بەوکارەت هۆکارەکە چی بوو؟

هیچ ئاوڕی لێ نەدامەوە، زۆریم لێ کرد و پێم گوت: بۆچی هەڕەشەت لەو ستەمکارە کرد بە بانگدان؟

گوتی: ماڵ وپارەی خۆت وەرگرت.. ئەوجا بڕۆ سەرکارت گوتم: سوێندبێ دەبێ هەرپێم بڵێیت..

گوتی: هۆکارەکەی ئەمەبوو، چەند ساڵێك لەمەوبەر دراوسێیەکی تورکیمان هەبوو لە پیاوانی بەرزی دەوڵەت بوو، وەزۆریش پیاوێکی جوان وشۆخ بوو، ڕۆژێکیان ئافرەتێکی زۆر جوان بەلای تێپەڕی کە لە حمام دەردەچوو وەبەرگ وپۆشاکێکی بەرزی لەبەردابوو، ئەویش بۆی هەستا کە سەرخۆش بوو بەدوای کەوت ویستی بیباتە ماڵی خۆی بەڵام ئافرەتەکە هەر هاواری دەکردوو دەیگوت: من ئافرەتێکی خاوەن منداڵ و هاوسەرم ئەم پیاوەش دەیەوێ ستەمم لێ بکات، وەپیاوەکەم سوێندی خواردووە کە ئەگەر شەو نەیەوە بۆ ماڵ تەڵاقت دەدەم، ئەوا ئابڕووم دەبا.

-خیاط گوتی: کە ئەوەم لێ بیست بۆی چووم و خۆم لێ نەناس کرد و یستم ئەو ئافرەتەی لەدەست ڕزگار بکەم، بەڵام پیاوەکە چەقۆیەکی لێدام و سەری بریندارکردم و خوێن لێم دەچۆڕایەوە.

ئافرەتەکەش دەسەلاتی نەما تاکو پیاوەکە بەزۆری هێنایە ماڵی خۆی



گەڕامەوە ماڵ خوێنەکەم لە خۆم جیاکردەوە و جوان خۆم ئامادە کرد بۆی لەناو خەڵکی هاوارم کردوو گوتم: ئەو پیاوە شتێکی وادەکات ئایا نازانن..؟ وەرن لەگەڵم بچین ئەو ئافرەتە ڕزگار بکەین..

هێرشمان بردە سەری لە ماڵی خۆی، بەڵام ئەو پەلاماری داین بە خزمەتکارەکانی بەدەستی دارو قامچی لە خەڵکیان دەدا، لە نێو هەموویان منیان مەبەست بو کە لێم بدەن، ئینجا زۆر ئازاریان دام و بریندایان کردم لە ماڵی دەروچون بەو پەڕی بێ هێزی وزەلیلی، هیچمان بۆ نەکرا لەگەڵی. منیش گەڕامەوە بۆ ماڵم خەریك بوو ڕێگام لی وون دەبو لەبەر خوێن برینەکانم ویستم بخەوم بەڵام خەوم لی نەکەوت، سەرمسوڕمابوو نەمدەزانی چۆن ئەو ئافرەتە ڕزگاربکەم، بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە ماڵ تاکو مێردەکەی تەلاقی نەدا وام بە خەیاڵ دا هات کە بانگ بدەم لە نیوە یشەودا بۆ ئەوەی وابزانێ نوێژی بەیانی بووە ئینجا ئەو ئافرەتە لە ماڵی خۆی دەردەکات و ڕزگاری دەبێ وە دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی.

چوومە سەر منارەکە و بە دەنگی بەرز بانگم دا.

سەیری دەرگای ئەو ماڵەشم دەکرد بۆ ئەوەی بزانم ئایا ئافرەتەکە دەرچووە کە بانگم تەواو کرد ئافرەت نەهاتە دەرێ هەر چاوەڕوان بووم لەناکاو ڕێگا پڕبوو لە پیاووسوارچاك.

دەیانگوت: کێ بوو تازە بانگی دا؟ سەیری منارەی مزگەوتیشیان دەکرد منیش هاوارم کرد وگوتم: من بووم بانگم دا، ویستم یارمەتیم بدەن بەڵام

گوتیان: دابەزە، منیش دابەزیم لەسەر منارەکە

گوتیان: وەرە لای خەلیفە زۆر ترسام سوێندم بۆ خواردن کە گوێم بۆ بگرن تاکو بەسەر هاتەکەیان بۆ بگێڕمەوە بێ سود بوو، منیان بردە بەردەستی خەلیفە.

کاتێ بینیم خەلیفە لە شوێنی خۆی دانیشتبوو زۆر ترسام.

گوتی: نزیك بەوە لێم.. لێی نزیك بوومەوە.. پێی گوتم: ئارام بە.. ترست لە دڵت دەربکە.. ! هەر بەو شێوە قسەی نەرم و خۆشی بۆ دەکردم تاکو بتوانم قسە بکەم و ترسم نەمێنێ.

ئینجا گوتی: تۆ لەنیوەی شەودا بانگت داوە؟

گوتم: بەڵێ

گوتی: بۆ چی؟ خۆ زۆر مابو لەشەو زیانت بەخەڵکی بەڕۆژوو و گەشتیارو ڕێبوار و نوێژخوێن گەیاند: وەنوێژی ئافرەتانیشت تێك دا. گوتم: امیری ئیمانداران دلنیام دەکات؟

گوتی: دڵنیابە

بەسەر هاتەکەم بۆی گێڕایەوە، زۆر زۆر تووڕە بوو،

فەرمانی کرد پیاو و ئافرتەکە بێتە لام، بەپەلە هاتن ئافرەتەکەی بۆ ماڵی مێردی ڕەوانە کردەوە لەگەڵ کۆمەڵێ ئافرەتی بەمتمانە پاشان ڕووی کردە پیاوە ستەمکارەکە پێی گوت: چەند ڕۆزی و پارەو ماڵ و سامانت

هەیە؟ وەچەند جاریە و خزمەتکارت هەیە؟ ئەویش باسی هەندێ شتی بۆی کردو گوتی: زۆر.

خەلیفە گوتی: هاوار بۆ خۆت!! ئایا ئەوەی خوا پێی داویت لە جاریە و خێزان و ماڵ و سامان بەس نەبوو بۆت تاکو پەلاماری ناموسی خەڵك بدەیت وستووری خوا بشکێنی، وە ئازایەتی خۆت دەربېڕی بەسەر کاربەدەست، مەبەست خەلیفە خۆی بوو، بۆ چی پەلاماری پیاوێکت داوە کە فەرمانی بە چاکە کردووە و قەدەغەی کردووە لە خراپە؟ ئینجا ئازارت داوە و بریندارت کردووە..؟ هیچ وەڵام نەبوو..

فەرمانی کرد.. دەست وقاچی ببەستنەوە، دواتر بیخەنە نێر, کیسێك ئەو پیاوەش هەر هاواری دەکرد و داوای یارمەتی دەکرد و، دەیگوت: تۆبە دەکەم جارێکی تر ئەو کارە ناکەم، بەڵام خەلیفە هیچ وەڵامی نەدایە، پاشان فەرمانی کرد کەوا لە ناو ئەو کیسەیەدا بەچەقۆلێی بدەن تاکو دەمرێ.. ئینجا فرێیان دایە نێو ڕووباری دیجلە و ئەمەش ئاخیر کات وساتی بوو لە ژیانی دنیادا.

پاشان خەلیفە پێی گوتم: هەر جارێك شتێکی خراپت بینی چ گەورە چ بچوك، ئەگەر لەسەر ئەوەش بێ، ئاماژەی بۆ پۆلسێکی خۆی کرد – دەست بە جێ ئاگارم بکەوە، ئەگەر نەگونجا ئەوانیشانەمان ئەوەبێ یەکسەر بانگ بدە لە هەر کاتێ بێ.

منیش گوتم: خوا پاداشتت بداتەوە ئینجا ڕۆیشتم لەلای.

هەر لەبەرئەوە فەرمان بەهەر کەسێك بکەم دەست بەجێ بەقسەم دەکەن، وەقەدەغەی هەرشتێکییان لێ بکەم وازی لی دێنن، لە ترسی خەلیفە (المعتضد).

تاکو ئێستاش پێویستم بە بانگ دان نەبووە، سوپاس بۆخوا.

ئەوانەی کە تامەزرۆی بەهەشتن و حەز دەکەن بچنە بەهەشت بەڕاستی بێ دەنگ نابن لە ئاست ئەو جۆرە خراپەوکارە نابەجێیانە[1].

## ٥٨٢- خوا پەرستی وتاعەتی ئیمامی احمد ( رضي الله عنه )

ابراهیم ی کوڕی هانئ دەڵێ:

هیچ کەسم نەبینوە بەهێز و بە ئارام تر لەسەر خوا پەرستی و زوهد و خۆپارێزی لە ئیمامی احمدی کوڕی احمد ئەو بەڕاستی لە هەموو کەسێك زوهد و خواپەرستی زیاتر بوو، کاتێ کە لە ترسی خەلیفەی بغدا خۆی حەشار دابوو لە ماڵی ابراهیم ی کوڕی هانئ – دەڵێ: بەڕۆژ بەڕۆژو دەبوو بەپەلە فتاری دەکردەوە، دوای نوێژی عیشاء چەند ڕەکعەتێکی دەکرد وپاشان کەمێك دەخەوت، ئینجا هەڵدەستا دەس نوێژی دەگرت، بەردەوام نوێژی دەکرد تاکو بەرەبەیانی ئینجا بەیەك ڕەکعەت نوێژی وەتری دەکرد، ئەمە نەریتی بوو بەدرێژایی مانەوەی لەلای من، هەرگیز یەك شەو نەمبینیوە کە

(١) من روائع العريفي، د. محمد عبدالرحمن العريفي (١٦٢).




شەوو نوێژ نەکات وشەوەکەی بەخەو بباتە سەر، من بەخۆم ئەو هێزو توانایەم نەبوو لەگەڵی، وەهەرگیز نەمبینی بەڕۆژوو نەبێ تەنها ئەو ڕۆژەنەبێ کە حیجامەی کرد و ڕۆژووەکەی شکاند.

-صالح ی کوڕی ئیمامی احمد دەڵێ:

باوکم هەمیشە بەڕۆژوو بوو لە ساڵدا وەڕۆژووەکەی دەگەیاندە ئەویتر لەماوەی دومانگ لە هەر سێ ڕۆژێك بەیەك دەنکەخورما فتاری دەکردەوە لەسەر ئەوە مایەوە تاکو پانزە ڕۆژ، لە هەموو سێ ڕۆژێك فتاری دەکرد و ە، پاشان فتارەکەی کردە شەو بۆ شەو، تەنها یەك کولێرەی دەخوارد[1].

## ٥٨٣- ڕاست گۆهەڵەناکات لە فیراسەتەکەی

ابراهیم ی الخواص دەڵێ: ڕۆژێکیان لە مزگەوت بووم، لە ناکاو گەنجێکی جوان و بۆن خۆش ورێزدار هات بەرەو ڕوومان، منیش بەهاوڕێکانم گوت: وابزانم ئەو گەنجە جوو لەکەیە، هاوڕێکانم ئەو قسەیان پێ ناخۆش بوو، چوومە دەرەوە، گەنجەکەش چووە دەرەوە پاشان گەنجەکە هاتەوەلایان گوتی: وای ئەوە شێخ چی گوت: سەبارەت بەمن؟ ئەوانیش قسەکەیان شاردەوە و شەرمیان کرد پێ بڵێن؟ بەلام گەنجە زۆری لێ کردن دەبێ هەربڵێن، ئەوانیش گوتیان: شێخ گوتی: ئەو گەنجە جوولەکەیە.

---

(١) ألف قصة وقصة من حياة الأئمة الأربعة، لاپەڕە (٢٨٠).



گەنجە بەپەلە هاتە لام ودەستی توند گرتم و موسلمان بوو، منیش گوتم: هۆکار چی بوو؟

گوتی: هاتووە لە کتێبی ئێمە کە پیاوی ڕاست گومەڵە ناکات لە فیراسەتەکەی – ئەوەی دێت بەسەر دڵی ڕاستە و لە خواوەیە – گوتم: موسڵمانەکانم تاقی کردنەوە، وەبیرم لێ کردەوە گوتم: ئەگەر پیاوێکی ڕاست گۆیان تێدابێت، ئەوە لەو کۆمەڵەدایە، هاتمە لای ئێوە کاتێ ئەوپیاوەچاکە (ابرهیم الخواص)م منی بینی وبەچاوی فیراسەت سەیری کردم زانیم ئەمەیان ڕاست گۆیە[1].

## ٥٨٤- کەراماتی ابو مسلم ی (الخولانی) تابیعی

شرحبیل دەڵێ: کاتێ اسودی العنسی هەواڵی بڵاوبووەوە لە ولاتی یەمەن (پیاوێکی درۆزن بوو داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد) ناردی بەشوێن ابو مسلم ی الخولانی تابیعی، ئەویش هات ئینجا ئاگرێکی گەورەی داگیرساندبوو، ابو مسلم ی خستەناو بەڵام هیچ زیانێکی پێ نەگەیشت، ئینجا داروودەستەکەی پێیان گوت: ئەگەر ئەوە لەلای خۆت دەر نەکەیت ئەو زیان بەشوێن کەوتووانت دەگەیەنێ، فەرمانی پێ کرد کەوا لە وڵاتی یەمەن بڕوات، ابو مسلم وڵاتی یەمەنی بەجێ هێشت چووە مەدینە، کاتێ چووە مزگەوت و

---

(١) الروح، ابن القيم الجوزية، لاپەڕە (٢٩٨).

نوێژی کرد ئیمامی عمر چاوی پێ کەوت و بۆی هەستایەوە گوتی: ئەو پیاوە خەڵکی کوێیە؟ ابو مسلم گوتی: لەیەمەن هاتووە، ئیمامی عمر فەرمووی: ئەو پیاوەی کەوا عەنسی درۆزن سووتاندی چی بەسەرهات؟ ابو مسلم گوتی: ئەوە عبدالله کوڕی ثوب بوو، عمر فەرموی: سوێندت دەدەم بەخوا تۆنەبوویت؟

ابو مسلم گوتی: بەڵێ، ئینجا ئیمامی عمر لە باوەشی گرت لەلای خۆی دانا فەرمووی سوپاس بۆ خوا نەمردم تاکو کەسێکم لە ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) بینی کەوا وەك حەزرەتی ابراهیم یان لێکرد

-عبدالله ی کوڕی عمیر دەڵێ:

هەرجارێك ابو مسلم الخولانی دوعای بارانی کردبێ دەست بەجێ باران باریوە[1].

## ٥٨٥- قورئانی فرۆشت وسەگێکی کڕی

ابو داود دەڵێ:

ساڵێکیان ئیمامی مالك چووە حەج، لە ژێر سێبەری کەعبەدا دانیشت خەڵکی دەهاتن پرسیاریان لێ دەکرد سەبارەت بەحەج، هەرکەسێ پرسیاری حەجی لێ بکردایە پێ دەگوت: افرد افرد.. واتە: بەتەنیا احرام بەحەج

---

(١) منجد الخطيب، أحمد بن صقر السويدي (٢)، (٣٥١).




ببەستە چونکە ئەمە سوەتی پێغەمبەرە (ﷺ).

لەولاوە عمری کوڕی قیس هاتە لای و لەسەر سەری وەستا گوتی: ئەی مالك.. انت هالك: واتە تۆ بە هیلاك چوویت، هاتی لە ژێر سێبەری کەعبەدا دانیشتوویت ومالّی خوات ون کردوە، وەدڵێ: افراد بکەن افراد بکەن بەحەج، خەڵکی بۆی هەستان ئیمامی مالك فەرمووی: وازبێنن لەو هەژارە ئەوە بەڕاستی کاری خراپتری کردووە، ئەو عەرەق دەخواتەوە و قورئانی فرۆشتووە و سەگێکی پێ کڕیوە، عمری کوڕی قیس ڕۆیشت بەشەرمەزاری بەڵام ڕوخساری ڕەش هەڵگەڕا، خوا نزمی کرد تاکو ڕۆژی قیامەت[1].

## ٥٨٦- الرحمن على العرش استوى

ابن عیینە دەڵێ:

پیاوێك هاتە لای ئیمامی مالك پرسیاری کرد لە ئایەتی (الرحمن على العرش استوى) گوتی: ئەی ابو عبدالله چۆن خوای گەورە استوای بووە لە سەر عەرش؟ واتە: چۆن قەسدی سەرعەرشی کردووە و چۆتە سەرعەرش

ئیمامی مالك بێ دەنگ بوو، هیچ کاتێك نەمانبینوە بەو شێوە لەقسەکانی بێ دەنگ بووبێت، خەلکیش سەیریان دەکرد کەوا چی پێ دەڵێ، پاشان دەستی کرد بە قسەکردن گوتی: استواو نیشتەجێ بوون وڕاوەستان

---

(١) قصص الأئمة الأربعة، لاپەڕە (١١٥).






لەسەر عەرش شتێکی زاندراوە، بەڵام شێوە و شێوازی وەستان و نیشتەجێ بوون دیارنییە و نەزاندراوە بە عەقلیش، پرسیار کردن لێی شتێکی بیدعەیە، وەباوەڕبوون پێی واجبە، منیش واگومان دەبەم کە تۆ پیاوێکی بێ ئیش و کەم عەقلییت بیبەنە دەرەوە لەلام نەمێنێ، پیاوەکە بانگی ئیمامی کردوو گوتی: ئەی ابو عبدالله سوێندبە و خوایەی کە جگە لەئەو هیچ خوایەك نییە، ئەو پرسیارەم لە زانایانی کوفە و بەسەرە وعێراق کردووە کەسیان وەك تۆ نەیپێکاوە لێ[1].

## ٥٨٧- شریح ی قازی وئیمامی علی (كرم الله وجهه)

شریح بەڕاستی لە هەمو کەسێك زیاتر داد پەروەربوو لە کاتی بڕیاردان لە قەزاوەت، هەروەك ئیمامی علی باسی کردووە.

ڕۆژێکیان ئیمامی (علی) بە بازاری کوفەدا تێپەڕی دەبینی لەبەردەم پیاوێکی جوولەکە زرێ پۆشێك داندراوە نمایش کراوە بۆ فرۆشتن.

کاتێ ئیمامی علی بینی زانی کەوا ئەوە هەمان زرێ پۆشی ئەوە کە چەندین ساڵە ونی کردبوو، وەنیشانەیەکی بەسەر دا هەبوو بەتەواوی ناسیەوە، بە کابرای جوولەکەی گوت: ئەم زرێ یە هی منە، جوولەکەکە گوتی: نەخێر هی منە، ئەگەر زۆریش دەکەیت ئەوا قازی لە پێشتە! هەردوکیان چوونەلای قازی شریح، ئیمامی علی لەبەرامبەر قازی شریح

---

(١) قصص الأئمة الأربعة، لاپەڕە (٩٣).






دانیشت ولەتەنیشت کابرای جوولەکە، قازی شریح گوتی: بەڵگە لەسەر داواکارە (کەئیمامی علی بوو) ئیمام فەرموی: ئەی قازی زرێی منە نیشانەکەش ئەوە و ئەوەیە، ئەمەش حەسەن ی کوڕی علی یە شاهیدە لەسەر ئەوە، قازی شریح گوتی: ئەی امیری ئیمانداران من بەڕاستی دەزانم کە تۆ ڕاست دەکەیت، بەڵام هیچ بەڵگەیەکت نییە کە ئەو زرێی یە هی تۆبێ وە حەسەن ی کوڕت نابێ بە شاهید و سوودی بۆت نابێ چونکە کوڕی تۆیە کەواتە بڕیارمان دا ئەو زرێ یە بدەین بەو پیاوە، جوولەکەیە.

کاتێ جوولەکەکە ئەمەی بینی لەشەرعی ئیسلام و خەلافەتی ئیمامی علی و ڕاست گوێی داروەدەستەکەی زۆر تاسا بە مە و گوتی: بەڕاستی ئەو دینەی کە ئێوە بڕیارو حوکمی لەسەردەدەن هەمان ئایین و پرۆگرامە کە بۆ پێغەمبەر(موسی) هاتووە کە پڕە لە دادپەروەری و ڕاستگۆیی وەئەم ئایینە بەڕاستی ئاینێکی ڕاستە، منیش ئەوا شایەتومان دێنم و دەڵێم: اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمد رسول الله)[1].

-ئەو ڕووداوە لەسەردەمی خەلافەتی ئیمامی علی بووە لە کوفەی عێراق

ئەو قازی شریحەش یەکێك بووە لە و دادپەروەرانەی کە لە مەدینە دادپەروەری کردووە لە حوکم وبڕیاردان بۆیە ئیمامی عمر لەسەردەمی خەلافەتی خۆی ناردوویەتی بۆ عێراق لەوێ ببێ بە قازی، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کاتێ حوکمی کرد لە نێوان عومەر و پیاوێك کە ئەسپێکی فرۆشتبوو

---

(١) موسوعة الحقوق الإسلامية، ممود المصري، بەرگی ٣، لاپەڕە (٢٨٣).



